نووسینی: د. محەمەد عومەر شابرا
و. لە عەرەبییەوە: د. هێرش محەمەد ئەمین

# شارستانییەتی ئیسلامی

## هۆیەکانی دارمان و پێویستی بۆ چاکسازی






لە بڵاوکراوەکانی
سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی (٤٧)

شارستانییەتی ئیسلامی
هۆیەکانی دارمان و پێویستی بۆچاکسازی
د. محەمەد عومەر شابرا
و: د. هێرش محەمەد ئەمین



شارستانییەتی ئیسلامی لە نێوان پێنج سەدەی پێشوودا، دارمانێکی فراوانی بە خۆوە بینیوە کە هەموو بوارەکانی ژیانی گرتۆتەوە، دوای ئەوەی ماوەیەکی دوورودرێژ بەرەو پێشچوون و گەشەیەکی گشتگیری بە خۆوە بینی. ئەم گۆڕانکارییەش چەندین پرسیار دەورووژێنێت، وەک: ئەو هۆکارانە چی بوون وای لە موسڵمانان کرد ئەو سەرکەوتنە نموونەییانە لە سەدەکانی یەکەم لە تەمەنی ئیسلامدا بەدەستبهێنن؟ ئەو هۆکارانەش چی بوون گەیاندنیە ئەو بێهێزی و لاوازییە؟ ئایا ئیسلام بەرپرسیار بوو لەو دارمانەی تووشی موسوڵمانان بوو؟ یاخود هۆکاری تر هەبوون کە ڕۆڵیان تێدا بینی؟ نووسەر لەم توێژینەوە قووڵەدا هەوڵ دەدات بە تێروتەسەلی وەڵامی ئەم پرسیارانە بداتەوە و بەرنامەیەکیش بۆ چاکسازی دابنێت.





### سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی

سەنتەرێکی کوردستانی ناحکومی ناسیاسییە، گرنگیی دەدات بە توێژینەوە و تاوتوێکردنی پرسە هزرییە بنەڕەتییەکان بۆ دووبارە هێنانەگۆی دەق و تێکستە پیرۆزەکان و چۆنیەتی دابەزاندنی چەمکە مەعریفی و بەبایەخەکانی ئیسلام لە بوارە جیاوازەکانی سەردەمدا.

**ئامانجەکانی سەنتەر:**

- بوژاندنەوەی بیرو هزر و بەکارخستنی مەعریفەی ئیسلامی لە ناوەندە زانکۆیی و پەروەردەییەکاندا، بە پشتبەستن بە بەهرە و توانا خودییەکانی ئەکادیمیانی کوردستان و جیهانی ئیسلامی و ئەزموونی بیرمەندانی مسوڵمان.
- پەرەپێدان و پەسەندکردنی ڕوانگەی زانستی مەنهەجی لە چارەسەرکردنی کێشە و گرفتە هزرییەکاندا و بێلایەنبوون لە پرسە خیلافییەکاندا و خۆبەدوورگرتن لە بڕیاری پێشوەخت و شێوازی سۆزدارانە و هەوڵدان بۆ بابەتیبوون.
- کاراکردنی کەلەپووری دەوڵەمەندی ئیسلامی و سوودوەرگرتن لە سەرچاوە گرنگەکانی بیری ئیسلامی لە کۆن و نوێدا و سەرلەنوێ هێنانەگۆی چەمکە فیکرییە دوێنراوەکان لە مێژووی ئیسلامیدا، بە ڕەچاوکردنی گۆڕانەکانی سەردەم.
- پەرەپێدانی چەمکی ئیعتیدال لە کایە فیکری و مەعریفییە جیاوازەکاندا و خۆبەدوورگرتن لە تێپەڕاندن و بەزایەدان.
- سەنتەر کاردەکات بۆ سەرلەنوێ و بەردەوام خوێندنەوەی هەردوو پەڕاوی قورئان و بوونەوەر بەپێی مەنهەج و میتۆدی زانستی و بەبێ چاولێکەری، بەڵکو بە نەفەسێکی تازە و بە سوودوەرگرتن لە عەقڵی ڕاشکاو و نەقڵی سەلمێنراو.



### د. محەمەد عومەر شابرا

- لە شوباتی ساڵی ١٩٣٣ لەدایکبووە.
- ئێستا ڕاوێژکاری پەیمانگای ئیسلامییە بۆ توێژینەوە و ڕاهێنانی سەر بە بانکی ئیسلامی بۆ گەشەپێدان لە جیدە.
- ٣٥ ساڵ لە دامەزراوەی دراوی عەرەبی سعودی کاریکردووە و تێیدا بە پلەی گەورەڕاوێژکارانی ئابووریناسان خانەنشین کرا.
- لە هەردوو زانکۆی ویسکۆنسن و کینتاکی لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا وانەی وتووەتەوە، هەروەها لە پەیمانگای ئابووریی گەشەپێدان و لە پەیمانگای توێژینەوەی ئیسلامی لە پاکستان کاری کردووە.
- چەندین نووسینی بنەڕەتی لە بواری ئابووری و دراوی ئیسلامیدا هەیە، لەوانە (١٥) کتێب و زیاتر لە (١٠٠) توێژینەوەی ڕەسەن و پێداچوونەوەی کتێب و هەندێکیشیان بۆ چەندین زمان وەرگێڕدراون.

---



### د. هێرش محەمەد مەلائەمین چایچی

- لە ساڵی ١٩٥٧ لە هەڵەبجە لە دایکبووە.
- خاوەنی بڕوانامەی دکتۆرایە لە ئەدەبی عەرەبی.
- پرۆفیسۆری یاریدەدەر و سەرۆکی بەشی زمانی عەرەبییە لە کۆلیجی زمان - زانکۆی سلێمانی.
- خاوەنی (٧) توێژینەوەی زانستییە و (٣) کتێبی بڵاوکردووەتەوە.
- چەندین بابەت و لێکۆڵینەوەی لە گۆڤار و ڕۆژنامەکاندا بە زمانی کوردی و عەرەبی بڵاوکردووەتەوە.

# شارستانییەتی ئیسلامی

## هۆیەکانی دارمان و پێویستی بۆ چاکسازی

محەمەد عومەر شابرا

وەرگێڕانی لە ئینگلیزییەوە بۆ عەرەبی
محەمەد زوهەیر ئەلسەمهوری

وەرگێڕانی لە عەرەبییەوە بۆ کوردی
د. هێرش محەمەد ئەمین

# شارستانییەتی ئیسلامی

## هۆیەکانی دارمان و پێویستی بۆ چاکسازی

.....................................................

لە بڵاوکراوەکانی سەنتەری زەهاوی بۆ لێکۆڵینەوەی فیکریی
ژمارە (٤٧)


- نووسینی: د. محەمەد عومەر شابرا
- وەرگێڕانی: د. هێرش محەمەد ئەمین


- بابەت: هزری
- دیزاین: ڕەوشت محەمەد
- چاپ: یەکەم

لە بەڕێوەبەرایەتیی گشتیی کتێبخانە گشتییەکان
ژمارە (١٣٢٧)ی ساڵی ٢٠١٧ پێدراوە

## پێشکەش

بــە کۆچــکردووان: ئیبراهیمــی بــرام و عائیــشەی خوشکم، خوای گەورە لێیان خۆش بێت و پاداشتی بــەخێریان بداتــەوە لــە قوربانیــدانیان بــۆ مــن و خێزانەکەم.

**د. محەمەد عومەر شابرا**

# ناوەرۆك

# سەرەتا

مێژوو تەنیا تۆمارێك نییە بۆ ڕووداوەکان، بەڵکو پێشانگایەکە بۆ ئەو وێنانەی پەردە لادەدەن لەسەر زنجیرەیەك لە (کۆمەڵە سیناریۆییەك)ی یەك لەدوای یەك بۆ دەستکەوتەکانی مرۆڤایەتی و شکستەکانی، نایابییەکانی و نارێکییەکانی، هەڵکشانی و داکشانی. ئاسۆیەك دەکاتەوە بۆ دوارۆژ، ئاوێنەیەکە بۆ دەنگی ڕووداوەکان کە بەستراونەتەوە بە گەشەکردنی نەتەوە و ژیارییەکان و هەرەسهێنانیان لە میانەی کارلێکردنی فیکرەکان و کەسایەتییەکان و دەزگاکان و کۆمەڵەکان و کۆمەڵگاکان.

ئەو کۆمەڵە ڕووداوانەی لە هەڵکشان و داکشاندان و مێژوو پێشانی دەدات کە کۆتایی نایەت و دووچاری گەلان و شارستانییەتەکان بووە، لە بەرزبوونەوە و دابەزیندان. لە کاتێکدا ئەم وێنە سەرنجڕاکیشانە دەخرێنە بەرچاو، دیارە وەستانەوەیە ڕووبەڕووی عەقڵ، ئەمە تێڕامان و شیکردنەوە و چوونەناو کرۆك دەخوازێت، بە مەبەستی دۆزینەوەی ئەو هێزەی هۆکار بووە و خۆی لە پشت هەموو دیاردە مێژووییەکانەوە

حەشار داوە. ئەم پرۆسەیەش مرۆڤـ لە دینامیکی مێـژووەوە بـۆ بـواری فەلـسەفەی مێـژوو دەگوازێتـەوە، ئەمـەش ئاسـۆیەك لـە بـەردەم مرۆڤایەتیدا دەکاتەوە بۆ هەڵێنجانی پەند و ئامۆژگـاری لـە ڕابـوردوودا، لە پێناو سەرلەنوێ دروستکردنەوەی ئێستا، ڕێگەخۆشکەرێك دەبێت بۆ ئایندەیەکی باشتر. مێژووش چەندان حاڵەتی کەوتن و هەستانەوەی بـە خۆوە بینیوە و هەریەکەشیان پەند و ئامۆژگاریی خۆی هەیە کە ئەگـەر فەرامۆشیان بکەین، ئەوا مرۆڤایەتی تووشی فەوتان دەبێت.

قورئانی پیرۆز داوا لە مرۆڤایـەتی دەکـات، بـە مەبەسـتی وەرگـرتنی پەنـد و ئامۆژگـاری و چـاککردنی هەڵـسوکەوتی و ئاوێتـەبوونی خـودی خۆی لەگەڵ چارەنووسیدا، سەیری مێژوو بکات. (ئیشتیاق قورەیشی)، مێژوونووسی بەناوبانگ، هەستی بەمە کردووە کاتێك دەڵێـت: "قورئـان سەیری ئێستا ناکات کە تەنیا کاتێکە و تێدەپـەڕێت، هـەروەها سـەیری ڕابووردووش ناکات کە ژمارەیەك کاتی بەسەربردوو و ئێستایە کـە هـیچ بایەخێکی نییـە، تەنانـەت بەوەشـەوە ناوەسـتێت کـە گـوێ بداتـە ئـەو خراپەکارییانەی کە نەتەوەکانی پێشوو ئـەنجامیان داوە و دووچـاری چ وێرانکارییەك هاتوون لە ئەنجامی ئەو خراپەکارییانەدا".[1]

---

[1]. Qureshi, Ishtiaq Hussain “Historiography”In M. M. Sharif (ed), A History of Muslim Philosophy. Royal Book. Co. , 1983, Volume 2, p. 1198.

بیرکردنــەوە لــە هۆکارەکــانی پێــشکەوتنی گــەلان و کۆمــەڵگاکان و نەتەوەکان و داڕمانیان، پەیوندییــەکی بــەهێزی بــە لــۆژیکی قورئانــەوە هەیە ﴿وَكُلًّا نَقُصُّ عَلَيْكَ مِنْ أَنْبَاءِ الرُّسُلِ مَا نُثَبِّتُ بِهِ فُـؤَادَكَ وَجَـاءَكَ فِـي هَذِهِ الْحَقُّ وَمَوْعِظَةٌ وَذِكْرَى لِلْمُؤْمِنِينَ﴾ هود/١٢٠.

﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِـي كُـلِّ أُمَّـةٍ رَسُـولًا أَنِ اعْبُـدُوا اللَّـهَ وَاجْتَنِبُـوا الطَّـاغُوتَ فَمِنْهُمْ مَنْ هَدَى اللَّهُ وَمِـنْهُمْ مَـنْ حَقَّـتْ عَلَيْـهِ الـضَّلَالَةُ فَـسِيرُوا فِـي الْأَرْضِ فَانْظُرُوا كَيْفَ كَانَ عَاقِبَةُ الْمُكَذِّبِينَ﴾ النحل/٣٦.

﴿أَلَمْ يَرَوْا كَمْ أَهْلَكْنَا مِنْ قَبْلِهِمْ مِنْ قَرْنٍ مَكَّنَّاهُمْ فِي الْأَرْضِ مَا لَمْ نُمَكِّنْ لَكُـمْ وَأَرْسَـلْنَا الـسَّمَاءَ عَلَـيْهِمْ مِـدْرَارًا وَجَعَلْنَـا الْأَنْهَـارَ تَجْـرِي مِـنْ تَحْـتِهِمْ فَأَهْلَكْنَاهُمْ بِذُنُوبِهِمْ وَأَنْشَأْنَا مِنْ بَعْدِهِمْ قَرْنًا آخَرِينَ﴾ الأنعام /٦.

﴿وَلَقَدِ اسْتُهْزِئَ بِرُسُلٍ مِنْ قَبْلِكَ فَحَاقَ بِالَّذِينَ سَخِرُوا مِنْهُمْ مَا كَـانُوا بِـهِ يَـسْتَهْزِئُونَ (١٠) قُـلْ سِـيرُوا فِـي الْأَرْضِ ثُـمَّ انْظُـرُوا كَيْـفَ كَـانَ عَاقِبَـةُ الْمُكَذِّبِينَ﴾ الأنعام /١٠ــ١١.

قورئــان دووپــاتی دەکاتــەوە کــە کاریگــەریی مــاددی و مەعنــەوی بەرپرسە لە پێشکەوتنی نەتــەوەکان و داڕمانیــان و داوا لــە مرۆڤایــەتی دەکات لە مەبەستی خوداوەنـد تێبگـەن کـە لـە کـردارە مێژووییـە یـەك لەدوای یەکەکاندا دەدرەوشێتەوە و ڕۆڵێکی وای داوەتە پیاو و ئافرەت، کە تەنیا بریتی نییە لە وەرگرتنی پەند و ئامۆژگـاری لـە مێـژوو، بـەڵکو کاریگەرییشیان لەسەر مێژوو هەبێت. بیروباوەڕی جێنشینیش بـۆ ڕۆڵـی مرۆڤەکان لەسەر زەوی دیاری دەکات. هەروەها پەیامەکەیان مێژووییـە

و تاك و كۆمەڵەكان لە باوەڕدارانن كە بریتییـە لـە هـەوڵی بـەردەوام بـۆ ژیـان بـە پێـی خواسـتی خوداوەنـد و چەسـپاندنی لـە میانـەی كـات و شوێنێكدا بۆ مێژوو. ڕۆڵی پێغەمبەریش (دروودی خوای لەسەر بێت) بە ڕۆڵێكی نموونـەیی بێوێنـە لـە مێـژوودا دەستنیـشان دەكـات، كـە كۆتـا پێغەمبەرە بۆ خۆی و گەلانی موسڵمان. ئەم ڕۆڵە لە قورئانی پیرۆزدا بە ڕوونی دەردەكەوێت كە خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنْزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ﴾ الحديد /٢٥، هـەروەها پـەروەدگار - بـە ڕوونـی - بەرپرسـیاریەتی گـەلانی دەستنیشان كردووە كـە دەفـەرموێت: ﴿وَكَذَلِكَ جَعَلْنَاكُمْ أُمَّةً وَسَطًا﴾ البقرة /١٤٣، هەروەها دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا قَوامِينَ بِالْقِسْطِ شُهَدَاءَ لِلَّهِ﴾ النساء /١٣٥.

ئوممـەتی ئیـسلامی، خـاوەن پەیامـە، تێڕوانینێكـی تایبـەتی بـۆ مرۆڤایەتی هەیە، بۆیە پێویستە لەسەری، چ لە ئاستی تاك یان كۆمەڵ و لـە نـاوەوە و دەرەوە، بـە هـەموو شـێوەیەك و كاریگەرانـە، هـەوڵ بـۆ چەسپاندنی دادپـەروەری (بـۆ موسـڵمانان و ئـەوانی تـریش) بـدات، بـۆ ئەوەی مرۆڤایەتی خێری دونیا و كۆتایی دەستبكەوێت. ئەگەر ئوممەت بە گوێرەی ڕێنماییەكانی خوا ئەركی خۆی جێبەجێ بكـات و پێغەمبـەر (دروودی خوای لەسەر بێت) بكاتە سەرقافڵەی خـۆی، ئـەوا لـە دونیـادا ئاشتی و گەشەسەندن و لە كۆتاییشدا سەرفرازی و ڕزگاربوون بەدەست دەهێنێت ﴿وَعَدَ اللَّهُ الَّذِينَ آمَنُوا مِنْكُمْ وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ لَيَسْتَخْلِفَنَّهُمْ فِي

الأَرْضِ كَمَا اسْتَخْلَفَ الَّذِينَ مِنْ قَبْلِهِمْ وَلَيُمَكِّنَنَّ لَهُمْ دِينَهُمُ الَّذِي ارْتَضَى لَهُمْ وَلَيُبَدِّلَنَّهُمْ مِنْ بَعْدِ خَوْفِهِمْ أَمْنًا يَعْبُدُونَنِي لَا يُشْرِكُونَ بِي شَيْئًا﴾ النور/ ٥٥.

دیارترین نیشانەی شارستانییەتی ئیسلامی ئەوەیە کە پشت بە باوەڕهێنان دەبەستێت، تێڕوانینیشی بۆ مرۆڤ و کۆمەڵگا و ئەنجامەکان لە ڕێنماییەکانی خواوەیە، کە یەکسانیی تەواو لە نێوان ئەو شتانەی گیانین و ئەوانەی مادین، بەدی دەهێنێت، ئەمە لە لایەك، لە لایەکی تریشەوە لە نێوان ئەو شتانەی مەعنەوین و ئەوانەی دونیایین، کاتێ لە ژیانی مرۆڤایەتی و کێشەکانی نزیکدەبینەوە، دەبینین ژیان هەموو یەك ئۆرگانە، بۆیە پێویستە کێشەکان بە ڕێگەیەکی گشتگیرانە چارەسەر بکرێن، نەك بە شێوەیەکی پچڕ پچڕ، ڕۆحی شارستانییەتی ئیسلامی لەم تێڕوانین و پەیامە پێك دێت، کە دەیەوێت جیهان بە گوێرەی ئەو تێڕوانینەی لە میانەی کارێکی هاوبەش و دروستکردنی کەسایەتی و کۆمەڵگا و ڕۆشنبیرییەکی نموونەیی، بگۆڕێت.

هێزی ڕاستەقینەی شارستانییەتی ئیسلامی خۆی لە هەوڵی بەردەوامی بۆ بەدەستهێنانی خاوەنداریەتیی ڕەوشت و هێزی ماددی و گەشەسەندن و ئاسایشدا دەبینییەوە، هەموو قۆناغەکانی گەشەسەندنی شارستانییەتی ئیسلامی و فراوانبوونی بریتی بوو لە ڕۆحێك کە خاوەن بزوێنەرێکی دینامیکی بوو، هەر کاتێك ئەم هاوکێشەیە تێکبچووایە، ئەو کاتە هێزی داڕمان و پەرت و بڵاوی، ڕێسی کۆمەڵگای ئیسلامی دەکردەوە بە خوری و دەبووە هۆکاری داڕمانی. مێژووی ئیسلام لە

میانەی ئەو ڕۆژگارە دوور و درێژە جۆراوجۆرانەی پێیدا تێپەڕیوە، دووچاری بەهێزی و لاوازی و هەروەها بەرزبوونەوە و گلۆربوونەوە بووەتەوە، ئەمانە سەرەڕای کەمبوون و زیادبوون و کۆبوونەوە و پەرتبوون، بەڵام ئەوەی لە ماوەی ئەم مێژووەدا جیای دەکاتەوە، بریتییە لە زیندووبوونەوە و گەشانەوەی ناوخۆیی لە ڕۆحە گەشەدارەکەیدا و دەرخستنی لە هەموو کات و شوێنێکدا. دوای هەموو نوشوستییەك شەپۆلێکی نوێی زیندووبوونەوە دەهات و وزەیەکی نوێ و تازەگەرییەکی ڕۆحیی تێدا بوو، کە لە ئاست بەرەنگاربوونەوەیەکی داهێنەرانەدا بوو بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی سەردەمەکە.

هەموو سەردەمێکی گەشەسەندن و زیندووبوونەوە، هێز و توانا نوێیەکەی لە سەرچاوە ڕەسەکەنەکەیەوە وەردەگرت، واتە قورئان و سوننەت، هەموو هەوڵێکیش لەم شێوازانە پێکهێنەری بەردەوامی بوون، لە هەمان کاتدا داخوازییەکانی گۆڕانکاری بەدیدەهێنا، بە بەردەوامیش تێڕوانین هەبوو بۆ پەیام و دیدگاکان، بەڵام شێوازەکەیان لەگەڵ خواست و داواکاریی باردۆخە نوێیەکاندا دەگونجاند، کە ئەمەش هێمایەکی نموونەییە بۆ پرۆژەی ئیسلام لە مێژوودا. ستراتیژییەتی گەشەسەندن و زیندووبوونەوەی ئیسلامی، هەمیشە پێداگری لەسەر کۆکردنەوەی هێزی ڕۆحی و مەعنەوی و ماددی و تەکنۆلۆژیا دەکردەوە، ئەمەش لە ڕێگای خۆیەوە دەبووە هۆکارێك بۆ پەروەردەکردنی نەوەیەکی گۆشکراو بەم دید و تێڕوانینە، پەیوەست بە

دروســـتکردنەوەی پەیکـــەری کۆمـــەڵگا و فەراهـــەمکردنی هـــەموو سەرچـــاوەکانی هێـــزە بـــۆ خزمـــەتی ڕەهەنـــدە باڵاکـــانی ئیـــسلام، خوێندنەوەیەکی وردبینانە بۆ چواردە سەدەی ڕابوردوو و پەردە لەسەر ئەو سروشتە دینامیکییەی ڕۆحی ئیسلامی لادەبات، کـە گوزارشـتی لـە خۆی و لە هەموو سیناریۆی شوێن و کاتە جۆراوجۆرەکاندا کردووە.

بیرمەندە ئیسلامییە هاوچـەرخەکان، ڕۆحـی مێـژووی ئیـسلامی و شارستانییەتی ئیسلامی، بـە ڕۆحێکـی گەشەسـەندوو و زیندووبوونـەوە وەسف دەکەن.[1] .بیرمەندەکانی ڕابوردوو لە میانی بارودۆخی مێـژوویی تایبەتی خۆیانەوە، ڕووبەڕووبەی ئەم مەسەلەیە بوونەوە، لەو بیرمەندە پایەبەرز و بەناوبانگانەی لێکۆڵینەوەیان لەسـەر لایـەنی شارسـتانییەتی ئیسلامی کرد، بریتی بـوون لـە: ئـەبو یوسـف (١١٣– ١٨٢ هـ / ٧٣١– ٧٩٨ م)، ئەبولحەســەن کـوڕی محەمــەد ئــەلماوەردی (٤٥١– ٥٠٥ هــ /١٠٥٥– ١١١١م)، ئەحمەد کوڕی عەبدول حەلیم ئـیبن تـەیمییـە (٦٦١– ٧٢٨ هــ /١٢٦٣– ١٣٢٨م)، ئـیبن خەلـدون (٧٣٢– ٨٠٨هــ /١٣٣٢–

---

1. Mawdudi, Sayyid Abul A'La. A short History of the Revivalist Movement in Islam. Lahore: Islamic Publications, 3rd Edition, 1976; Mawdudi, Sayyad Abul A. La. Khilafat- o - Mulukiyyat. . Lahore: Islamic Publications, (1966:); Mawdudi, Sayyad Abul A. La. The Islamic Movement: Dynamics of Values, Power and Chang (ed. And translated by Khurrum Murad), Leicesier, UK. The Islamic Foundation, 1984. See also: Nadvi, Abul Hasan Ali. Tarikh Dawat - o - Azeemat. 6 Volumes, Luknow, India: Majlis Tahaqiqat - o - Nasharaiyyat -e-Islam, 1969 – 1984.

١٤٠٦م)، شـــا وەلـــی الله ئەلدەهلـــەوی (١١١٤- ١١٧٦هـــ /١٧٠٣-١٧٦٢م)، جەمالەدینی ئەفغانی (١٢٥٤- ١٣١٥هـ /١٨٣٨- ١٨٩٧م).

ئەوەی شایانی باسە، سەرەڕای جیاوازی لـە هـاودەقیی مێژوویـیدا، بـەڵام سـەبارەت بـە هۆکارەکـانی داڕمـانی شارسـتانییەتی ئیـسلامی، کۆدەنگییەك لە نێوان زانایانـدا هەیـە، سـەرەڕای تێڕوانینـی تایبـەتیان سـەبارەت بـە سـتراتیژییەت و ڕێگاکـانی گەشەسـەندن و نوێبوونـەوە و زیندووبوونەوە.

هەموویان لەسـەر ئـەوە کـۆکن کـە دواکـەوتنی موسـڵمانان بـە هـیچ شـێوەیەك هۆکارەکـەی ئیـسلام نییـە، بـەڵکو دوورکەوتنەوەیانـە لـە ئیـسلام، هـەروەها سـەرلەنوێ دیـد و بۆچـوونە ڕەسـەنەکانیان دووپاتکردووەتـەوە، بـەو هیوایـەی ئـەو شـێواندنانەی لـە ئـەنجامی ڕانـەگرتنی پارسـەنگی لایەنـە ڕەوشـتی و ڕۆحـی و مـاددی و تەکنۆلۆژیاکانـە لەگـەڵ هاوکێـشە ئیـسلامییەکاندا. سـتراتیژییەتی گەشەسـەندن و زیندووبوونـەوە، مەبەسـتیەتی پێـداگری بکـات لـە تێگەیشتنی سەرلەنوێی دید و بۆچوونە ڕەسەنەکان و دووپاتکردنـەوەی پـەیامی موسـڵمانان و پتـەوکردنی پـەروەردە و فێرکـردن و بنیاتنـانی ڕەوشت، لە هـەمان کاتـدا بەدەستهێنانی داهـاتی مـاددی و ئـابووری و تەکنۆلۆژیایی، لە پێناو سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی کۆمەڵگا، پاڵپشت بە بیروبـاوەڕی ڕاوێـژکاری و لێپرسـینەوە و دادوەری و یەکـسانیی کۆمەڵایەتی و ئابووری و پشتبەستن بە خودی مرۆڤـ خۆی، ئەم بابەتانە

کرۆکـــی گەشەســـەندن و زیندووبوونـــەوەن و بنـــەمای ســـەرلەنوێ بنیاتنانەوەشن، بێ ئەوەی گوێ بدرێتە ئەو شێوازەی لە ئـەنجامی ئـەو هاودەقییە مێژووییە جۆراوجۆرانەدا وەری دەگرێت. هێزی ڕاستەقینەش لـە ملکەچـبوونی تەواودایـە بـۆ خـوا و پێغەمبەرەکـەی (درودی خـوای لەسـەر)، هــەروەها ڕەوشــتبەرزیی تــاك و گەشەســەندنی ئاسایــشی کۆمەڵگایـە. دیـارە ئەمـەش لـە میانـەی تـەرخانکردنی هێـزی کێبڕکێـی سیاسـی و ئـابووری و تـەکنۆلۆژیی و سـەربازیدایە، لەوانەشـە شـێوازی ســتراتیژییەتی ئــەم گەشەســەندن و زیندووبوونەوەیــە بــە گــوێرەی سەردەمەکان جیاوازی هەبووبێت، بەڵام ئەو بنەمایانەی باسمـان کـردن تایبەتمەندی هاوبەشن لە نێوانیاندا.

هاوڕێی خۆشەویستم عومەر شابرا، ڕێگایەکی نـوێی دۆزیوەتـەوە لـە توێژینەوەی بارودۆخی ئێـستای مێـژووی ئیـسلامی و شارسـتانییەتیی ئیسلامیدا، کە هەڵێنجاوە لە پسپۆڕییەکی مێژوویی بۆ ئـەم میللەتـە بـە گشتی، ئامێرەکانی شیکردنەوەی مێژوویی بەکارهێناوە، کە بە تایبەتی ئیبن خەلدون پەرەی پێدابوو.

کارەکـەی ئـیبن خەلـدونیش بریتــی بــوو لــە یــەکێك لــە نموونــە گشتگیرییەکانی تێگەشتن لە بەرەو پێشچوونی شارستانییەت و داڕمانی و بە تایبەتیش شارستانییەتی ئیسلامی، کارەکەشی تەنیا هۆکارەکـانی دروستبوون و گەشەسـەندن و داڕمـان و پـەرتبوونی شارسـتانییەتەکان دەرناخات، بەڵکو تاقیکردنەوەی نموونەیی شیکاری بۆ تێگەیشتن لـەو

کێشانەی ڕووبەڕووی کۆمەڵگای ئیسلامی دەبوونەوە، ئەنجام دا. لە پێناو زیندووکردنەوە و پەرپێدانیدا بوو. ئیبن خەلدون بە بیرێکی قووڵ و تێڕوانینێکی فەلسەفییانەوە، شیکردنەوەی بۆ دەرهاویشتە مێژووییەکان ئەنجام دا، هەروەها هەوڵیدا شیکاری بۆ خاڵە لاواز و بەهێزەکان لە کۆمەڵگای مرۆڤایەتیدا بکات، لەبەر ڕووناکیی ئەو هزر و بیروباوەڕ و تێڕوانینانەی لە قورئان و سوننەتدا هەن، هەروەها ئەو ڕێگایانەی کە لەسەریان ڕۆشتوون بە درێژایی مێژووی ئیسلامەتی.

بە کورتکردنەوەی پەند و ئامۆژگاریی بنەڕەتیی هەڵێنجاو لە مێژووی ئیسلامەتیدا، کارێکی باشی ئەنجام دا، کاتێ کە دەڵێت ئیسلام، موسڵمانانی لە ساتەوەختە نارەحەتەکاندا ڕزگار کردووە، نەك بە پێچەوانەوە، چونکە ئیسلام هەمیشە و بە درێژایی مێژوو سەرچاوەی بنەڕەتی ئیلهام بووە، خاڵی کۆبوونەوەی چارەنووسساز بووە لە پێناو بەدەستهێنانی گەشەسەندن و نوێبوونەوەدا.

ئەم جۆرە تێڕوانینە بە گشتی جیاوازە لەو ڕێگایەی کە زۆربەی هەرە زۆری ڕۆژهەڵاتناس و زانا ڕۆژئاواییەکان، ئەوانەی گرنگی بە مێژووی ئیسلامەتی دەدەن، گرتوویانەتەبەر، کە بە شێوەیەکی گشتی هەوڵیان داوە بە شێوەیەك لە شێوەکان لۆمەی دواکەوتنی موسڵمانان بخەنە ئەستۆی ئیسلام و بیروباوەڕەکەی، خۆیان بە تەواوەتی بێئاگا دەکەن لەوەی کە سەرچاوەی گەشەسەندن بە درێژایی سەردەمە سەرەکییەکان لە مێژووی مسولمانان‌دا، تەنیا لە خودی ئیسلامەوە

بووە، لە ڕاستیدا هەندێکیشیان وای بۆ دەچن ـ گەیشتوونەتە ڕادەیەك ـ کـە مردنـی شارسـتانییەتی ئیـسلامی ئاشـکرا بکـەن، شارسـتانییەتی ئیسلامییش وا دەبینن کە کەلتوورێکی ڕابوردووە و ڕاستییەك نییـە کـە بژێت و گەشە بکات و وێنەی ئایندە بکێشێت.

زانایانی موسڵمان بە توندی ڕووبەڕووی ئەم لێکچوونە وەستانەوە و شـەپۆلێکی ڕابـوونی ئیـسلامی لـە سەرانـسەری جیهانـدا بـەدرۆی خستنەوە، هەروەها ئەم لێکچوونە هەڵەیـە لـە مێـژوو و شارسـتانییەتی ئیسلامیدا ڕێگایەکی نوێی لە ئەدەبیاتدا گرتەبـەر کـە لـە "پیـشەسازیی تۆقێنەر"دا خۆی بینییەوە، کە لە ئاسـۆی هـزر و ڕاگەیاندنەکانـدا دوای ڕووداوە کارەسـاتبارەکەی یـازدەی سـێپتەمبەر دەرکـەوت. ئێـستا پێداوستییەکی هەنووکـەیی و بابـەتی هەیـە بـۆ هـەوڵێکی ڕاسـتەقینە و بابەتییانـە بـۆ تێگەیـشتن لـە شارسـتانییەتی ئیـسلامی و بـارودۆخی ڕاسـتەقینەی کۆمـەڵگای ئـەمڕۆی ئیـسلامی، لێکۆڵینەوەیـەکی دادوەرییانەی پشت بەستوو بە ڕابوونێکی ئیسلامیی هاوچـەرخ بکرێـت. ئەوەی پێویستە ئاماژەی پـێ بـدرێت، هەنـدێ هـەوڵ هـەن لـە جیهـانی ڕۆژئاوا بۆ تێڕوانین لە بارودۆخی ئیسلامی کە تێڕوانینێکی واقیعییانەیە، هەروەها دۆزینەوەی هۆکار بۆ گفتوگـۆ و هاوکـاری لـە نێـوان ئیـسلام و ڕۆژئاوادا، سەرەڕای ئەو گوتارەی کە ئێـستا بـاڵی تێـڕوانین و بـیردۆز و ئاینـدەبینیی پەیوەسـت بـە ململانـێ و ڕووبەڕووبوونـەوە بەسـەردا کێشاوە، حەزدەکەم لەم بارەیەوە ئاماژە بە کاری بیرمەندەکان بـدەم،

وەك: مارشـــاڵ هودجـــسۆن[1] (Marshal Hodgson) و جـــۆن ئیـــسبۆ ســـیتۆ[2](Esposito, John) جـــۆن فـــول[3] و هـــانس کۆنگ[4] (Hans Kung)، کارەکانیان هەندێ ڕۆشنایی دەخاتە سەر لایەنێکی تاریك، ئەم هەوڵەش کە کتێبەکـەی عومـەر شـابرا پێـشکەشی دەکـات، تـاك و بێوێنەیـە، چـونکە دەچـێتە سـەر پانتاییـەکی نـوێ لـە

---

[1]. Hodgson, Marshal G. S. The Venture of Islam. Conscience and History in a World Civilization, Chicago: University of. Chicago Press, 1974.

[2]. Esposito. John. L. (ed). The Oxford History of Islam, Oxford, Oxford: University. press. 2001; Also Esposito. John. L. and John, D. Voll. makers of Contemporaty. Islam. 2nd Ed, New York:, Oxford: University. press, 2001.

[3]. Voll, John D. Islam Contimuity and Change in the Modren World, 2nd Ed, Syracuse. Syracuse University Press ;1994.

[4]. Kung, Hans. Islam. Past., Present and Future, Oxford One World, 2007.

هـــانس کـــۆنگ هـــەوڵی دا دینامییـــەتی ســـەرهەڵدانی شارســـتانییەتی ئیـــسلامی و دارمـــانی و گەشەسەندنی و لاوازبوونی لە شـەش شـێوەدا کورتبکاتـەوە: کۆمـەڵگای ئیـسلامیی ڕەسـەن، ئیمپراتۆرییـەتی عـەرەبی، شـێوەی کلاسـیکیی ئیـسلامی بـەو پێیـەی کـە ئـایینێکی جیهانییـە، شێوەی زانایان و سۆفییەکان، شێوەی تازەگەری، شێوەی پاش تازەگەری، دووپاتی دەکاتەوە و دەڵێت: پێویستە دان بەوەدا بنێین سـەبارەت هـەموو ڕەوتـە مێژووییـەکان و ڕەوتـە دژەکـان، بـەردەوام لـە گـشت وێنـە جۆراوجۆرەکـانی مێـژوودا و ئـەوەی ئیـسلام بـەدیهێناوە، هێـشتا زینـدووە، بابـەتێك هەیـە پێویـستە گرنگیـی تـەواوی پـێ بـدەین کـە پێکهاتـەکانی و تێڕوانینـە بنچینەییەکانی لە حاڵەتێك لـە حاڵەتەکانـدا، لـە سەرچـاوەیەکی هەڕەمەکییـەوە هـەڵناقوڵێت، بـەڵکو بـە تـەواوی پابەنـدە بـە کەسـایەتییەکی مێـژوویی دیـاریکراوەوە، کـە ئـەویش کتێبێکـی پیرۆزە، ئەمەش بە نموونەیەکی نەگۆڕ دەمێنێتەوە. بڕوانە:

Kung, Hans. Islam; Past, Present and Future p. 20.

میانەی پێشکەشکردنی تێڕوانینی ئیسلامی بە شێوەیەکی بەرز و باڵا، لە ئاستێکی بەرزی زانستی و ئەکادیمییەکی ڕاستگۆ و تێڕوانینێکی قووڵەوە.

بەشدارییە سەرەکییەکانی عومەر شابرا لە گۆڕەپانی ئابووریدا و بە تایبەتیش لە ئابووریی ئیسلامیدا خۆی دەبینێتەوە. ڕۆچوونی بە مێژوو و فەلسەفەی مێژوودا ـ وەك دەردەکەوێت ـ لقی تریشی لێبووەتەوە لە میانەی چوونە ناو بوارەکانی ئابوورییەوە. کتێبی سەرەکی و یەکەمی "بەرەو سیستمێکی دراوی دادپەروەرانە" کە لە ساڵی ١٩٨٥دا بڵاوبووەوە و خەڵاتی شا فەیسەڵی نێودەوڵەتیی لە ساڵی ١٩٩٠دا پێ وەرگرت، چارەسەری بنەماکانی دراوی ئیسلامی دەکات. توێژینەوەیەکی زانستیی ئاست بەرزە لەسەر مەسەلەی سوو لە ناوەندی دارایی و ئابووریی نوێدا. خستنەڕوویەکی زانستییانەیە سەبارەت بە هۆکارە لۆجیکییەکانی حەرامکردنی سوو، بەشدارییەکی داهێنەرانەیە بۆ داهێنانی چوارچێوەیەکی سەرەکی بۆ سیستمێکی دراوی بێ سوو. بە شێوازێکی کارامە دەیسەلمێنێت کە سیستمێکی دارایی بێ سوو (ئاسایش و داپەوەری بەدیدەهێنێت)، نەوەك دەتوانرێت، بەڵکو زاڵبێت بەسەر ئەو یاسایانەی ئێستا پەیڕەودەکرێن لە سوودی سوودا. وا دەردەکەوت بیرۆکەکە لە حاڵەتێکی دوودڵیدا بووبێت، بەدەر لە هەموو مەسەلەکانی تر، لەسەر مەسەلەی چۆنیەتی جێبەجێکردنی یاسایەکی دراویی بێ سوو جێبەجێ ناکرێت، ئەم یاسایە سەرکەوتنێکی تەواوەتی

بـەدی ناهێنێـت و بەرهـەمێکی باشیـشی نابێـت، ئەگـەر سیـستمێکی ئابووری نەبێت و لە ژینگەیەکی ئیسلامیی پوختدا نـەبێت، دیـارە ئەمـە پاڵی پێوە ناوە لێکۆڵینەوەکـەی لەسـەر سیـستمی ئـابووریی ئیـسلامی بێت، هەووەها لە میانەی یاسا ئابوورییە هاوچەرخەکاندا بەدواداچوونی بۆ بکات، کە سەرمایەداری و سۆسیالیستی و دەوڵـەتی خۆشـگوزەرانی دەگرێتەخۆ. هەروەها هەوڵەکانی و بیروباوەڕی لە کتێبێکـی سـەرەکیی دووەمدا (ئیسلام و ڕووبەڕووبوونەوەی ئابووری) خۆی دەبینێتەوە، کـە لـە سـاڵی ١٩٩٢دا بڵاوکراوتـەوە و ئەمـە کتێبێکـی ئاسـانە و پـشت بـە توێژینەوەی زانستیی تێروتەسەل دەبەستێت و گفتوگۆی ورد سەبارەت بــە ســەرمایەداری و سۆسیالیــستی و وڵاتێکــی خۆشــگوزەران و ئابوورییەکی ئیسلامی، دەکات.

شـابرا، لـە میانـەی ئـەم لێکۆڵینـەوە بەراوردکارییـەدا، بـاس لـەو کێشانە دەکات کە پەیوەندییان بە جێبـەجێکردنی سیـستمی ئـابووریی ئیـسلامییەوە هەیـە لـە هـاودەقیی ئیـسلامی هاوچـەرخدا، هـەوڵی داوە جەختبکاتەوە کە پێویستە ستراتیژییەتێکی گشتگیر فەراهەم بهێنرێت، لـە پێنـاو جێبـەجێکردنی لێکنزیکبوونەوەیـەکی ئیـسلامی لـە ئـابووریی وڵاتە ئیسلامییەکاندا. شابرا دووپاتیدەکاتەوە کە ئـەم لێکنزیکبوونـەوە نوێیە ئەنجامێکی باشی نابێت، ئەگەر گۆڕانکاریی بنەڕەتی لـە ئامـانج و ڕێوشوێنە سیاسی و بەرنامە کۆمەڵایەتییە ـ ئابوورییە پەیڕەوکراوەکانی وڵاتانی جیهانی ئیـسلامیدا نـەکرێت، کـە پێویـستە ئەمـەش سـەرلەنوێ

پەیوەست بێت بەو پەیکەرەی تەواوی دامەزراوە و ئامێرە ئابوورییەکانەوە. بۆیە بەرنامەی دارایی و ئابووریی ئیسلامی هەمووی نایەتە دی، ئەگەر بەشێك نەبێت لە چاکسازیی گشتگیر و بەرنامەی دارشتنەوەی پەیکەری ئابوورییەکەی.

وا دیارە ئەم بابەتە بەرەو قۆناغی دووەمی بیرکردنەوەی بردووە لە کێشەکانی گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتی و گەڕان بە دوای نموونەی مێژوویی بۆ بنیاتنانەوەی کۆمەڵگا و ئابوورییەکەی. هەر بۆیە کتێبی سەرەکی سێیەمی (ئایندەی زانستی ئابووری لە تێڕوانینی ئیسلامییەوە) کە ساڵی ٢٠٠٠ بڵاوکرایەوە، بۆ دۆزینەوەی ئەم بوارانە بوو.

لەو کتێبەیدا هەوڵی داوە ڕووبەڕووی کێشە گرێدراوەکان ببێتەوە کە پەیوەستن بە بەستنەوەی ئابووری و کۆمەڵگا و مێژوو بەیەکەوە. تا ڕادەیەکی زۆر پشتی بە نموونەکەی ئیبن خەلدون پەیوەست بە گۆڕانکاریی کۆمەڵایەتی ـ ئابووری، بەستووە، کە کلیلێکی سەرەکییە بۆ تێگەیشتن لە ڕابوردوو و دەستپێکێکیشە بۆ پلاندانان لە پێناو ئایندەدا. هەوڵەکەشی لە ئابوورییەکی نوێدا پشت بە بەهاو بیروباوەڕی ئیسلامی دەبەستێت، کە ئەمەش وای لێکردووە لەسەر کێشە ئابوورییە سیاسییەکان زۆر بوەستێت: ڕۆڵی دەوڵەت، گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتییەکان، دینامیکییەتی مێژوو. لە گفتوگۆکەیدا بۆی دەرکەوت کە پێویستە جەخت لەسەر ڕۆڵی سەرەکی لە مەرامەکانی شەریعەت

بکرێتــەوە (بــەرگریی ئــایین و عــەقڵ و ژیــان و نــەوە و ســامان) بــۆ مامەڵکردن لەگەڵ تایبەتمەندییەکانی فیقهی ئایینیدا.

لــەناو شــیکارییەکانیدا هەنــدێ هۆکــاری تــر ســەرهەڵدەدەن، بــە تایبــەتیش کێــشەکانی ئــازادی، مــافی مرۆڤــ، و دادپــەروەری، و دەستەڵاتێکی پێگەیشتوو، و لێپرسینەوە، و قەڵاچۆکردنی گەنـدەڵی، و بنەبڕکردن هەژاری و نەخوێنـدەواری. ئەمـە ئـەو شـێوەیەیە کـە شـابرا لەگەڵ ئابووریدا دەیبات بەرەو بوارەکانی مێژوو و زانستی کۆمەڵایەتی و سیاسەت، دەتوانین لە ئەنجامی ئەم تێڕوانـی گەشـتە فیکرییەیـەدا لـەم لێکۆڵینەوەیەیــدا (شارســتانییەتی ئیــسلامی: هۆیــەکانی دارمــان و پێویستی بۆ چاکسازی) بە ڕوونی ببینین.

کتێبی (شارستانییەتی ئیسلامی: هۆیەکانی دارمان و پێویستی بۆ چاکـسازی) لێکۆڵینەوەیـەکی پـسپۆڕیی هەمـە جـۆرە، پێویـستی بـە خوێندنەوە و تێگەیشتن هەیە لە میانی کارەکانی پێشووی دانەردا. لەم کتێبەدا جەخت لەسەر هۆیەکانی دارمانی موسڵمانان، و سروشتی کێشە هەنووکەییەکانیان دەکاتەوە، کە ئێستا موسڵمانان پێیدا تێپـەڕ دەبـن. بابەتە سەرەکییەکان بۆ ستراتیژێکی گشتگیر بۆ چاکسازی و سەرلەنوێ بنیاتنانــەوە دیــاری دەکــات. هــەروەها ڕۆڵــی بــیروڕا و تاکــەکان و دامــەزراوەکان و بزوتنــەوە کۆمەڵایەتییــەکان و دەوڵــەت، مایــەی گرنگیپێدانێکی تایبەتی ئەون. ئەم سـتراتیژییە لـە تێڕوانینـی ڕەوشـتی ئیسلام و ڕۆحییەت و وێناکردن و مەرامـە ئایـدیۆلۆژیی و سیاسـییەکانی

گــەلانی ئیــسلامی شــاردراوەن. یەکــەکانی بنیــاتی ســتراتیژییەتی پێشنیارکراو لە کۆکردنەوەی هۆکارە ئابووری و سۆسیۆلۆژی و سیاسی و تــەکنۆلۆژی و بنیاتگــەر پێکــدێن، بــۆ ســەرلەنوێ بنیاتنانــەوەی کۆمەڵگایەکی ئیسلامی و دەوڵەتێکی ئیسلامی.

مۆرکێکی گرنگی تری ئـەم لێکۆڵینەوەیـە، ئەوەیـە کـە ڕووبـەڕووری هەندێ بابەت دەبێتەوە کە پەیوەستە بـە شارستانییەتی ئیـسلامی لـە میانــەی ڕیزبەنــدیی جیهانییــەوە. دانــەر لــەم لێکۆڵینەویــەدا نــەریتێکی هەمەلایەنەی ڕووبەڕووبوونەوەکان دووپاتدەکاتــەوە و ســتراتیژییەتێکی گشتگیری هاوسەنگ دەخاتەڕوو، بە پێچەوانەی ستراتیژییە چاکسازییە کەرت کەرتبووەکان کە ئێستا لە ئارادان. ئەو نزیکخستنەوە گشتییەی کــە داوای دەکــات لەگــەڵ ڕۆحــی مێــژوویی گــەلانی موســڵماندا یەکدەگرنەوە. هەروەها بەدیهێنەری خواستەکانە کە مرۆڤایەتی داوایان دەکــات، کــە دووچــاری هەوڵــە نەزۆکــەکان بووەتــەوە و هەوڵــدەدات چارەسەر بۆ کێشە ئابووری و کۆمەڵایــەتی و سیاســییەکان بدۆزێتــەوە، بێئەوەی گۆڕانکارییــەکی بنــەڕەتی لــە میانــەی ئــەو نموونــە عــەلمانی و لیبراڵییانەی کە هەن، ئەنجام بدات، گۆڕانکارییەك کە نموونەیەکی نــوێ پێــشکەش بکــات کــە تەواوکــەر بێــت لــە نێــوان لایەنــە مــاددی و مەعنەوییەکانـدا، ڕۆڵـی سـەرەکیش بـدات بـە دادوەری و یەکسانی بـۆ هەموو مرۆڤایەتی.

ڕوونیی هەموو تێڕوانینێك، مـەرجی سـەرەكی و یەكەمـە بـۆ هـەر ستراتیژییەكی كە چاكسازی شایانی گرنگیپێدان بێت، عومـەر شـابرا لـە وێنەكێشانی تێڕوانینێك بۆ كۆمـەڵگا و ئـابووریی ئیـسلامی سـەركەوتوو بوو، كـە بتوانێـت لـە سـایەی نموونەیـەكی ئیـسلامیدا بنیاتیـان بنێـت، ئایندەی گـەلانی ئیـسلامی لـە سـەدەی بیـست و یەكـدا بەسـتراوە بـەو هەوڵانەی دەدرێن بۆ سەرلەنوێ بنیاتنانەوەی كۆمەڵگا لەبـەر ڕۆشـنایی ئەم نموونە و تێڕوانین و كاركردنانەدا كە بریتین لە دوو بڕگەی سەرەكی بۆ ئەم ستراتیژییەتە: تێڕوانین بە بێ كار دەبێتە خەون، كاریش بە بـێ تێڕوانین دەبێتە دێوەزمە و كارنامەیەكە بۆ كارەساتەكان.

نزیكخستنەوەكانی شابرا پشت بە هۆكارە ڕەوشتییەكان دەبەستێت و لە چواردەوری مرۆڤدا دەخولێنەوە. دادپەروەری و خۆشگوزەرانی بۆ هـەموو مرۆڤـەكان، ئەمـە بـە بـەهاترین ئامـانج دادەنـرێن كـە هـەموو مرۆڤایەتی چاوەڕوانی دەكات، بەڵام ئەو ستراتیژییەتانەی كە پـشت بـە نموونەی عەلمانی و مادییەكان دەبەستن، ئەمانـە لایەنـە هەسـتیارەكان پشتگوێ دەخەن. شابرا داوا دەكات كامڵبوونی تەواوی یەكتری هەبێت، لـە نێـوان لایەنـە مەعنـەوی و ڕۆحییـەكان لـە لایـەك، لایەنـە مـاددی و سـتراتیژییەكانیش لەلایـەكی تـرەوە، پێشخـستنی داهاتـە مرۆییـەكان دەبنە یەكەم هێزی كاریگەر بۆ بنیاتنانی بنەمای سیستمی كۆمەڵایـەتی ـ ئابووری دادپەروەرانە، كە گەشەپێدان و فەراهەمهێنانی داهاتە مـادی و تەكنۆلۆژییەكان ببنە هۆكارێك بۆ ئـەو ئامانجـە، نـەوەك ببنـە خـودی

ئامـانج. شـابرا گرنگیـی ئـازادی و ڕەخـساندنی هـەلی کـار و ڕوونـی و لێپرسـینەوە لـە هـەموو ئاسـتەکاندا دووپاتدەکاتـەوە، هـەروەها دادپەروەری و لێبووردەیی دوو بابەتی بنەڕەتین لە هەر سـتراتیژییەکی چاکسازیدا کە ئەو پێناسەیەیان بەسەردا بسەپێنرێت. لەم ستراتیژییەدا پێویستە گرنگیی زیاتر بە فێرکردن و توێژینەوە بـدرێت، هـەروەها بـەو بەرنامە گشتگیرییانەی تایبەتن بە پێشخـستنی زانـستی و تـەکنۆلۆژیا. دیوکراتیـەت و ئامێرەکـانی بەشـداربوو تێیـدا، وەك ڕۆحـێکن لـەو سیـستمەدا. بـاڵاترین ئامـانجیش بەدەسـتهێنانی دادپەروەرییـە بـۆ هەمووان و یەکڕیزی نەتەوە و، پشتبەخستن بە خود لـە جیهانێکدا کـە فرە لایەنە پێشبڕکێ تیایدا باڵا دەستە و بەدوور بێـت لـە خۆسـەپاندن. هـەروەها پێویـستە ڕووبـەڕووی گەنـدەڵی و خواسـتی بـەکارهێنان و پـشتگوێ خـستنی ژینگـە ببنـەوە، لـە کاتێکـدا کـە تـاك خـۆی هەڵسووڕێنەری ڕاسـتەقینەی سیـستمەکەیە، بۆیـە ڕۆڵـی پاککـەرەوە ڕەوشـتییەکان و دامـەزراوە کۆمەڵایەتییـە ـ ئابوورییـەکانی تـر و ڕۆڵـی ئیجـابیی دەوڵـەت، بـە کۆڵەکـە سـەرەکییەکانی ئـەو سیـستمە نوێیـە، دادەنرێن.

بەم شێوەیە عومەر شابرا هەموو پێکهاتـە سـەرەکییەکانی دیـاری کرد بۆ ستراتیژییەتێك شیاو بێت بۆ گۆڕان، بۆ ئـەوەی شارسـتانییەتیی ئیسلامی بگاتە سایەیەکی نوێ، لە هەمان کاتدا پارێزگاری لە ناسنامە و تایبەتمەندیی خۆی بکـات، بـە مـەرجێك ببێتـە نیعمـەتێك بـۆ سـەرجەم

ئوممەت و مرۆڤایەتی. من دوودڵ نیم لەوەی کە چوارینە زانستییەکەی عومـــەر شـــابرا، بـــە تایبـــەتیش ئـــەم کتێبـــەی کـــە پەیوەنـــدیی بـــە شارســـتانییەتی ئیـــسلامییەوە هەیـــە، هاوبەشـــییەکی گەورەیـــە لـــە پێشخستنی فیکری کۆمەڵایـەتی ـ ئـابووریی ئیـسلامی لـەم سـەردەمەی ئێستادا، ئاسۆی نـوێتریش دەکاتـەوە بـۆ وتـاری فیـکری و گفتوگـۆ لـە ناوەنـدی زانایـانی موسـڵمان و دیـالۆگ لەگـەڵ هـەموو جیهانـدا. ئـەم بیروبۆچـوونانە بنەمایـەکی بـەهێز بـۆ دارشـتنەوەیەکی نـوێ دروسـت دەکـات بـۆ سیاسـەتەکان و پیاچـوونەوەی پەیکـەری کۆمەڵایـەتی - ئابووری بۆ کۆمەڵگای ئیسلامی.

**خورشید ئەحمەد**

**لیستەر ـ شانشینی یەکگرتوو**

**١٦ی تشرینی دووەمی ٢٠٠٧**

# دەستپێك

خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رحْمَةً لِلْعَالَمِينَ﴾ الانبياء /١٠٧، هــەروەها دەفــەرموێت: ﴿وَلِكُــلّ وِجْهَــةٌ هُــوَ مُوَلِّيهَــا فَاسْــتَبِقُوا الْخَيْرَاتِ﴾ البقرة / ١٤٨.

دەتــوانین بڵــێین ئیــسلام دەتوانێــت دیدگایــەكی بەســوود بــۆ ڕۆشنكردنەوەی ویژدانی خەڵكانی ئەم سەردەمە دابین بكات، مرۆڤایەتی بە گشتی، نەك تەنیا موسڵمانان، بەرژەوەندییان دەبێت لە ئەنجامەكـەی (مارشارڵ هۆدجسۆن)دا.[1]

ئەو دیدگایەی قورئان پێشكەشی موسـڵمانی دەكـات، ڕەحمەتێكـە بـۆ مرۆڤایەتی، بەڵام جیهـانی ئیـسلامی وێنەیـەك پیـشان دەدات لەگـەڵ ئـەم دیدگایەدا ناگونجێت. لە ماوەی چەند سـەدەیەكی ڕابـووردوودا، بـە چـەند كردارێكی داڕمانی بەردەوامـدا تێپـەڕی، نـەیتوانی ئـەم دیدگایـە جێبـەجێ بكات. پێویستە لێكۆڵینەوە لە هۆیەكانی ئەم داڕمانـە بكرێـت. هەوڵمـداوە بە كورتی وەڵامی ئەمە لە دوو بەشدا بدەمەوە: بەشی سێیەم و شەشـەمی كتێبەكـەم: "ئاینـدەی زانـستی ئـابووری لـە تێـڕوانینی ئیـسلامییەوە". لەبەرئــەوەی ئــەم دوو بەشــە، بەشــێكن لــە زانــستێك پەیوەســتە بــە ئابووریــیەوە و لەوانەیــە زیــاتر ســەرنجی ئابووریناســەكانی ڕاكێــشابێت، لەگەڵ ئـەوەی بابەتەكـە زرۆیكـی تـر دەگرێتـەوە، بـە تایبـەتیش زانایـانی

[1] . Hodgson, The Venture of Islam, Volume 3, p. 441.

کۆمەڵناسی و سیاسی و چاکخوازەکان، بۆیە دامەزراوەی ئیسلامی ( The Islamic Foundation) ئاگاداریان کردمەوە کە لە کتێبێکی سەربەخۆدا و بەشێوەیەکی زیاتر گشتگیرییانە، تاوتوێی هۆیەکانی داڕمان بکەم، کە سەرنجی بازنەیەکی فراوانتری خوێنەران ڕابکێشێت، لە بری تەنیا زانایانی ئابووری، هەروەها گفتوگۆکەش هێمایەك بێت بۆ بەرنامەیەکی چاکسازی بە کردەوە. منیش داواکارییەکەیانم جێبەجێ کرد، بە پێداچوونەوە و فراوانکردنی ئەو دوو بەشەی کە باسکرا، بەشی تریشم بۆ خستنە سەر، سەرەڕای بەشی کۆتایی کە زیاتر گشتگیر بوو سەبارەت چاکسازیی پێویست. هیوادارم ئەمانە گفتوگۆ و دیالۆگ بوروژێنن سەبارەت بە هۆیەکانی گلۆربوونەوەی موسڵمانان، چاکسازییەکی پێویست و یارمەتیدەر بن بۆ هێنانەدی مەبەستی قورئان، کە ئیسلام بکاتە ڕەحمەتێك بۆ مرۆڤایەتی.

زۆر سوپاسگوزاری ڕۆبەرت وابلز (Robert Whaples) و موراد هۆفمان (Murad Hofmann) و ئەنەس ئەلزەرقا و محەمەد نەجات الله سدیقی و سامی سوەیلم و خورشید ئەحمەدم، کە دەستنووسی یەکەمیان بە وردی خوێندەوە تێبینیی بەسوودیان پێشکەش کرد، کە زۆر بەسوود بوون لەو پاکنووسەی تێمدا کرد. هەر بۆیە لە ئەنجامی کۆتاییەکەیدا ژمارەیەك تێڕوانینی بەنرخ ڕەنگدەداتەوە، بەڵام هیچ کەسێك لەوانە ڕەشنووسی کۆتایی نەبینیوە، بۆیە خۆم بەرپرسیارم لە هەر هەڵەیەك لە کتێبەدا ڕووی دا بێت.

ئـەو بیروبۆچـوونانەی لـەم کتێبــەدا هــاتووە، بیروبۆچــوونی خۆمــە، ڕەنگدانەوەی بیروبۆچوونی ئەو لایەنە نییە کە ئێستا کـاری تێـدا دەکـەم، یاخود هەر لایەنێك پێشتر کارم تێدا کردبێـت. سـوودێکی زۆرم لـە هەنـدێ کتێب و نووسراو وەرگرت لە ساڵەکانی ڕابووردوودا خوێندبوومنەوە، بـەڵام نەمتوانی لە لیستی سەرچاوەکاندا ئاماژە بەو هەموو سەرچاوانە بکەم کـە پــشتم پــێ بەســتوون، لەبەرئــەوەی ناوهێنــانی ئــەو هــەموو کتێــب و نووسراوانەی کە سوودم لێ وەرگرتن، شوێنێکی فراوانتری داگیر دەکرد لـە لیستی سەرچاوەکاندا، هەرچەندە ئەمە بە هـیچ جۆرێـك کـار ناکاتـە سـەر بەهای بەشدارییان لەم کتێبەدا. هـەروەها سـوودم لـە هـەردوو وەرگێڕانـی قورئــانیی یوســف عــەلی و محەمــەد ئەســەد وەرگرتــووە، هــەروەها لــە (پێشەکی)یەکەی (ئیبن خەلـدون)ی ڕۆزنتـاڵ، بڵاوکـراوەی سـاڵی ١٩٦٧ و وەرگێڕانی عیسەوی بڵاوکراوەی ساڵی ١٩٥٠، لەگەڵ ئەوەشدا مـن هـەردوو وەرگێڕانەکەم بەکارنەهێناوە . بەڵام وەرگێڕانـی فـەرموودە و فیقهـەکان و ئەدەبیاتــە عەرەبییــەکان کــە لــەم کتێبــەدا هــاتوون، خــۆم وەرمگێــڕاون. سوودیــشم لــە تێبینییــە دووربینییــەکانی دکتــۆرە ســومەیەی کــچم لــە وەرگێڕانی هەندێکیاندا وەرگرتووە.

پێمخۆشــە سوپاســی عەبــدول لــەتیف بیلــو بکــەم کــە بڵاوکــراوە سەرژمێرییەکانی وڵاتـانی ئیـسلامیی پـێ بەخـشیم، کـە کـاتێکی زۆری بـۆ گەڕاندمەوە، هەروەها خۆم بـە قـەرزاری مـەنازیر ئەحـسەن ( Manazir Ahsan) بەڕێوەبـەری گـشتیی دامـەزراوەی ئیـسلامی لـە لیـستەر، لـە شانشینی یەکگرتوو، دەزانم و سوپاسـی دەکـەم، گـەر ئـەو نەبووایـە ئـەم

کتێبــە تــەواو نــەدەبوو. لــە کۆتاییــدا سوپاســی خــاتوو ســوزان ســاکری (Susanne Thackray) دەکـــەم بـــۆ یارمەتیـــدانی لـــە بـــواری دەرچوونیدا.

لە هەر شوێنێك دوو ساڵی جیاواز نووسرابوو، پاش هەر کەسایەتییەکی ئیسلامیی کـەلتووری یـاخود نـاوی خێزانـی دەسـتەڵاتدار یـان ڕووداوێـك، یەکـەمیان نیـشانەیە بـۆ ڕۆژژمێـری کۆچـی و دووەمیـان نیـشانەیە بـۆ ڕۆژژمێـــری گریگـــۆری (زاینـــی). لەگـــەڵ ئـــەوەی ئـــەم کـــارە دەبێتـــە سەرلێشواندنی خوێنـەر، بـەڵام پێویستیـشە بـۆ یارمەتیـدانی خوێنـەر بـۆ زانینی بوونی ئەو کەسە یان ئـەو خێزانـە دەسـتەڵاتدارە لـەو کاتـەدا، یـان زانینی کاتی ڕوودانی ڕووداوەکان دوای پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر).

هـــەروەك لـــە کتێبـــەکانی پێـشوومدا وتوومـــە، قـــەرزاری خێزانەکـــەمم، باشـترین ئـافرەت، گەورەیـە و ئـەژمار ناکرێـت، چـاکەیەکی زۆری هەیـە بەسەرمەوە، لـە یارمەتیـدانم و هانـدانم بـە بـەردەوامی و لـە ئەسـتۆگرتنی ژمارەیـەك لـە ئەرکـەکانی ماڵـەوە، بـۆ تـەواوکردنی ئـەم کتێبـە. هـەروەها سوپاسی محەمەد ڕەشید و محەمەد ڕەسووڵ دەکـەم، بـۆ ئـەو یارمەتییـە بێوێنەیەیان لە کـاری سـکرتاریەتدا پێـشکەشیان کـردم، بـۆ ئامـادەکردنی ئەم کتێبە.

**محەمەد عومەر شابرا/ جیدە**

**١٠ی جەمادی یەکەمی ١٤٢٨ی ك**

**٢٤ ی ئایاری ٢٠٠٧ی ز**

# پێشەکی

## هەندێ پرسیاری یەکلاکەرەوە

ئێستا جیهانی ئیسلامی بە قۆناغێکی مێژوویی سەختدا تێدەپەڕێت، لەگەڵ ئەوەی ژمارەی دانیشتووانی دەگاتە پێنج یەکی ژمارەی دانیشتووانی جیهان، هەروەها ئاستی بەرهەمهێنانی دەگاتە نزیکەی ٨٪ی کۆی بەهای کڕینی بەرهەمهێنانی نەتەوەیی جیهان. جیهانی ئیسلامی دووچاری نەخوێندەواری و هەژاری و بێکاری و تێکچوونی گشتیی ئابووری بووەتەوە، بەراورد لەگەڵ هەندێ وڵاتی تازەپێگەیشتوودا لە ئاستێکی زۆر دواکەوتوودایە، بەدەر لە وڵاتە پیشەسازییە گەورەکانیش. نزیکە بڵێین لە هەموو بوارەکانی ژیاندا، وەك ئابووری و سیاسی و فێرکردن و تەکنۆلۆژی و سەربازی، هەتاوەکو لە ڕوانگەی بەدەستهێنانی مەبەستەکانی شەریعەتیشەوە، زۆر لاواز

دەردەکەوێت[1]، لەبری هێزێکی مەعنەوی و دابینکردنی پێداویستییەکان بۆ هەمووان و دەستەبەرکردنی دادپەروەریی کۆمەڵایەتی ـــ ئابووری و برایەتی ـ وا چاوەڕوان دەکرێت، لە کۆمەڵگای ئیسلامیدا بڵاوببێتەوە ـ بۆیە دارمانێکی ڕەوشتی دەبینین، هەست بە کێشەیەکی قووڵی نادادپەروەری دەکرێت لە دارایی و ساماندا، کە ناکۆکی و دابەشبوونی لێدەکەوێتەوە. لە کاتێکدا دەبینین پێویستییە بنەڕەتییەکانی ڕێژەیەکی زۆری دانیشتووان دابین نەکراوە، لەبەرئەوە دەبینین چینە دەوڵەمەند و ناوەندە باڵاکان لە حاڵەتێکی باشی خۆشگوزەرانیدان. بۆیە بوونی هەژاری لە تەنیشت دەوڵەمەندییەوە، برایەتی و یەکسانیی کۆمەڵایەتی تێک دەدات، یەکێکە لە هۆکارە سەرەکییەکانی تاوان و

---

[1]. گفتوگۆیەکی تێروتەسەل لەسەر مەبەستەکان کرا لە کتێبەکانی (فیقە)دا، بەناوبانگترینیان نووسینەکانی ئەلماتوریدی (٣٣٣ ك / ٩٤٥ ز کۆچی دوایی کردووە)، شاهی (٣٦٥ ك / ٩٧٥ز کۆچی دوایی کردووە)، باقلانی (٤٠٣ ك / ١٠١٢ ز کۆچی دوایی کردووە)، جوەینی (٤٧٦ ك / ١٠٨٥ ز کۆچی دوایی کردووە)، غەزالی (٥٠٥ ك / ٩٧٥ ز کۆچی دوایی کردووە)، فەخرەدینی ڕازی (٦٠٦ك / ١٢٠٩ز کۆچی دوایی کردووە)، عەمیدی (٦٣١ك / ١٢٣٤ز کۆچی دوایی کردووە)، عیزەدین کوڕی عەبدولسەلام (٦٦٠ك / ١٣٨٨ز کۆچی دوایی کردووە)، ئیبن تەیمییە (٧٢٨ك / ١٣٣٧ز کۆچی دوایی کردووە)، شاتبی (٧٩٠ك / ١٣٨٨ز کۆچی دوایی کردووە)، بۆ زانینی زیاتر سەبارەت بەو گفتگۆیانەیان، بڕوانە:

- Masud, M. Islamic Legal Philosophy: A Study of Abu Ishaq al-shatib's Life and Thought. Islamabad: Islamic Research Institute, 1977.

- الريسوني، أحمد . نظرية المقاصد عند الامام الشافعي،الرياض: دار العلمية للكتاب الاسلامي، ط ١٩٩٢، بەرگ٢، ل٢٥ـ٥٥.

- Nyazee, Imran, Ahsan Khan. The Distinguished Jurist's Primer. Reading, UK: Garnet, 1994, P. 189-268.

توندووتیژی و شێواندنی باری کۆمەڵایەتی و ناجێگیریی سیاسی. هەندێ لە وڵاتانی پیشەسازیی بەهێز هەوڵدەدەن ئـەم بارودۆخانـە بقۆزنـەوە و دەسـت بەسـەر وڵاتـانی ئیـسلامیدا بگـرن، بـە تایبـەتیش ئەوانـەی لـە سـامانی سروشـتیدا دەوڵەمەنـدن، یـان خـاوەن پێگەیـەکی جـوگرافیی ستراتیژین.

ئەم بارودۆخە کۆمەڵێك پرسیار دێنێتە کایەوە، یەکێکیان پەیوەستە بەو هۆکارانەی کە جیهانی ئیسلامیی گەیاندووەتە ئەم ئاستە نزمە، کـە پێشتر و بە درێژایی چەند سەدەیەك خاوەن ڕابووردوویەکی نـەمر بـوو. ئەو هەوڵانەی دراوە بـۆ وەڵامدانـەوەی ئـەم پرسـیارە، پرسـیارێکی تـر دەوروژێنن، ئایا ئەو هۆکارانە چی بوون وایان لـە موسـڵمانان کـرد ئـەو ئاستە بەرزە بەرهەمهێنە بنوێنن لە سەدەکانی پێشووی ئیسلامدا؟ ئایا ئیـسلام ڕۆڵێکـی ئیجـابیی دەبینـی لـەو ڕابوونـەی پێـشووی ئیـسلامدا؟ ئەگەر ئەو ڕابوونەی پێـشوو بەرهـەمی ئیـسلام بووبێـت، بۆچـی ئێـستا ئیسلام توانای نییە بار و گوزەرانی موسڵمانان چاك بکات؟ ئایا لەوانەیە توانـای هــەبووبێت لــەو کاتانــەدا هاوکـاری موســڵمانان بووبێــت لــەو پێشکەوتنەیاندا لە ڕابووردوودا؟ ئایا ئێستا بەهۆی نەتوانینیانەوە بێـت لـــە بەرپەرچـــدانەوەی ڕووداوە نوێیـــەکان کـــە لـــەم ســـەردەمانەدا ڕووبـەڕوویان دەبێتـەوە؟ ئەگـەر ئیـسلام هۆکـار نـەبێت بـۆ خراپیـی بارودۆخی موسڵمانان، ئەی گلەییەکە ڕووبەڕووی کـێ دەبێتـەوە؟ دوای دەستنیـــشانکردنی هـــۆی یـــاخود هۆیـــەکانی دارمـــانی موســـڵمانان،

پرسـیارێکی تـر سـەرهەڵدەدات، ئـەویش: پێویـستە چـی بکرێـت بـۆ چاکسازی لە جیهانی ئیـسلامی، کـە بتوانێـت سـەرلەنوێ هەسـتێتەوە؟ ژمارەیەك لـە زانایـان[1] هۆکـارە جۆراجـۆرە نـاوخۆیی و دەرەکییـەکان

---

[1]. لە نێوانیاندا فیلیب حەتا و شەکیب ئەرسەلان  و ژمارەیەکی تر، بڕوانە:

- Hitti, Philip. History of the Arabs. London. Macmillan, 1958.
- Arsalan, Amir Shakib. Our Decline and its Causes. M. A. Shakoor (tr.), Lahore: S. M. Ashraf, 1962.
-Issawi, Charles. The Economic History of the Middle East. 1800-1914. Chicago: University of Chikago Press, 1966.
- Issawi, Charles. "The Decline of Middke Eastern Trade, 1100-1850. " In D. S. Richards (ed), Islam And The Trade of Asia. Philadelphia: University of Pennsylvania Press, 1970.
- Lambton, Ann K. S. "Persia: The Breakdown of Society. " In P. M. Holt, Ann Lambton and Bernard Lewis (eds), The Cambridge History of Islam. Cambridge University Press 1970, volume 1, p. 430-67.
- Inalcik, Halil. "The Heyday and Decline of the Ottoman Empire. " In P. M. Holt, Ann Lambton and Bernard Lewis (eds), The Cambridge History of Islam. Cambridge :Cambridge University Press. 1970, Volume 1, p. 324-31.
- Inalcik, Halil and Dovald Quataert (eds). An Economic and Social History of the Ottoman Empire, 1300-1914. Cambridge, UK: Cambridge University Press, 1994.
- Musallam, B. E. "Birth Control and Middle Eastern History: Evidence and Hypotheses. "In Abraham L. Udovitch, The Islamic Middle East 700-1900: Studies in Economic and social History. Princeton, NJ: The Darwin Press, 1981, p. 419-470.

ـ إمام، زكريا بشير، طريق التطور الاجتماعي الاسلامي، جدة، دار الشروق، ١٩٧٧م.

ـ النجار، زغلول رجب، قضية التخلف العلمي والتقني في العالم الاسلامي، قطر، رئاسة المحاكم الشرعية والشؤون الدينية، ١٤٠٩ هـ / ١٩٧٧م .

ـ السامرائي، نعمان عبدالرزاق، تفسير التاريخ، الرياض، مكتبة المعارف، ١٩٩٤م.

دووپاتدەکەنەوە، کە بوونە هۆی دارمانی موسڵمانان، بە تایبەتیش دوای سەدەی دوازدەیەم. هەندێ لەو هۆکارانەش لە بێرەوشتی و ونبوونی دینامیکی لە ئیسلامدا خۆی دەبینێتەوە، دوای سەرهەڵدانی دۆگماتیکییەت و بە بەردبوون (تحجر)، تێکچوونی چالاکییە فیکری و زانستییەکان، شۆڕشە ناوخۆییەکان و پەرت پەرتبوون، سەرەڕای دەستتێوەردانی دەرەکی بە بەردەوامی و جەنگەکانیش کە ئابوورییان ڕووخان و لاوازیان کرد، چەندان حاڵەتی نەبوونی هاوسەنگیی دارایی، نەبوونی ئەمن و ئاسایشی کەسەکان و موڵکەکانیش، دابەزینی وەبەرهێنان و گەشەپێدان، و دابەزینی ئاستی کشتوکاڵ و پیشەییەکان و بازرگانی و، یاخود نەبوونی کان و کانزای گرانبەها و پاککردنەوەیان، کارەساتە سروشتییەکانی وەك تاعوون و برسیەتی، ئەمانە بوونە هۆی

---

-Kuran, Timur. "Islam and Underdevelopment: An Old Puzzle Revisited. " Journal of Institutional and Theoretical Economics, March, 1997

-Kuran, Timur. "Why the Middle East is Economically Underdeveloped: Historical Mechanisms of Institutional Stagnation. "The Journal of Economic Perspectives, 18: 3, summer, 2004, p. 71-90

ـ أبو سليمان، عبد الحميد، أزمة العقل المسلم، فرجينيا، المعهد العالمي للفكر الاسلامي، ١٩٩١م.

ـ أبو سليمان، عبد الحميد، أزمة الإرادة والوجدان المسلم: البعد الغائب في مشروع إصلاح الأمة، دمشق، دار الفكر، ٢٠٠٥م.

Lewis, Bernard. "Ottoman Observers of Ottoman Decline. " Islamic - Studies, I, 1962, p. 71-87

. لویس لەم کتێبەیدا بیروڕاکانی لونفی پاشا و حاجی خەلیفەو، حوسەین حەزەرفین و ساری محەمەد و محەمەد پاشا، سەبارەت ڕووخانی عوسمانییەکان دەخاتە ڕوو.

کەمبوونـەوەی تێکـڕای ژمـارەی دانیـشتووانی جیهـان و کەمبوونـەوەی داخوازی، ئەمەش لاوازیی ئابووریی لێکەوتەوە.

نابێت نکوڵی لـە کاریگەرییـە نەرێنییـەکانیش لەسـەر ئـەم هۆکارانـە بکەین: لەوانەیە کۆمەڵگایەکی زیندوو و کاریگەر بتوانێت ئـەم هۆکارانـە تاوتوێ بکات و بە ئازادی شیکردنەوەیان بۆ بکات، تـەنیا بـە داهێنـانی ستراتیژییەتێکی کاریگەرەوە نەوەستێتەوە، بەڵکو جێبەجێـشی بکـات، بۆ بەدوورگرتنی لە هەر کاردانەوەیەکی نەرێنی بە لای کەمەوە ئەگەر بۆ ماوەیـەکی کـورتیش نـەبێت، بـۆ مەودایـەکی درێژخایـەن بێـت. ئایـا موسڵمانان بۆ نەیانتوانیوە ئەمـە بکـەن؟ ئایا هـیچ بەربەسـتێك هـەبوو ڕێگرییـان لـێ بکـات کـە بـە دەنگـەوەهاتنێکی ڕاسـت و دروسـتیان بـۆ بەرپەچدانەوەی ڕووبەڕووبوونـەوە نـاوخۆیی و دەرەکییـەکان هـەبێت؟ گرنگ ئەوەیە لێرەدا ئەم هۆکارانە هەموو کۆبکەینەوە، بـەو پێیـەی کـە زنجیرەیـــەك هۆکـــاری ڕاســـت و دروســـتی بەیەکـــەوە گرێـــدراون، لـــە فەلسەفەیەکی پێشکەوتوودا بیانهۆنینـەوە، بـۆ ئـەوەی دەرکـەوێت کـە زۆربەی هەرە زۆری لە هۆیەکی بنەڕەتییـەوە سـەری هەڵـداوە، وای لـە کۆمەڵگا کردووە نەتوانێت دارمان بوەستێنێت، بەبێ ئەوەی ڕووبەڕووی ئەو هۆیە ببێتەوە کە حاڵەتی دارمانی هێناوەتە کایەوە.

گومـانی تێـدا نییـە لـە میانـەی سـەدەکانی ڕابـوردوودا هـەوڵی هەمەچەشنە بۆ ڕاگرتنی ئەم دارمانە دراوە، چونکە دارمانی موسڵمانان دیاردەیـەك نـەبووە لەسـەر هێڵێکـی ڕاسـت بـڕوات، چـەندان حاڵـەتی

بەرزبوونەوە و نزمبوونـەوە ڕووی داوە. لەبـەر ئـەوەی هـۆی سـەرەکی هــەروەك خــۆی ماوەتــەوە و کاردانــەوەی پاشەکــشێش بــەردەوامیی هەبووە، ڕێڕەوی داڕمـانیش لـە زیادبوونـدا بـووە، تـاوەکو لـە سـەدەی نۆزدەیەم و نیوەی یەکەمی سەدەی بیستەمدا، گەیشتە نزمترین ئاست.

مەبەست لەم توێژینەوەیە، ڕوونکردنەوی هۆکارێك نییە لە کرداری مێژوویی داڕماندا، کە کاریگەریی خۆی نەبووە، یاخود لەوانەیـە داڕمـان ڕووی نەدابێت. هیچ کۆمەڵگایەك نییە پێشکەوتنێکی بەرچاوی بـەخۆوە بینیبێت لە ماوەی (١٤٠٠) ساڵدا، ناشێت چاوەڕوانی ئەوەش بکەین کـە جیهانی ئیسلامی لەم یاسـایەدا دەگەمـەن و دانقسە بێـت، بۆیـە کـاری بنەڕەتی لێرەدا ئەوەیە کـار بـۆ ئایـندە بکرێـت نـەك لەسـەر ڕابـوردوو، لەگەڵ ئـەوەی ئایـندە پەیوەندییـەکی پتـەوی بـە ڕابـوردووەوە هەیـە، ئەگەر بە وردی هەموو چـەمکەکانی لـێکترازان دیـاری نەکـەین و ڕوونـی نەکەینەوە چۆن دەیانکەینەوە، چۆنیەتی گـەورەبوونی قەوارەکـەی لـە میانەی یەکانگیرییەوە لە ماوەی چەندان ساڵدا ڕوونبکەینەوە، نـاتوانین پێشنیاری ستراتیژییەتێکی کاریگەر بـۆ پێـشکەوتنێکی خێـرای وڵاتـانی ئیسلامی لە ئایندەدا بکەین.

## یەکەم: هەندێ کاریگەریی یەکلاکەرەوە بۆ سەرکەوتن یان کەوتنی کۆمەڵگایەك

### پەیوەستبوون بە ڕێنماییەکانی قورئان و سوننەتەوە

ئەم ناونیشانە وامان لێدەکات بۆ هەندێ هۆکاری یەکلاکەرەوەی بەرپرس لە سەرکەوتن یاخود کەوتنی کۆمەڵگایەك لە کۆمەڵگاکان بگەڕێین، ئەوەی زانراوە لەم حاڵەتەدا، ئەوەیە ڕاستەوخۆ ڕوو بکرێتە قورئان و سوننەت و داوای ڕێنمایی بکرێت. لە قورئاندا گرنگترین هۆکار بۆ سەرکەوتنی هەر کۆمەڵگایەك یاخود کەوتنی، خودی مرۆڤ خۆیەتی. قورئان ئەمەی ڕوونکردوەتەوە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يُغَيِّرُ مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُوا مَا بِأَنْفُسِهِمْ﴾ الرعد / ١١ [1]، و خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ظَهَرَ الْفَسَادُ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِي النَّاسِ﴾ الروم / ٤١. ئەمە ئەوە دەگەیەنێت کە مرۆڤەکان خۆیان پاشەڕۆژی خۆیان دیاری دەکەن، خۆیشیان مەبەست نین لە پێشکەوتندا، بەڵکو هۆکارن بۆ گەیشتن بەو مەبەستە. هەروەها ڕوونیدەکاتەوە: ﴿وَأَنْ لَيْسَ لِلْإِنْسَانِ إِلَّا مَا سَعَى﴾ النجم / ٣٩. بۆیە دەتوانین ڕاڤەیەکی لۆژیکییانە بۆ ڕابوون و کەوتنیان بکەین، لە میانەی شیکاریی خواست و هەوڵ و

---

[1]) هەروەها بڕوانە: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا كَانَ اللَّهُ لِيُعَذِّبَهُمْ وَأَنْتَ فِيهِمْ وَمَا كَانَ اللَّهُ مُعَذِّبَهُمْ وَهُمْ يَسْتَغْفِرُونَ﴾ الانفال / ٣٣.

ڕەوشــت و تواناکانیانــەوە. تــوینبی (Toynbee) دەربــارەی هــەمان بــیروڕا دەڵێــت: "شارســتانییەتەکان بــە خۆکــوژی دەمــرن، نــەك بــە کوشتن". [1]

ژیان و هەڵسوکەوتی مرۆڤەکان لـە بۆشـاییدا نییـە، بـەڵکو هەنـدێ هۆکار هەن کاریگەرییان لەسەریان هەیە و هەڵسوکەوتەکانیان ئاراسـتە دەکەن، گرنگترینیان ئەو پاڵنەرەیە کە دەیانجولێنێت، بۆیە پێوسـتیان بــە پاڵنــەرێکی ڕاســت و دروســت هەیــە، پاڵنــەرێك بێــت کــە چــی لــە توانایاندابێت هەوڵی بۆ بـدەن، نـەك تـەنیا بـۆ باشـکردنی گوزەرانیـان، بەڵکو بۆ فراوانکردنێك لـە سـنووری گەشـەپێدانی کۆمەڵگاکـەی خۆیـان دەربچێت. بێگومان پاڵنەرەکەش ژمارەیەك هۆکار کاریگـەریی لەسـەری دەبێت، گرینگترینیان لەو ئاستەدا خـۆی دەبینێتـەوە کـە هەوڵـەکانیان چـەندە بـۆ چـاککردنی بـار و گوزەرانیانـە، پاشـان یـەکێك لـە مەرجـە بنەڕەتییەکانی گەشەپێدانێکی هەمیشەیی، بریتییە لـەوەی بـەروبوومی گەشەکردنەکە بە دادپــەروەری بەســەر هــەموو ئەنـدامانی کۆمەڵگاکـەدا دابەش بکرێت. بە بێ ڕەچاوکردنی ڕەنگ و ڕەگەز و تەمەن و پلەوپایـە و سامان و ئایین.

---

[1]. Toynbee, Arnold J. A study of History, abridgement by D. C Somervell, London: Oxford University Press, 1957, Volume 24, p. 120.

بەدەستهێنانی ئەم مەرجەش پەیوەستە بە گەشەپێدانەوە، لێرەوە ڕۆڵی تێڕوانینی کۆمەڵگا و پێکهاتەکەی و دامەزراوەکانی دێتە ئاراوە. گەر هاتوو تێڕوانینی کۆمەڵگا و پێکهاتەکەی و دامەزراوەکانی، دادپەروەری و یەکسانیی لە ئابووری و یاسای دەستەڵاتیشدا بۆ هەموو چینەکانی کۆمەڵگا دابین کرد، هەروەها توانی هەموو پێویستییە ماددی و ناماددییەکانی[1] بۆ دابین بکات، ئەو کاتە دەستەبەری کۆمەڵایەتی و گەشەیەکی هەمیشەیی بەدی دەهێنێت. ئەگەر ئەم دەستەکەوتانەی گەشەپێدانەکە بەدی هێنران و لە کێشمەکێش و جەنگ و زیادەڕۆیدا بە فیڕۆ نەدران، هەروەها بەکارهێنرا بۆ لایەنە ڕەوشتی و جەستەیی و فیکرییەکان و پتەوکردنی ژێرخانی زانستی و تەکنیکی، زیادکردنی پاشەکەوتەکانیان لە پێناو وەبەرهێنانەدا دوای دابینکردنی پێداویستییە سەرەکییەکان، هەروەها پێشخستنی دامەزراوە کۆمەڵایەتی و ئابووری و دادوەری، و سیاسییەکان، ئەو کات گەشەپێدانێکی گەورە و خۆشگوزەرانییەکی زیاتر بەدیدێت بۆ خەڵکی. ئەمەش دەبێتە هاندەرێکی بەهێز بۆ ئیشکردنی دڵسۆزانە و کاریگەرتر، دەبێتە پاڵنەرێك

---

[1]) پێویستییە نامادییەکان بریتین لە: خواردەمەنیی گونجاو، جلوبەرگ، فێرکردن، نیشتەجێ، چاودێریی کۆمەڵایەتی، هۆکاری پێویستییەکانی ژیان، گواستنەوە، پێویستییە نامادییەکانی تریش بریتین لە: دادپەروەری، ئازادی، ئاسایش، موڵکدارییەتی، شەرەف، یەکسانیی کۆمەڵایەتی، خێزان، ڕێککەوتنی کۆمەڵایەتی و ڕزگاربوون لە تاوان و دڵەڕاوکێ و نائارامی و نەبوونی پێوانە بۆ ڕەفتارەکان.

بۆ گەشەپێدانی زیاتر، بۆیە پێویستە دادپەروەری بنەمای سەرەکی بێت بۆ شیکردنەوەی هۆکارەکانی گەشەکردن و وەبەرهێنان.

لە کاتێکدا دەبینین ئیسلام جەخت لەسەر ڕۆڵی خودی مرۆڤەکان خۆیان دەکاتەوە لەپێناو بەدیهێنانی گەشەپێدانیان، لە هەمان کاتدا دووبارە جەخت لەسەر دادپەروەری دەکاتەوە.[(١)] ئەگەر دادپەروەری نەبوو، مەحاڵە گەشەپێدان ببێت.[(٢)] بەڵام ستەم ترسناکترین ژەهرە کە گەشەپێدان لەناو دەبات، چونکە کاریگەرییەکی نەرێنی دەکاتە سەر پاڵنەرە مرۆڤایەتییەکە، سەرەڕای کاریگەری لەسەر ژینگەی کۆمەڵایەتی

---

[1]. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنْزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ وَأَنْزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ مَنْ يَنْصُرُهُ وَرُسُلَهُ بِالْغَيْبِ إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ﴾ الحديد/٢٥. هەروەها دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا كُونُوا قَوَّامِينَ لِلَّهِ شُهَدَاءَ بِالْقِسْطِ وَلَا يَجْرِمَنَّكُمْ شَنَآنُ قَوْمٍ عَلَى أَلَّا تَعْدِلُوا اعْدِلُوا هُوَ أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى وَاتَّقُوا اللَّهَ إِنَّ اللَّهَ خَبِيرٌ بِمَا تَعْمَلُونَ﴾ المائدة / ٨. هەروەها دەفەرموێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُكُمْ أَنْ تُؤَدُّوا الْأَمَانَاتِ إِلَى أَهْلِهَا وَإِذَا حَكَمْتُمْ بَيْنَ النَّاسِ أَنْ تَحْكُمُوا بِالْعَدْلِ إِنَّ اللَّهَ نِعِمَّا يَعِظُكُمْ بِهِ إِنَّ اللَّهَ كَانَ سَمِيعًا بَصِيرًا﴾ النساء/٥٨. هەروەها دەفەرموێت: ﴿فَلِذَلِكَ فَادْعُ وَاسْتَقِمْ كَمَا أُمِرْتَ وَلَا تَتَّبِعْ أَهْوَاءَهُمْ وَقُلْ آمَنْتُ بِمَا أَنْزَلَ اللَّهُ مِنْ كِتَابٍ وَأُمِرْتُ لِأَعْدِلَ بَيْنَكُمُ اللَّهُ رَبُّنَا وَرَبُّكُمْ لَنَا أَعْمَالُنَا وَلَكُمْ أَعْمَالُكُمْ لَا حُجَّةَ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمُ اللَّهُ يَجْمَعُ بَيْنَنَا وَإِلَيْهِ الْمَصِيرُ﴾ الشورى/١٥. هەروەها دەفەرموێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ يَأْمُرُ بِالْعَدْلِ وَالْإِحْسَانِ وَإِيتَاءِ ذِي الْقُرْبَى وَيَنْهَى عَنِ الْفَحْشَاءِ وَالْمُنْكَرِ وَالْبَغْيِ يَعِظُكُمْ لَعَلَّكُمْ تَذَكَّرُونَ﴾ النحل / ٩. هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا لَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَاتِهِ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ﴾ الأنعام/ ١١٥.

هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَعَنَتِ الْوُجُوهُ لِلْحَيِّ الْقَيُّومِ وَقَدْ خَابَ مَنْ حَمَلَ ظُلْمًا﴾ طه/١١١.

ـ ئابووری و سیاسییەکە، لە میانـەی کردارێکـی گرێـدراو کـە زەحمەتـە ئەنجامە نەخوازراوەکەی بە شێوەیەکی ورد بزانرێت.

هەر وڵاتێك توانی لەگەڵ بوونی ستەمدا گەشەپێدان بەدی بهێنێت، ئەو گەشەپێدانە درێژە ناخایەنێت بـۆ ماوەیـەکی دوور و درێـژ، چـونکە ناڕەزایی و ناکۆکی و دابەشبوون زیاد دەکات و لە کۆتاییدا هـەر بـەرەو داڕمان دەچێت.

دادپــەروەری وا پێویـست دەکـات هەنـدێ بــەهای کۆمەڵایــەتی بــە ڕێککەوتن لەسەریان، بوونی هەبێت، هەروەها هەبوونی دامەزراوە یاخود ڕێنمـایی هەڵسوکەوت کـە هـەمووان لـە ویـژدانی خۆیانـەوە پابەنـد بـن پێوەیانــەوە. لــەو بەهایانــەش: پیرۆزیــی ژیــان، موڵکـداری، شــەرەف، ڕاستگۆیی، ئەمانەت، ڕاستی، ویژدان، حەز بۆ فێربوون، کاری ڕێکوپێك، یارمەتیدانی ئەوانەی پێویستیان بە یارمەتییـە، دڵسۆزی لـە فەرمانـدا. هەبوونی ئەم خەسڵەتانە لە مرۆڤدا وەفا و ڕاستگۆیی پتەوتر دەکات لـە گرێبەست و ئەرکە کۆمەڵایەتییەکان ـ ئابووری و سیاسی، بەم شـێوەیە هاوســەنگیی کۆمەڵایــەتی تونـدوتۆڵتر دەبێـت.[1] هـیچ کۆمەڵگایـەکیش

---

[1] ـ هەموو ئـەم سـیفەتانە ئێـستا بەشـێوەیەکی گشتی قبـوڵکراوە لەبـەر ئـەوەی پێویـستە بـۆ گەشەکردن، بۆ نموونە بڕوانە:

-Myrdal, Gunner. Asian Drama. New York: The Twentieth Century Fund, 1968, Volume 1, p. 57-69 .

ناتوانێت پێشبکەوێت و پاریزگاری لە پێشکەوتنەکەی بکات، ئەگەر ڕەوشتی تاکەکانی نزم و متمانەی کۆمەڵایەتییان لاواز بێت.[1]

ئەگەر پێشکەوتنی خوو و ڕەوشت تەواوکەری گەشەپێدانی ئابووری نەبوو، مەحاڵە ڕووبەری زانست و بنەمای تەکنۆلۆژیای کۆمەڵگا فراوان بکرێت، پاشەکەوت و وەبەرهێنان زیاد بکرێت، ڕەوڕەوەی گەشەپێدانیش خێرا بکرێت. پاشان دەبێتە هۆی نەمانی گەشەپێدان، بەو هۆیەشەوە بەفیڕۆچوونی هەوڵی کۆمەڵگا بۆ دابینکردنی دادپەروەری و خۆشگوزەرانی. ئەمەش گاریگەرییەکی نەرێنی دەکاتە سەر پەرۆشی بۆ کاری ڕێکوپێك و بەسوود، پاشان زیان بە پێشکەوتنەکەش دەگەیەنێت.

یەکێك لە گرنگترین هۆکارەکان کە پەیوەستە بە گەشەپێدانی خوو و ڕەوشت و جەستەیی و فیکری تاکەکان، پەروەردەیەکی دروستی منداڵانە. بۆیە ئیسلام ـ هەروەك ئایینە سەرەکییەکانی تر ـ جەخت

---

[1] ـ قورئان دووپاتیدەکاتەوە: (قَدْ أَفْلَحَ مَنْ تَزَكَّى) الأعلى/١٤، هەروەها بڕوانە هەردوو ئایەتی ٩ و١٠ لە سورەتی (الشمس). چونکە ڕاستی تاکەکان لە خواپەرستیدا سەرمایەی کۆمەڵایەتی پتەوتر دەکات، کە ئێستا گرنگییەکی زۆری پێدەدرێت بۆ گەشەکردن، بۆ نموونە بڕوانە:

- Dasgupta, partha, and Ismail Serageldin. Social Capital: A Multifaceted Perspective. Washington, D. C: The Worl Bank, 2000.

- Zaheer, A. , B. Mc Evily and V Perrone. " Does Trust Matter: Exploring The Effects Of Inter - Organizational and Impersonal Trsur on Performance. " Organization Science 1998, p. 141-159.

- Bowles, Samuel, and Herbert Gintis. " Social Capital and Community Governance. " The Economic Journal, November, 2002, F419-F436.

لەسەر گرنگیدانی تەواو بە خێزان دەکاتەوە. ئەگەر خێزان سەرنەکەوێت، ئەو کات زەحمەتە بتوانرێت ڕووبەڕووی شکستەکە بوەستڕێتەوە، خێزانەکانیش ناتوانن ئەرکەکانی خۆیان جێبەجێ بکەن، ئەگەر دایك و باوکەکان ـ بە پلەی یەکەم ـ ئەو سیفاتە ڕەوشتییە بەرزانەیان تێدا نەبێت کە بیگوازنەوە بۆ منداڵەکانیان، هەروەها ئەگەر لەناو خێزاندا ـ بە پلەی دووەم ـ ژینگەیەکی خۆشەویستی و سۆز و هەست بەلێپرسینەوە و ڕێز، لەناو یەکدا نەبێت. ژن و پیاو تەنیا پێویست نییە ڕێز لە یەکتر بگرن، بەڵکو پێوستە لە نێوانیاندا وەفا هەبێت بۆ ئەو ئەرکانەی کەوتووەتە سەرشانی هەردووکیان، گەر یەکێکیان خۆی زاڵ بکات بەسەر ئەوی تریاندا و خۆی لە ئەرکەکانی بدزێتەوە، دوور نییە ئەم حاڵەتە ببێتە هۆی دروستبوونی بارودۆخێکی نادروست و کێشمەکێش، گەر زوو چارەسەر نەکرێت، لەوانەیە لە کۆتاییدا ببێتە هۆی جیابوونەوە و تێکچوونی خێزانەکە، ئەوەش کاریگەرییەکی زیانبەخش لەسەر گەشەی ڕەوشتی و دەروونی و فیکریی منداڵەکان دروست دەکات.

منداڵان (کوڕان و کچان) سەرەڕای پەروەردەیەکی تەندروست، پێویستیان بە فێربوون هەیە، بۆ ئەوەی پسپۆڕیی پێویست فێر ببن، بتوانن زانست و مەعریفە و بنەمای تەکنۆلۆژیای کۆمەڵگاکە بەرەو پێشەوە ببەن. بۆ ئەمەش لەگەڵ بوونی قوتابخانە و کۆلێژ و زانکۆکاندا، پێویست دەکات هەموو پێداویستییەکیان بۆ دابین بکرێت، مامۆستای

بەتوانا و لێهاتوویان بۆ ئامادە بکرێت، لەگەڵ کارئاسنی بۆ ئەنجامدانی توێژینەوە. ئەگەر ئەم بابەتانە ئامادەنە کران، لە ئەنجامدا دەبێتە هۆی شکستی کۆمەڵگاکە. گەر هاتوو نەوەکانی داهاتوو ئاستیان لە ئاستی نەوەکانی پێشوو نزمتر بوو، بنەمایەکی مەعریفی و تەکنۆلۆژیایەکی پێشکەوتوویان لەبەردەستدا نەبوو، ئەو کاتە کۆمەڵگا خۆی فەرمان بەسەر خۆیدا دەدات کە بەرەو هەڵدێر بچێت، کەواتە چارە نییە بێجگە لەوەی فێربوونی باش و توێژینەوە و پێشکەوتنی ئەکنۆلۆژیا بە گرنگترین هۆکاری یەکلاکەرەوە بەرەو پێشکەوتن دابنرێت.

هەروەها لێرەدا بوونی ئازادیی بیروڕا دەربڕین و بەرهەمهێنانی پرۆژەکان، گرنگە. بە بێ ئەم بابەتانە، گیانی دەستپێشخەری و هەڵمەتبردن بۆ خەڵکی دەستەبەر ناکرێت کە هۆکارن بۆ داهێنان و فراوانکردنی سنووری ناسینی کۆمەڵگاکەیان و تەکنۆلۆژیاکەی. یەکێك لە ئەرکەکانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) ڕزگارکردنی مرۆڤایەتی بوو لە کۆت و بەند، کە پێوەی بەسترابوونەوە[1]، ئیتر کۆت و بەندەکە لە هەر شێوەیەکدا بێت، جەستەیی بێت یاخود فیکری، ڕێگر دەبێت لەبەردەم پێشکەوتندا، پێویستە خەڵکی مافی ئازادیی بیروڕا و

---

[1]. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿الَّذِينَ يَتَّبِعُونَ الرَّسُولَ النَّبِيَّ الْأُمِّيَّ الَّذِي يَجِدُونَهُ مَكْتُوبًا عِنْدَهُمْ فِي التَّوْرَاةِ وَالْإِنْجِيلِ يَأْمُرُهُمْ بِالْمَعْرُوفِ وَيَنْهَاهُمْ عَنِ الْمُنْكَرِ وَيُحِلُّ لَهُمُ الطَّيِّبَاتِ وَيُحَرِّمُ عَلَيْهِمُ الْخَبَائِثَ وَيَضَعُ عَنْهُمْ إِصْرَهُمْ وَالْأَغْلَالَ الَّتِي كَانَتْ عَلَيْهِمْ فَالَّذِينَ آمَنُوا بِهِ وَعَزَّرُوهُ وَنَصَرُوهُ وَاتَّبَعُوا النُّورَ الَّذِي أُنْزِلَ مَعَهُ أُولَئِكَ هُمُ الْمُفْلِحُونَ﴾ الاعراف /١٥٧.

کارکردنیــان هــەبێت، بــە مــەرجێك ســنووری بــەها ڕەوشــتییەکان نەبــەزێنێت. گــرنگ لێــرەدا دوورکەوتنەوەیــە بــەپێی توانــا لــە هــەموو ڕووبەڕووبوونەوە و نـاکۆکی و جـەنگێك، چـونکە هـەر بـە تـەنیا نابێتـە هۆکـاری نـەمانی ئاسـایش و دڵـەڕاوکێ، بـەڵکو دەبێتـە گـۆڕانی هـەموو چـالاکییەکان دوور لـە بنیاتنانــەوەی نەتــەوە و پاشـانیش شکسـت بـە مەبەستەکانی شەریعەتیش دەهێنێت.

هیچ کۆمەڵگایەك نییە تـەنیا لەسـەر بنـەمای مەعریفـەی تـەکنۆلۆژیا بــڕوای بــە پێــشکەوتنی تــەواو هــەبێت، بــەڵکو پێویــستە ســوود لــەو پێشکەوتنانەی لە شوێنەکانی تر ڕوویانداوە، وەربگرێت. بەڵام ئەمـەش بــەدی نایــەت ئەگــەر گرێوگــۆڵ و لووتبــەرزیی ســەرکەوتن لــە مێــشکدا هــەبێت، هــەروەها گیــانی لێبــووردن لــە ئاســت بۆچــوونە جیاوازەکانــدا نەبێت، هاندەر بۆ پرۆژە و داهێنانەکان نـەبێت، ئـیرادە نـەبێت بـۆ خـۆ ڕزگـار کـرد لـە خاڵـە لاوازەکـان، لـە ڕێگـەی شـیکردنەوەی هۆیـەکان و پــشتبەستن بــە ڕێگاچــارە ســەرەکییەکان، پێویــستە ئامــادەیی ئــەوە هەبێت بیروبۆچوونی بەسوود لـە ڕۆشـنبیری و شارسـتانیەتەکانی دیکـە وەربگیرێت. پێویستە لە هەر سەرچاوەیەکەوە بێت، مەعریفەی بەسوود و تەکنۆلۆژیا وەربگیرێت، بتوانرێت لەگەڵ بارودۆخ و مەبەست و ئامانجە باڵاکانی کۆمەڵگا بگونجێنرێت. بۆیـە پێغەمبـەر (درودی خـوای لەسـەر) موسڵمانان هان دەدات و دەفەرموێت: "اطلبـوا العلـم ولـو بالـصين فـإن

طلب العلم فريضة على كل مسلم"[1]، چونكه "الحكمة ضالة المؤمن فحيث وجدها فهو أحق بها"[2]، بەبێ بوونی ئەم بیروڕایە لە وەرگرتنی زانستدا، لەوانەیە کۆمەڵگا نەتوانێت ئەو هێزە پاڵنەرە کە پێویستی پێیەتی دروست بکات.

هەندێ جار لەوانەیە بەهایەك بۆ بەهاکان و دامەزراوەکان، لای کۆمەڵگایەك لە کۆمەڵگاکان نەبێت کە شایانی باسکردن بێت، گەر هاتوو بە شێوەیەکی کاریگەر و بێ جیاوازی و بەبێ ڕەچاوکردنی پلە و

---

1. فەرموودەیەکی لاوازە، ماناکەشی تەواوە: زانست لە هەموو شوێنێك وەردەگیرێت، گەشتکردنیش بۆ وەرگرتنی زانست گەشتێکی پیرۆزە. ئەلعەجلونی لە (كشف الخفاء)دا باسی دەکات. بڕوانە: العجلوني اسماعيل بن محمد، كشف الخفاء ومزيل الإلباس عما اشتهر من احاديث على ألسنة الناس، بيروت، دار احياء التراث العربي، ط٣، ١٣٥١ هـ، بەش ٢، ل٤٤، فەرموودەی ژمارە ١٦٦٥.

2. ترمذی، و ئیبن ماجە ڕیوایەتیان کردووە و فەرموودەیەکی لاوازە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا بە نموونە دەهێنرێتەوە، چونکە لەگەڵ گیانی ئیسلامەتیدا دەگونجێت. ماناکەشی ئەوەیە زانست تایبەت نییە بە کەسێکەوە، بەڵکو موڵکێکی هاوبەشی هەموو مرۆڤایەتییە، پێویستە موسڵمانان بە ئازادی بە نموونە بیهێننەوە، بە بێ گوێدانە ئەو شوێنەی نموونەکەی بۆ دەهێننەوە. بڕوانە:
- الترمذي، محمد بن عيسى السلمي. الجامع الصحيح "سنن الترمذي"، تحقيق: أحمد محمد شاكر وآخرون، بيروت: دار إحياء التراث العربي، (د. ت)، بەش ٥، ل٥٥، فەرموودەی ژمارە ٢٦٨٧.
- القزويني، محمد بن يزيد، سنن ابن ماجه، تحقيق: محمد فؤاد عبدالباقي، بيروت: دار الفكر، (د. ت)، (د. ط)، بەش ٢، ل١٣٩٥، فەرموودەی ژمارە ٤١٦٩.

سـامانەکانیان، بەسـەر هەمووانـدا جێبـەجێ کـرا. دوو هۆکـار هـەن یارمەتییەکی زۆری ئەم جێبەجێکردنە دەدەن:

- بـاوەڕبوونی تـەواوی خـەڵك بـە پاراسـتنی بـەهاکانیان و تێڕوانینیـان بـۆ پێکهاتـەکان، ئامادەییـان تێـدا بێـت و ئارەزوومەندانـە پەیوەست بن پێوەیەوە، ئەمەش - زۆرجار - وا ڕوودەدات ئەگەر هـاتوو بەهاکان و تێڕوانینیان بۆ پێکهاتـەکان سەرچـاوەیەکی خواوەنـدی بـن، ئەمە یامەتیدەر بێت بۆیان بۆ دۆزینـەوەی پاڵنـەرێکی نـاوخۆیی بـەپێی ئەو بەهایانە بژین، لەوانەیە ئەمەش پێویستی بە قوربـانی بەرژوەندییـە تایبەتییـەکان هـەبێت. مەحاڵیـشە ئـەم تێڕوانینـە بوونەوەرییانـە و سیـستمە بـەهاکان کـە دروسـتکراوی مرۆڤـە پـشتگیرییەکی تونـدی لـێ بکرێت.

- ڕۆڵـی کاریگـەری حکومـەت لـە جێبـەجێکردنی ئـەم بەهایانـەدا، بەسەر هەمووان‌دا بە بێ جیاوازی، بـە مـەرجێك کـەس لـە پابەنـد بـوون پێیەوە دەرباز نەبێت. عومەری کوڕی خەتاب درکی بە ڕۆڵـی حکومـەت کردبوو، بۆیە وتویەتی "ان الله يزع بالسلطان أكثر مـن القـرآن"[1]، واتـە خوای گەورە ئەوەی بە دەستەڵات جێبەجێی دەکات زیاترە لـەوەی بـە قورئان جێبەجێی دەکات.

---

[1]. الخطيب البغدادي، أحمد بن علي، تأريخ بغداد، بيروت، دار الكتب العلميـة، (د. ت)، (د. ط)، بەش ٤، ل١٠٧.

بۆیە قورئان بەهاکان دادەنێت، بەڵام بە زۆرەملێ خەڵك پابەند ناکات کاری پێ بکەن، بۆیە دەوڵەت ئەرکی بەرپرسیارێتیی ڕەوشتی و یاسایی هەڵدەگرێت بۆ جێبەجێکردنی بەها کۆمەڵایەتییەکان و دادپەروەری. سەرەڕای ئەمانەش پێویستە لەسەر حکومەت بناغەیەکی سەرەکی و ئەو دەزگا تایبەتانە دابین بکات کە خەڵکی پێویستیان پێیەتی بۆ جێبەجێکردنی کار و فەرمانەکانیان بەشێوەیکی زۆر کاریگەر، ئەو شتەیە کە ئەم ڕۆژانە داوای دەکرێت و دەوترێت "دەستەڵاتی کارامە"، یاخود "فەرمانڕەوایی لێهاتوو"، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) جەختی لەسەر کردووەتەوە و دەفەرموێت: "ما من عبد يسترعيه الله رعية فلم يحطها بنصحه إلا لم يجد رائحة الجنة".[1]

بۆیە "دەستەڵاتی کارامە" پێویستییەکی هەمیشەییە بۆ گەشەپێدانێکی بەردەوام، بەڵام "دەستەڵاتی گەندەڵ" شیاو و لێهاتوو نییە، لەوانەیە ئەو کارە باشانەش ئەنجام دراون، لەناو ببات و ببێتە ڕێگرێك لەبەردەم گەشەپێداندا.

گریمانەی بوونی دەستەڵاتی کارامە زیاتر دەبێت، ئەگەر کەسانی شەرافەتمەند و بە توانا پۆستە باڵاکان وەربگرن، لەگەڵ هەبوونی چاودێری بەسەریانەوە و بە یەکسانی تەماشاکردنیان، لەگەڵ ئەوەشدا

[1] . البخاري، محمد بن اسماعيل. صحيح البخاري، تحقيق: مصطفى ديب البغا، دار ابن كثير واليمامة، ط٣، ١٤٠٧ هـ / ١٩٨٧ م، بەش٦، ل٢٦١٣، فەرموودەی ژمارە ٦٧٣١.

لەوانەیە ئەمە لە هەندێ حاڵەتدا لە سایەی دەستەڵاتێکی دیکتاتۆریدا بگونجێت، بەڵام گریمانەی زیاتر – وەك بووەتە عادەت – لە سایەی دەسەڵاتی دیموکراتیدا و پەرلەمانی هەبێت کە نوێنەری گەلە، ئەرکی لێپرسینەوە لە گشت بەرپرسانی حکومەت دەگرێتە ئەستۆ، لەگەڵ سسیتمێکی دروستی دادوەری و ڕۆژنامەگەرییەکی ئازاددا. هەبوونی ئەم هەموو شتانە، وا لە کۆمەڵگا دەکات هەموو داهاتەکانی بە شێوەیەکی کاریگەر لە پێناو پێشکەوتنێکی هەمەلایەنە، بەکاربهێنێت. پێشکەوتنیش ـ لە ڕێی خۆیەوە ـ داهاتی پێویست بۆ حکومەت وەدەست دەهێنێت لە پێناو بەرگری لە وڵات، دژی مەترسییە دەرەکییەکان و بۆ جێبەجێکردنی یاسا و ڕێنماییەکان، دەستەبەرکردنی دادوەری و دابینکردنی بنەما سەرەکییەکانی کۆمەڵایەتی و ئابووریی پێویست بۆ دەستەبەرکردنی گەشەپێدانێکی بەردەوام.

## دووەم: پێویستی بە نموونەیەکی ڕوون و ئاشکرا بۆ گەشە پێدان و دارمان

لەوەی پێشەوە باسمان کرد، بۆمان ڕووندەبێتەوە کە ڕابوونی کۆمەڵگایەك یان دارمانی، بەستراوەتەوە بە مرۆڤەکانیەوە، چونکە ئەوانیش ـ لە لای خۆیانەوە ـ دەکەونە ژێر کاریگەریی چەند هۆکارێك کە بەستراونەتەوە بەیەکەوە و کاریگەرییان بۆ ماوەیەکی درێژخایەن لەسەر یەك هەیە و بە زەحمەت پێشبینی وردەکارییەکانی دەکرێت. دەتوانین ژمارەیەك هۆکاری دیکە بخەینە سەر ئەو کاریگەرییانەی پێشتر باسمان کرد، ئەگەر هاتوو لیستێکی گشتگیریش ئامادە بکرێت، بیردۆزێکی ـ چاوەڕوانکراو ـ ی لێ دەرناچێت کە ڕابوون یان دارمانی کۆمەڵگا بەرهەم بهێنێت. لێرەدا گرنگ و پێویستە ئەو کاریگەرییانە ڕوونبکرێنەوە کە هەستانەوە و میکانیزمی دەستپێکردن بۆ کاریگەرییەکانی تر، ئەنجام دەدەنەوە، کە بتوانێت لە ڕابوونی کۆمەڵگایەك بەشداری بکات، گەر ئەمە نەکرێت، تا ڕادەیەك دەچێتە خەوێکی قووڵەوە. لە لایەکی ترەوە، ئەو شتە چییە دارمان و چۆنیەتی گۆڕان لەم کاریگەرییەوە بۆ کاریگەرییەکانی دی، دروست دەکات، بە جۆرێك کە ببێتە هۆی دارمانی گشتیی کۆمەڵگایەك کە پێشتر ئاستێکی باڵای پێشکەوتنی بەخۆوە بینیوە؟ ئەمە ئەو شتەیە کە لەو بیردۆزە چاوەڕوان دەکرێت، ئەو بیردۆزەشی ئەم کارە بە ئەنجام دەگەیەنێت، یارمەتیدەرمان دەبێت لەو

ئەرکەی کە بەستراوەتەوە بە ڕاڤەکردنی ڕابوونی کۆمەڵگای ئیسلامی و دارمانی.

لەبەر ئەوەی زۆرێك لە زانایانی وەکو ئیبن خەلدون (٨٠٨هـ / ١٤٠٦ز) و گیبون (Gibbon) (1208هـ / ١٧٩٤ز) لە ڕابوردوودا، شپینگلەر (Spengler) و شوتیزەر (Schweitzer) و سۆرۆکی (Sorokin) و تۆینبی (Toynbee) و نۆرس (North) و تۆماس (Yhomas) و کنیدی (Kennedy).[1] ژمارەیەکی تریشیان لەم سەردەمەدا، گفتوگۆی بەرزبوونەوەی شارستانییەت و دارمانیان کرد، بێگومان بنیاتی نموونەیەکی نوێ، شیاو نابێت، ئەگەر ئەو نموونانەی کە دانراون، پەسەند نەبوون. ڕاستیش نییە ئەگەر بڵێین هیچ کام لەم بیروڕایانە، بیروڕایەکی بە بەهای تێدا نییە، هەمووی بەم جۆرەیە و بە شێوازی جیاواز ئەنجام دەدرێت. بەڵام ئێمە کام نموونەیان هەڵبژێرین؟

---

1. بڕوانە: - Spengler, Oswald. Decline Of the West. New york: Alfred A. Knopf 1947
-Schweitzer, Alfred. The Phisolophy Of Civilization. New York: Macmillan, 1949. -Sorokin, Pitirim. Social Philosophies of Age of Crisis. Boston: Beacon, 1951
- Toynbee, Arnold J. A Study Of History, abridgement by D. C. Somervell, London: Oxford University Press, 1957.
- North, Douglass C. And Robert Paul Thomas. The Rise of the Western World: A New Economic History. Cambridge: Cambridge University Press, 1973.
- Kennedy, Paul. The Rise and fall Of the Great Powers: Economic Change and Military Conflict from 1500-2000. New York: Random Hause, 1987.

نموونـەی ئـیبن خەلـدون بـۆ لایەنـەکانی کۆمەڵایـەتی - ئـابووری و سیاسی، کە لە کتێبی (المقدمة)یدا روونیکردوەتەوە، لە بەشی دووەمدا گفتوگۆ لەسەر ئەوە دەکەین. زۆرینـەی کاریگەرییـە گـەورەکان کـە لـە پێشەوە باسمان کـرد، لـەژێر ڕۆشـنایی قورئـان و سـوننەتدا بـە هەنـد وەرناگرێت، ئەو کاریگەرییە ڕووندەکاتەوە کـە بـووە هۆکـاری ڕابـوونی کۆمەڵگای ئیسلامی بە خێرایی لە سەرەتایەکی ئاسـایی و لەژینگەیـەکی کۆچەریی عەرەبیدا، هـەر ئـەو کاریگەرییـەش لـە دواییـدا بـووە هۆکـاری داڕمانی.[١]

(المقدمة) بەرگی یەکەمی کتێبی مێژووی ئیبن خەلدونە، کە لە حەوت بەرگ پێکهاتووە، بە کورتی بە (کتاب العبر) ئامـاژەی پـێ دەدرێـت.[٢] دوا بەرگیشی لەم حەوت بەرگـە، بریتییـە لـە ژیاننامـەی ئـیبن خەلـدون

---

[1]. ئێستا چەندین چاپی (المقدمه) بە زمانی عەرەبی هەیە، لەلایـەن فرانـز ڕوزنتـال ( Franz Rosenthal)ەوە وەرگێڕدراوە بۆ سەر زمانی ئینگلیزی لە سێ بەرگدا، چاپی یەکەمی ساڵی ١٩٥٨ ز، چاپی دووەمیشی ساڵی ١٩٦٧ز بڵاوکراوەتەوە.

-Ibn Khaldun. The Muqaddimah: an Introduction to History. Translated from Arabic by Franz Rosenthal, London: Routledge and Kegan Paul, 1st ed. , 1958, 2 nd ed. , 1967٠

هــەروەها چــارلز عیــسەوی (Issawi, Charles) هەڵبژاردەیــەکی لــە (المقدمــة) ســاڵی ١٩٥٠ ز بڵاوکردووەتەوە.

- Issawi, Charles. An Arab Phisolophy of History: Selections From the Prolegomena of Ibn Khaldun of Tunis (1332 -1406). London: John Murray, 1950.

[2]. ناوی تەواوەتی لە (المقدمة)دا (کتاب العبر)ە، دیوان المبتدأ والخبر، و في أيام العـرب والعجـم والبربر، ومن عاصرهم من ذوي السلطان الأكبر.

خۆی تیایدا تێڕوانینێکی وردبینانه بۆ بارودۆخی کۆمەڵایەتی ـ ئـابووری و سیاسی ئەو کاتـه دەخاتـه ڕوو، کـه بـووه هۆکارێـك بـۆ پێـشکەوتنی فەلسەفەکەی له مێژوودا.

ڕاسـت وتـراوه کـه دەڵـێن "پێویـستی دایکـی داهێنانـه"، ئەمـەش بەسەر فەلـسەفەکانی مێـژوودا، یـان ئـەو ڕاڤـه زیرەکانـەی بـۆ ڕووداوه مێژووییەکان دەکرێت، دەچەسپێت، کـه ـ بـه شـێوەیەکی گشتی ـ لـه کـاتی سـەرەتا و کۆتـایی سـەرهەڵدانی پێوسـتییەکانی میللەتانـدا سەرهەڵدەدەن.[1] بێگومان ئیبن خەلدونیش هەستی به هەمان پێوسـتی کـردووه، کـاتێ سـۆرۆکین (Sorokin) دوای ئـەویش تـوینبی (Toynbee) گەورەترین نووسینیان دەربـارەی فەلـسەفەکانی مێـژوو نووسـی.[2] لـه سـەردەمێکی زۆر سـەختدا دەژیـا کۆمـەڵگای ئیـسلامی دووچـاری کـه پـەرتبوون و گەنـدەڵی بووبـوو. خیلافـەتی عەباسـی لـه (٦٥٦ك / ١٢٥٨ز) کۆتایی هاتبوو، نزیکەی سێ چارەکه سـەدە پـێش لەدایکبوونی (واته ئیبن خەلدون)، دوای تاڵانکردنی بەغدا و سووتاندن و وێرانکردنـی ـ نزیکـەی بەغـدا و دەوروبـەری ـ بـه دەسـتی مەغۆڵـەکان، هەروەها چەند کارەساتێکی دی، لەوانه جەنگی خاچپەرسـتەکان (٤٨٨ ـ٦٩٠ك / ١٠٩٥ ـ ١٢٩١ز)، هێرشەکانی مەغۆل (٦٥٦ـ ٧٥٨ ك / ١٢٥٨ ـ

1. Sorokin, pritirim. Social Philosopies of an Age of Crisis. Boston: Beacon, 1951, p. 4
2. Ibid. , p. 5.

١٣٥٥ز)، تاعوون (٧٤٠ك / چلەكانی سەدەی چواردەیەم) کە زۆربەی هەرە زۆری وڵاتە ئیسلامییەکانی لاواز کردبوو. لەگەڵ ئەمانەشدا مەمالیکە چەرکەسییەکان (٧٨٤ ـ ٩٢٢ك / ١٣٨٢ ـ ١٥١٧ز) کە ئیبن خەلدون سێیەکی ژیانی لە سایەی دەستەڵاتی ئەواندا بەسەر برد، گەندەڵ و ناکارا بوون. جۆرە سیاسەتێکیان پەیڕەو دەکرد کە هۆکاربوو بۆ خێراکردنی داڕمان.

بەهۆی ئەم هەموو گۆڕانکارییە نەرێنییانەوە، بارودۆخی موسڵمانان ـ بە شێوەیەکی گشتی ـ زۆر خراپ بوو. بارودۆخی خێزانەکەی ئیبن خەلدونیش بەدەر نەبوو لە بارودۆخی موسڵمانانی دی، لە ڕووی خراپیی ژیان و گوزەرانەوە. بارودۆخەکە ناچاریان کرد لە ئیسپانیاوە کۆچ بۆ تونس بکات، کە پێش چەند ساڵێك بوو لە ترۆپکی (سەرلەنوێ فەتحی مەسیحیدا) (The Reconquista). بەم شێوەیە، ئیبن خەلدون لە ساڵی (٧٣٢ك /١٣٣٢ز) لە تونس لەدایك بوو، نەك لە ئیشبیلیە، کە خێزانەکەی ماوەی حەوت سەد ساڵ پێش ئەوەی کۆچ بکەن، نیشتەجێی ئەوێ بوون. هێشتا لە تەمەنی هەرزەییدا بوو، دایکی و باوکی و زۆرێك لە خزمان و دۆستان و مامۆستاکانی بە (تاعوون) ژیانیان لەدەست دا.[1] بەم شێوەیە دووچاری گێروگرفتی زۆر بوو، ڕۆژئاواش

---

[1]. ابن خلدون، عبدالرحمن. التعریف بابن خلدون ورحلته غربا وشرقا، تحقیق: محمد تاویت الطنجي، القاهرة، ١٣٧٠هـ /١٩٥١م، ل٣٧.

(باکووری ئەفەریقا تا ڕۆژئاوای میسر) لەگەڵیاندا تونس، لە ئەنجامی ئەو جەنگانەی لە نێوان بنەماڵەی فەرمانڕەواکاندا ڕووی دەدا، لە حاڵەتی هەڵچوونێکی سیاسیدا بوون، ئەم بارودۆخە تێکچوو و نائارامە، وای لە ئیبن خەلدون کرد لە شوێنێکەوە بڕوات بۆ شوێنێکی تر، لەناویاندا فاس (پایتەختی مەراکیش)، تلمسان (جەزائیر)، ئەندەلووس (ئیسپانیا)، بیجایە یان بوجی (جەزائیر).

لەم بارودۆخەدا شتێکی نامۆیە کەسێك خاوەنی بەها ڕەوشتی و فیکرییەکان بێت، بیر لە ستراتیژییەتێکی کارا نەکاتەوە، بە پێچەوانەی ڕەوڕەوەی ڕەوتی داڕمان.[1] ئیبن خەلدون بەو سیفەتەی زانایەکی کۆمەڵایەتیی خاوەن توانایەکی فیکریی لە ڕادەبەدەر بوو، بە تەواوەتی دەیزانی[2] کە کرداری پێچەوانەی ڕەوڕەوەی ڕەوتی داڕمان، بەدینایەت، بە بێ وەرگرتنی پەند و ئامۆژگاری لە مێژوو وەرنەگیرێت، و دیاریکردنی ئەو کاریگەرییانەی بوونە هۆی گەشکردنی شارستانییەتی ئیسلامی، کە لە سەرەتایەکی سادەوە لە لانکی کۆمەڵگایەکی کۆچەریی عەرەبییەوە دەستی پێ کرد، پاشانیش چۆن داڕمان ڕووی دا.

---

[1]. Talbi, M. " Ibn Khaldun. The Encyclopedia of Islam, Leiden: Brill, 1986, Volume 3, p. 808.

[2] Toynbee, Arnold J. A Study of History. London: Oxford University Press, 2 nd ed. 1935, vol. 3, p. 321-322.

ئـەو، ئاینـدەی وەك ڕابـوردوو دەبینـی، چـونکە ڕابـوردووش بـە تەواوەتی وەك ئاینده وایه، وەك ئاو بە ئاو دەچێت.[1] بۆیە دەتوانرێت پێشبینیی ئاینده بە شیکاریی ڕابوردوو بکرێت. پاشـان زانستی مێـژوو نابێت تەنیا خـۆی بـە تۆمـارکردنی ڕووداوەکانـەوە ببەسـتێتەوە. بۆیـە لـەبری ئەوانـە، دیـاردە جۆراوجۆرەکـانی شـیدەکردەوە و چـۆنیەتی سەرهەڵدان و هۆکارەکانی لە مێژووی ئیسلامیدا ڕووندەکردەوە، تاوەکو پێشبینیش بکات لە ئاییندەدا چی ڕوو دەدات.[2]

ئیبن خەلدون لە میانەی جێگۆڕکێکانیدا لەم شوێن بۆ ئەو شوێن، بـۆ فرسەتێك دەگەڕا بە نووسـین بیروبۆچـوونەکانی سـەبارەت بـە زانسـتی مێژوو دەرببڕێـت، ئـەم فرسـەتەی لـە مانـەوەی بـۆ مـاوەی چـوار سـاڵ (٧٧٦ ـ ٧٨ك / ١٣٧٤ ـ ١٣٧٨ز) لە قەڵای ئیبن سـەلەمە دەسـتکەوت، کە قەڵایەکی دوورەپەرێزە، ئێستا پێی دەوترێت جەزائیر. لەم شوێنەدا ڕەشنووسی یەکەمی (المقدمة)ی لەگەڵ چەند بەشێك لـە کتێبـی (کتـاب العبر)ی تەواو کرد، پاشان ڕۆیشت بەرەو تونس، ماوەی (٧٨٠ ـ ٧٨٤ك/ ١٣٧٨ ـ ١٣٨٢ز) مایـەوە، بـە مەبەسـتی پێداچـوونەوە بـە هەنـدێ سەرچاوەدا لە کتێبخانەکاندا، بۆ تەواوکردنی ئەم کارە مەزنە. دواتر لە

---

[1]. ابـن خلـدون، عبـدالرحمن. المقدمـة، تحقيـق: درويـش الجويـدي، بـيروت، الـدار العـصرية، ط٢، ١٤١٦ هـ/ ١٩٩٦م، ل١٧.

[2]. سەرچاوەی پێشوو ل ٩ـ١٣، و ل١٦ـ ٣٩، هەروەها بڕوانە:

- Mahdi, Muhsin z Ibn Khaldun's Philosphy of History. Chicago: University of Chicago Press, 1964, p. 31.

ساڵی ١٣٨٢ز بەرەو قاهیرە کۆچی کرد، بە هۆی ئـەو ناوبانگـەی لـەوێ دەریکردبوو، پێشوازییەکی گەرمی لێکرا و هەر لەوێ پاشمـاوەی ژیـانی پیـشەیی بەسـەر بـرد، تـا لـە سـاڵی (٨٠٨ك / ١٤٠٦ز) لـە تەمـەنی ٧٤ ساڵیدا کۆچی دوایی کرد.

دەتوانین ژمارەیەك گازاندە دەربارەی نموونەکـەی ئـیبن خەلـدون بوروژێنین. ئەو گازاندانەش بریتین لە:

أــ ئــەوە نموونەیــەکی کۆنــە، بۆچــی مرۆڤــ نموونەیــەکی کــۆن بەکاربهێنێت، ئەگەر هاتوو نموونەیـەکی نـوێی لەبەردەسـتدا بـوو؟ ئـەم گازاندەیە لەوانەیـە شـتێکی گونجـاو بێـت، ئەگـەر نموونەکـە نـەتوانێت یارمــەتیمان بـدات لـەو ئامانجـەمان کـە مەبەسـتی شـیکاریی ڕابـوونی کۆمەڵگا ئیسلامییەکان و دارمانی بێت. بەڵام لە ڕاستیدا ئـەم نموونەیـە بەکاردێت بۆ شیکردنەوەی هۆکار و ئەنجامەکـەی بـۆ، دۆزینـەوەی ئـەو بیروبۆچـوونانەی لــە پــشت ڕابــوون و ڕووخــانی نــەوە و دەســتەڵاتی فــەرمانڕەوا و ئاوەدانکردنــەوەوەن.[1] ئـەو ئەوەنـدە بـەهێزە، تـاوەکو وامــان لــێ بکــات، بتــوانین وەڵامــی ئــەو پرســیارانە بدەینــەوە کــە پەیوەندییان بە ڕابوونی جیهانی ئیـسلامییەوە هەیـە و بـەردەوامی ئـەو

---

[1]. بۆ زانینـی زیـاتر دەربـارەی گفتوگۆی ئـەم نموونەیـە بـە درێـژی، بڕوانـە بەشـی دووەم و هەروەها:

-Chapra, M. Umer The Future of Economics: An Islamic Perspective. Leicester, Uk: The Islamic Faundation, 2000, p. 145-172.

ڕابوونە بۆ چەند سەدەیەك، هۆی داڕمانی بە ڕێژەیـەك ڕۆحـی بزووتنـی نـەمێنێت و نەبێتـە وڵاتێکـی زلهێـز، هـەروەها نـەتوانێت وەڵامـی ئـەو پرسیارە سەرکەوتووانەی ڕووبەڕووبوونەوە بداتەوە. پاشان نموونەکەی لەسـەر بنـەڕەتی تێڕوانینـی جیهـانگیریی ئیـسلامییەوە، هـەموو ئـەو کاریگەرییانە بە هەند وەرناگرێت کە باسمان کرد و بەرپرسن لە ڕابوونی هەر کۆمەڵگایەك یان داڕمانی، بەڵکو ـ لە ڕێگـەی بـەکارهێنانی هۆکـارە بازنەییەکانـەوە ـ کاریگـەریی یـەکێك لـە هۆیـەکانی ڕابـوون و یـاخود داڕمانی ڕووندەکاتەوە، چۆن کاریگـەریی ئـەم هۆیـە دەگوازرێتـەوە بـۆ کاریگەرییەکانی دی. بەو پێیە، لەبری ئەوەی (المقدمة) باسێك بێـت لـە چوارچێوەیەکی عەلمانیدا، دەبێتـە شـوێنێکی ناوەنـدی بـۆ چاکسازیی مرۆیی و کۆمەڵگاکەیان و دامەزراوەکان، کە کاریگەریی لەسەریان هەیە، هـــەروەها پێـــداگری لەســـەر دادوەری و بیمـــەی کۆمەڵایـــەتی و باشـگوزەرانیی ئـابووری لـە پێـشکەوتنی کۆمەڵایـەتیی هەمیـشەیی بـۆ کۆمەڵگا دەکات، ئەو ڕۆڵەی کە بەها ڕەوشتییەکان و جێبـەجێکردنێکی کارا لە لایەن دەستەڵاتەوە، لەم پرۆسـەیەدا دەیگێـڕن. کـارێکی ئاسـان نییە نموونەیەکی دی ئـەم سـیفەتە یەکانگیرییـە گەورەیـەی کـە لەگـەڵ ڕۆحی ئیسلامیدا تێدایە، دەستبکەوێت.

ب ـ گازانـدەی دووەم، خـۆی لـە بـەکارهێنانی نموونەکـەی ئـیبن خەلدونـدا دەبینێتـەوە، کـە گوایـە ئاماژەیەکـە گرنگـی بـە بەرزبوونـەوە و دابەزینی بنەماڵـەی فـەرمانڕەواکان دەدات. ئـەم گازاندەیـە ڕاسـتە ئەگـەر

هاتوو ئامانجە سەرەکییەی ئیبن خەلدون لە نووسینی کتێبەکەیمان لەبیر کرد، چونکە ـ ئەو بەو سیفەتەی پابەندە و نیەتێکی باشی هەیە ـ پێداگری لەسەر مانەوەی دەستەڵاتی هیچ نەوەیەکی دەستەڵاتداری دیاریکراو نەکردووە، بەڵکو ئەو پێداگریی لەسەر مانەوەی شارستانییەتی ئیسلامی کردووە، لە میانەی پێچەوانەی ڕەڕەوەی پرۆسەی دارمان، کە تووشی هاتووە، زۆر گرنگیی نەدەدا بە بنەماڵەی فەرمانڕەوایەکی دیاریکراو، کە بەهۆی گەندەڵی و لاوازیی لایەنەکانی ناوخۆییەوە ڕووخاوە. مەسەلەی ڕووخانی کارێکی چاوەڕوانکراوە، بەڵام هەست بە نیگەرانی دەکات، گەر بنەماڵەی فەرمانڕەواکان بە بەردەوامی یەك لە دوای یەك بڕووخێن، چونکە کاریگەریی نەرێنی لەسەر خودی شارستانییەتی ئیسلامی دەبێت، بۆیە باش وایە سوود لە تێڕوانینە دووربینانەکانی وەربگیرێت و نموونەکەی بکرێتە بنەڕەتی شیکارییەکان.

ج ـ گازاندەی سێیەمیش لەسەر بەکارهێنانی نموونەکەی ئیبن خەلدون هەیە کە دەگەڕێتەوە بۆ (المقدمة) کە ـ وا دەردەکەوێت ـ بیردۆزێکی ژیاریی بۆ پێشکەوتن بەکارهێنابێت، کە "پیری نەخۆشییەکی درێژخایەنە" و ڕزینیش گەر هات، چارەسەری نییە[1] و بەردەوام دەبێت لە لاشەی مرۆڤدا. لەوانەیە بۆچوونێکی دروست ببێت کە ئیبن خەلدون گفتوگۆی بەرزبوونەوە و دابەزینی بنەماڵەی فەرمانڕەواکانی کردبێت، بەڵام بنەماڵەی فەرمانڕەواکان دێن و دەچن،

---

[1]. ابن خلدون، المقدمة، المصدر السابق، ل٢٦٨ و ٢٦٩.

بۆیــە پێویــستە شارســتانییەت لــە لەناوچــوون ڕزگــار بکرێــت. ئەمــەش هاوشـێوەیەکە لـەم سـەردەمەدا دەگوزەرێـت، لـە کاتێـکدا حکومـەتێك یاخود دوو حکومەتی گەندەڵ، لێهاتوو نین، لەوانەیە زیانێکی گەورە بە وڵاتێك نەگەیەنن، بەردەوامی و هاتنی یـەك لـە دوای یـەکی ئـەم جـۆرە حکومەتانە، ئایندەی ئەو وڵاتـە دەخەنـە مەترسـییەوە، ئـەو حوکمـەی ئیبن خەلدون دەیەوێت بۆ بنەماڵەی فەرمانڕەواکان، مەرج نییـە ــ وەك پێویست ـ بەسەر شارستانییەتدا جێبەجێ بکرێت، لێرەدا شارستانییەت کرۆکی گرنگیدانمانە و لەوانەیە بنەماڵەی فەرمانڕەواکان هەرەسبهێنن و هـــەرگیز پێـــشنەکەون، دانیلفـــسکی (Danilevski) و شـــبنگلەر (Spengler) هەر وای بۆ دەچن.[1]

**لە** شارستانییەتەکانیشدا لەوانەیە لە ماوەیەك زیاتر هەبووبێت بـۆ پێـشکەوتن و داڕمـان، لەوانەشـە ئـیبن خەلـدون کتێبـی (المقدمـة)ی نەنووسیبایە، ئەگەر گەشبین نەبووایە بە پێچەوانەی ڕێـڕەوی پرۆسـەی داڕمانی کۆمەڵگای ئیسلامی. یاسایەکی سروشتیش نییە، بڵێت پێوستە هەموو شارستانییەتێك هەڵبوەرێت و هیچ هیوایەکیش نەبێت بۆ ڕابوون، لە کاتێکدا لە سەردەمێکدا پێشکەوتوو بووە. ئەمەیە فەرمانی بـیردۆزی پێکهاتەی ئایینی کە لە پـشت نموونەکـەی ئـیبن خەلدونەوەیـە. ئەگـەر پێچەوانەی ڕێڕەوی پرۆسەی داڕمان ئاسایی نەبووایە، ئەو کاتە نـاردنی

---

[1] . Spengler, Oswald. Decline of the West. New York :Alfred A. Knopf, 1947. ; and Sorokin, Social Philosophies of an Age Crisis, p. 164.

پێغەمبەرانیش لە لایەن خواوە هیچ مانایەکی نەدەبوو. هەموویان هەوڵیان داوە چاکسازی لە گۆمەڵگاکانیاندا بکەن، لە میانەی چاکسازی مرۆڤەکان و دامەزراوەکانەوە، کە کاریگەریی لەسەریان هەبێت. ئەمە مانای وایە ئەگەر هاووڵاتیان چاکسازییان لە خودی خۆیان و دامەزراوەکانیاندا کرد، پێچەوانەی ڕێڕەوی دارمان بوونی هەیە. ئەگەر هاتوو نموونەکەی ئیبن خەلدونم بەکارهێنا، شیاو نییە بیروبۆچوونی زاناکانی دی کە دەربارەی ئەم بابەتەیان نووسیوە، بە هەند وەرنەگیرێت . ئەو بیروبۆچوونانەش پێویستن، چونکە شەشسەد ساڵ بەسەر نووسینی (مقدمة)کەی ئیبن خەلدوندا تێپەڕیوە، لەو کاتەوە گۆڕانکارییەکی زۆر لە هەموو بوارەکانی ژیاندا ڕووی داوە، بۆیە پێویستە لێرەدا گۆڕانکاری لە نموونەکەدا بکرێت (١)، بۆ بەدەنگەوەچوونی ئەو گۆڕانکارییانەی لە هەموو جیهاندا ڕووی داوە، لە نێوانیاندا وڵاتانی ئیسلامی، لە میانەی سوودوەرگرتن لە تێڕوانینی زاناکانی دی، ئەمەش دەبێتە یارمەتیدەرێك بۆ باشترکردنی شیکارییەکان.

---

[1]. هەندێ لەو گۆڕانکارییانەی لە بەشی یەکەمدا کراوە، دوای گفتوگۆی نموونەکەی ئیبن خەلدونە.

# بەشی یەکەم

## بیردۆزی ئیبن خەلدون
## لە گەشە پێدان و داڕماندا[١]

کورتەی تەواوی نموونەکەی ئیبن خەلدون تا ڕادەیەکی زۆر - ئەگەر بە شێوەیەکی تەواویش نەبێت - لەم ئامۆژگارییەدا هاتووە کە پێشکەشی پادشایەکی کردووە: "ئەی پادشا: دەسەڵات بە شەریعەت نەبێت دانامەزرێت، بەجێهێنانی فەرمانەکانی خوا لە پەرستنیدایە، کار و کردەوە ڕێپێدراو و قەدەغەکان لە سایەی فەرمانی ئەودا بێت[٢]، بە دەسەڵاتیش نەبێت شەریعەت دانامەزرێت، پیاوانیش نەبن دەسەڵاتیش دانامەزرێت، پارەش نەبێت پیاوانیش دەسەڵاتیان پێ دانامەزرێت، هیچ ڕێگەیەکیش

---

[1]. زۆرێك لەم بەشە لە کتێبی (ئایندەی زانستی ئابووری) کە وەرگێڕدراوە بۆ عەرەبی، وەرگێراوە:

- The future of Economics: An Islamic Perspective.

[2]. زاراوەی شەریعەت ئاماژەیە بۆ بیروباوەڕ و دامەزراوەکان و ڕێساکانی هەڵسوکەوتکردن لە هەر کۆمەڵگایەکدا، بەڵام ئێستا بووەتە ئەو شتانەی ئیسلام بڕیاری لەسەر داوە.

نییە بۆ بەدەستهێنانی پارە، ئاوەدانکردنەوە نەبێت، هیچ ڕێگەیەکیش نییە بۆ ئاوەدانکردنەوە ئەگەر دادپەروەری نەبێت، دادپەروەرییش ترازوویەکە خوا داینـاوە لەنێوان بوونەوەرەکانیدا، سەرپەرشتیارێکیش بەسەریانەوەیە کە ئەویش پادشایە".[1]

تێکڕای (المقدمە) درێژەپێدەری ئەم ئامۆژگارییەیە، کە وەك ئیبن خەلدون دەڵێت، پێکهاتووە لە: "هەشت وشەی دانایی سیاسی بەیەکەوە بەستراوە، داهێنانەکەی لە سەرەتاکەیدایە و بە بازنەیەکەوە بەستراوەتەوە هیچ لایەکی دیار نییە".[2]

هێزی ئەم نموونەیەش لە زۆریی لقەکانی مەعریفە و سروشتە کاریگەرەکەیەتی تیایدا، چونکە ژمارەیەك لقی مەعریفەیە و گشت گۆڕانکارییە کۆمەڵایەتی - ئابووری و سیاسییە گرنگەکانی تێدایە، لەناویشیاندا دەستەڵاتی پاشا، یاخود دەستەڵاتی سیاسی (حکومەت)

---

[1] . ابن خلدون، المقدمە، سەرچاوەی پێشوو، ل٤٣، هەمان ئامۆژگاری لە لاپەڕە ٢٠٦دا دووبارە دەبێتەوە، و: ئیبن خەلدون خۆی دەڵێت: کتێبەکەی ڕاڤەی ئەو ئامۆژگارییەیە (المقدمە) ل ٤٠٣، کە موبیزان - پیاوێکی ئایینی زەردەشتییە - پێشکەشی بەهرام کوڕی بەهرامی کرد و مەسعودی لە کتێبەکەیدا تۆماری کردووە:

ـــ المسعودی، أبو الحسن علي. مروج الذهب ومعادن الجوهر، تحقیق: محمد محي الدین عبدالحمید، بیروت، المكتبة العصرية، ١٩٨٨ م، بەرگ١، ل٢٥٣. ئیبن خەلدون دان بەم ڕاستییەشدا دەنێت، بەڵام لە هەمان کاتدا ڕوونی دەکاتەوە و دەڵێت: ئێمە پشت بە خوای گەورە هەست بەم بیروباوەڕانە دەکەین، بێ فێرکردنی ئەرستۆ و بێ سوودوەرگرتن لە موبزان. بڕوانە: ابن خلدون، المقدمە، سەرچاوەی پێشوو، ل٤٤.

[2] . ابن خلدون، المقدمە، سەرچاوەی پێشوو.

(ح)، باوەڕە ئاینییەکان و کردەوە و ڕێنماییە ئایینییـەکان (شـەریعەت) (ش)،و مرۆڤـ (م)، و سـامان و گەنجینـەی داهـات (س)، و گەشـەپێدان (گ)، دادپـەروەری (د)، بـە ڕێگەیـەکی بازنـەیی بەیەکـەوە بەسـتراون، هەریـەکێکیان کاریگـەریی بەسـەر ئـەوی تریانـەوە و کـاری تـێ دەکـات هەیە.[1]




---

[1]. بۆ زیاتر شارەزابوون لە وێنەی نموونەکەی ئیبن خەلدون، بڕوانە:

- Chapra, The Future of Economic, p. 145-172.
- Spengler, Joseph. "Economic Thought in Islam: Ibn Khaldun. " Comparative Studies in Society and History. April, 1964, p. 268-306. ; Boulakia, Jean David C. " Ibn Khaldun: A Fourteen Century Economist. " Journal of Political Economy, September / October, 1971, p. 1105-1118 ; and Mirakhor, Abbas. " The Muslim Scholars and the History of Economics: A need for Consideration. " The American Journal of Islamic Social Sciences, December, 1987, p. 245 - 276.

لەبەرئەوەی ئەم بازنەیە لە میانەی کارلێککردنێکی زنجیرەیی لـە نێـوان ماوەیەکی درێژدا ڕوو دەدات کـە تـا سـێ نـەوە درێژدەبێتـەوە، یـاخود (١٢٠) سـاڵ، بۆیــە هۆکـاری بازنــەیی تێـدا دانـراوە، سـەرەڕای ئـەو کاریگەرییـەی لـە شـیکارییەکەدا بـە تـەواوی دەردەکـەوێت. ئەمـەش یارمەتیـدەر دەبێـت بـۆ چـۆنیەتی ڕاڤـەکردنی کاریگـەریی سیاسـی و ڕەوشـتی و دامـەزراوەیی و کۆمەڵایـەتی و ئـابووری و دیمـوگرافی و مێژوویی، هەروەها ئاوێتـەبوون لەگـەڵ یەکدیـدا بـە درێـژایی ماوەیـەکی دوورودرێژ، تـاوەکو دەگاتـە گەشـەپێدان و داڕمـان، یـان سـەرکەوتن و نزمبوونەوەی دەوڵەتێك، یاخود شارستانییەتێك.

لە شیکارییەکی ماوە درێژی وەك ئەمەدا، مەرجێك نییـە یەکسان بێت بە شتەکان، لەبەر ئەوەی هیچ کات مەرج نییـە ئـەو گۆڕانکارییانـە نەگۆڕ بن، چونکە یەکێك لەو گۆڕانکارییانە وەك میکانیزم کار دەکات.(١)

ئەگەر ئاوێتەبوونی کەرتەکانی کۆمەڵگایەکی تر بەرەو خۆی بوو وەك میکانیزم، ئەوا چڕیی لاوازبوونی لـە میانـەی ئـەو ئاوێتەبوونـەوە زۆرتـر

---

[1]. ئەو دوو وشەیەی لە لایەن ئیبن خەلـدون ەوە بـەکار هـاتووە (مـؤذن) و(مفـضب) بـە واتـای "بانگخواز" یان "بەجێهێنەر"ی شتێك، بەڵام من دەستەواژەی ئامێری دەسپێکردن ( trigger mechanism) م بەکارهێناوە، ئێستاش ـ بـە شـێوەیەکی گـشتی ـ بـە زمـانی ئینگلیـزی بـۆ ئەوەی ئاماژە بیت بۆ هەمان مانا بڕوانە:

ـ ابن خلدون، المقدمە، سەرچاوەی پێشوو، ل٤٣.

دەبێت، بەشێوەیەك ـ لەگەڵ تێپەڕینی كاتدا ـ جیاكردنەوەی ئەنجام و هۆیەكان بە زەحمەت دەكرێت. بەڵام ئەگەر كەرتەكانی دی ئاوێتە نەبوون بە هەمان ڕێڕەو، ئەو كاتە لاوازبوون لەناو ئەو كەرتەدا بۆ كەرتەكانی تر بڵاونابێتەوە، یاخود دەتوانرێت ئەو كەرتەی وردە وردە بەرەو لاوازبوون دەڕوات، چاكسازیی تێدا بكرێت، ئەو كاتە لەوانەیە دارمانی شارستانییەت زۆر لاواز ببێت.

## یەكەم: ڕۆڵی مرۆڤ (م)

مرۆڤ لای ئیبن خەلدون ناوەندی شیكارییە[1]، چونكە سەركەوتن یان ڕووخانی هەر شارستانییەتێك، پشتئەستوورە بە خۆشگوزەرانیی خەڵكی و هەژارییانەوە، ئەمەش خۆی لە خۆیدا تەنیا پشت بە گۆڕانكارییە ئابوورییەكان نابەستێت، بەڵكو بەو ڕۆڵەی بەستراوەتەوە بە كاریگەرییە ڕەوشتی و دامەزراوەیی و دەروونی و كۆمەڵایەتی و دیمۆگرافییەكان، لە میانەی هۆكارە بازنەییەكانەوە كە بۆ ماوەیەكی زۆری مێژوویی درێژدەبێتەوە [2]. ئەم دووپاتكردنەوەیە لەسەر گرنگیدان بە مرۆڤ، لەگەڵ ئایەتەكانی قورئانی پیرۆزدا یەكدەگرێتەوە كە لە پێشەكییەكەدا ئاماژەمان پێ دا و دەفەرموێت: ﴿إِنَّ اللَّهَ لَا يُغَيِّرُ

---

[1]. Ibn Khaldun. The Muqaddimah: an Introduction to History. Translate from Arabic by Franz Rosenthal, London: Routledge and Kegan Paul, 1st ed. , 1958, 2nd ed. , 1967, p. 19.

[2]. ابن خلدون، المقدمە، سەرچاوەی پێشوو، ل٤٣ و ل٢٦٢.

مَا بِقَوْمٍ حَتَّى يُغَيِّرُوا مَـا بِأَنْفُـسِهِمْ﴾ الرعـد / ١١، هـەروەها دەفـەرموێت: ﴿ظَهَرَ الْفَسَادُ فِي الْبَرِّ وَالْبَحْرِ بِمَا كَسَبَتْ أَيْدِي النَّـاسِ﴾الـروم / ٤١. ئـەم دوو ئایەتـە - لـە پـاڵ چـەند ئایـەتێکی تـردا - جـەخت لەسـەر ڕۆڵـی مرۆڤەکان خۆیان لە بەرزبوونـەوە و کەوتنیانـدا دەکەنـەوە. لەبـەر ئـەم هۆیەیە هەموو پێغەمبەران (درودی خوای لەسـەر) کـە خـوا نـاردوونی - وەك ئیبراهیم و موسا و عیسا و محەمەد - بۆ ئەم دونیایە، بۆ چاکسازیی مرۆڤەکان و ئەو دامەزراوانە بووە کە کار دەکەنە سەر ڕەفتاریان.[1]

---

[1]. لە قورئاندا هاتووە کە خوا زنجیرەیەك پێغەمبـەری بـۆ هـەموو گـەلان لـە کاتـە جیاوازەکانـدا ناردووە، بۆ نموونە سەیری: ﴿وَيَقُولُ الَّذِينَ كَفَرُوا لَوْلَا أُنْزِلَ عَلَيْهِ آيَةٌ مِنْ رَبِّهِ إِنَّمَا أَنْتَ مُنْـذِرٌ وَلِكُـلِّ قَوْمٍ هَادٍ﴾ الرعد (٧)، ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَسُولًا أَنِ اعْبُدُوا اللَّهَ وَاجْتَنِبُوا الطَّاغُوتَ فَمِنْهُمْ مَـنْ هَدَى اللَّهُ وَمِنْهُمْ مَنْ حَقَّتْ عَلَيْهِ الضَّلَالَةُ فَسِيرُوا فِي الْأَرْضِ فَـانْظُرُوا كَيْـفَ كَـانَ عَاقِبَـةُ الْمُكَـذِّبِينَ﴾ النحل (٣٦)، ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِنْ قَبْلِكَ مِنْهُمْ مَنْ قَصَصْنَا عَلَيْكَ وَمِنْهُمْ مَـنْ لَـمْ نَقْـصُصْ عَلَيْـكَ وَمَا كَانَ لِرَسُولٍ أَنْ يَأْتِيَ بِآيَةٍ إِلَّا بِإِذْنِ اللَّهِ فَإِذَا جَاءَ أَمْرُ اللَّهِ قُضِيَ بِالْحَقِّ وَخَسِرَ هُنَالِـكَ الْمُبْطِلُـونَ غافر﴾ (٧٨). بەم شێوەیە ئیسلام باس لە بوونی بەردەوامی و هاوشێوەیی لە سستمی بـەهاکان بۆ هەموو شەریعەتە ئاسمانییەکان دەکات، بە شێوەیەك لەناو نەبرێن، یاخود لەگـەڵ ڕابـووردنی کاتدا نەشێوێنرێن.

## دووەم: گەشە پێدان ( گ ) و داد پەروەری ( د )

ئەگەر مرۆڤەکان خۆیان ناوەندی شیکاری بن، ئەو کاتە گەشـەپێدان و دادپەروەری دەبنە دوو گەیەنەری زۆر گرنگ لە زنجیرە هۆکارەکاندا. گەشــەپێدان هۆکـارێکی بنەڕەتییــە، لەبەرئــەوەی ئەگــەر هەســت بــە باشـبوون نـەکرێت لـە خۆشـگوزەرانیی خەڵکـدا، هەسـت بـە هانـدەرێك ناکـەن پاڵیـان پێـوە بنێـت زیـاتر هـەوڵ بـدەن[١]، چـونکە لـە نـەبوونی گەشەپێداندا، هێنانی زانـا و پیـشەیی و کرێکـار و سـەرمایەدارەکان لـە کۆمەڵگایەکی ترەوە (ڕوودانی گۆڕانکارییەکی جۆرییە لە گەشەپێداندا)، کارێکی ئاسان نییە.[٢] هەروەها ئەمەش لەوانەیـە وا بکـات گەشـەپێدان کارێکی سەخت بێت و لە کۆتاییدا بەرەو داڕمان بچێت.[٣]

گەشــەپێدان لــە نموونەکــەی ئــیبن خەلدونــدا تــەنیا ئامــاژە بــە گەشەسەندنی ئابووری نادات[٤]، چـونکە گەشـەپێدانی مرۆیـی گـشتگیر دەگرێتەوە، کە هەموو گۆڕاوی گۆڕانکارییەکانی تریش دەگرێتـەوە (ح، ش، م، س، د، گ)، ئەمیش لە لای خۆیەوە گۆڕاوی یەکـەم دەوڵەمەنـد دەکات، دەبێتە خۆشگوزەرانیی ڕاستەقینە، یان شادیی ڕاسـتەقینە بـۆ خەڵکی، بە تەنیا دەستەبەری مانـەوەی شارسـتانییەت ناکـات، بـەڵکو

---

1. ابن خلدون، المقدمه، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٦٢.
2. سەرچاوەی پێشوو، ل٣٣٦ ـ ٣٣٧.
3. سەرچاوەی پێشوو، ل٣٣٣.
4. سەرچاوەی پێشوو، ل٣٢١ ــ ٣٢٣.

دەستەبەری پێشکەوتنیشی دەکات. گەشەپێدانی ئابووری، تەنیا لە میانەی هێزی ئابوورییەوە و دوور لە هێزە نائابووری و هێزە رۆحییەکانەوە وەدەست نایەت، بەڵکو پێویستی بە پاڵپشتیی ڕەوشتی و دەروونی و کۆمەڵایەتی و سیاسی و دیمۆگرافی هەیە، ئەگەر ئەم پاڵپشتە نەبێت، گەشەپێدانی ئابووری لەوانەیە وەدەست نەیەت، ئەگەر وەدەستیش هات، ئەوا بەردەوامیی نابێت.

گەشەپێدان بەبێ دادوەری، مەحاڵە. ئیبن خەلدونیش بە مانایەکی ئابووریی کورتبین ناڕوانێتە دادوەری وەك گەشەپێدان، بەڵکو لە هەموو لایەنەکانی ژیانی مرۆڤایەتییەوە بە مانایەکی گشتگیرتر لە دادوەری دەیبینێت. ئەمەش لە وتەیەکیدا ڕووندەکاتەوە و دەڵێت: "ستەم وا ئەژمار مەکەن کە تەنیا بردنی یاخود زەوتکردنی پارە و موڵکە لە خاوەنەکەی بە بێ بەرانبەر و بە بێ هۆ وەك ئاشکرایە، بەڵکو ستەم لەوە گشتگیرترە. هەر کەسێك موڵکی یەکێکی برد، یان زەوتی کرد لە کارەکەی، یان بە بێ ئەوەی مافی ئەو بێت داوای لێ بکات، یاخود مافێکی بەسەردا بچەسپێنێت شەریعەت ڕێگەی پێ نەدابێت، ئەوە ستەمی لێکردووە. ئەوانەی باجی پارە بە ناحەق وەردەگرن، ستەمکارن، دەستدرێژیکارانیش بۆ سەری، ستەمکارن، تالانچییەکانیش ستەمکارن، ئەوانەش ڕێگری دەکەن لە مافەکانی خەڵکی،

ستەمکارن".[1] سەختترین و گەورەترین ستەمیش لە تێکدانی ئاوەدانکردنەوەدا کاری زیادە و نەشیاوە بەو کەسانەی لەبەردەستدان بە ناحەق.[2]

ئیبن خەلدون وایدەبینیٚ کە دادوەری گرنگییەکی گەورەی لە ئاوەدانکردنەوەدا هەیە، هەتاوەکو ناونیشانی لقێکی تەواوی بەم شێوەیەیە: "ستەم، بانگەوازێکە بۆ تێکدانی ئاوەدانکردنەوە".[3] ئەمەش نزیکیی دادوەریی دەگەیەنێت لە گەشەپێدان، لەو وێنەیەی ئاماژەمان پێدا "بەپێی دەستدرێژییەکە و ڕێژەکەی، کشانەوەی خەڵکییە لە هەوڵدان بۆ بەدەستهێنان، ئەگەر هاتوو دەستدرێژییەکە زۆر و گشتگیر بوو لە هەموو دەرگاکانی ژیانی دەدا، هەروەها وەستهێنانیش هەمان حاڵەتی دەبێت".[4] ئەمەش کاریگەریی نەرێنی لەسەر چالاکیی خەڵکی و تواناکانیان لە داهێناندا و هەستانیان بە پرۆژە جێبەجێکردن و هاندانیان و چەند سیفاتێکی دی دەبێت، لە کۆتاییدا دەبێتە پەرتپەرتبوونی کۆمەڵگا و داڕووخانی.

بۆیە دادوەری بەم مانا گەورەیەوە دەبێتە هۆی دروستبوون و نەماکردنی "تیرەگەری یان تایفەگەری" کە وەرگێڕراوە بۆ "هاوکاریی

---

1. سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٢١ ــ ٣٢٣.
2. سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٦١.
3. سەرچاوەی پێشوو، ل٢٦٢ ــ ٢٦٥.
4. سەرچاوەی پێشوو، ل٢٦٢.

کۆمەڵایەتی" یان "هەستی کۆمەڵایەتی" یان "یەکرێزیی کۆمەڵایـەتی"، بۆیە دادپەروەری دەستەبەری کۆمەڵایەتییـە لـە میانـەی دەسـتەبەری دڵسۆزی و پابەندبوون بە ئەرکەکانەوە، هەروەها هاوبەشییەکی یەکسان لە بەرهەمی گەشەپێدان، پاشانیش خۆشگوزەرانی بۆ هەمووان. ئەمەش یارمەتیی دۆزینەوەی متمانە و یارمەتی بەرانبەر یـەکتر دەدات. بـە بـێ ئـەم دوو شـتە، کـار و پـسپۆڕی دابـەش ناکرێـت، کـە پێویـستن بـۆ گەشەپێدانێکی خێرا بۆ هەر ئابوورییەك.[1] نەبوونی دادپەروەری دەبێتە هۆی چاندنی ڕق و کینە لەناو خەڵکیدا و ساردیان دەکاتەوە و شیرازەی هاوکارییان دەپچڕێنێت، نەك هەر لـە کارەکانیـان سـاردیان دەکاتـەوە، بەڵکو کاریگـەریی لەسـەر چـالاکی و هەڵمـەتیان بـۆ بنیاتنـانی پـرۆژەی دیکە و ئەو سیفاتە باشانەی تریش دەبێت کە پێویستن بۆ گەشەپێدان، لە کۆتاییدا دەبێتە هۆی پەرتبوونی کۆمەڵگا و داڕمانی.

ئـەو ڕۆڵـە یەکلاییکەرەوەیـەی متمانـە لـە گەشـەپێداندا دەیبینێـت، ئێستا بووەتە بابەتی بەڵگەنەویست لای زانایانی ئابووری[2]، بەشێکیشە لـە "پەنـدێکی بـاو" یـاخود "جێگیربـوو". ئـیبن خەلـدون وشـەی

---

[1]. سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٦ ـ٤٨.

19) Arrow, Kenneth J. " Social Responsbility ans Economic Effeciency. " Public Policy, Volume 21, 1973, p. 303 -17 ; Etzioni, 1988 ; Fukuyama, Francis. Trust, Social Virtues and the Creation of Prosperity. New York: Free Press, 1995, and Hollingsworth, J. Rogers, and Robert Boyer. Contemporary Capitalism: The Embeddedness if Institutions. Cambridge: Cambridge University Press, 1998.

"تیرەگەری یان تایفەگەری" بەو مانایەی ـ تا ڕادەیەکی زۆر لە ئێستادا ـ ئامـاژەی پێـدەدرێت، بـەکارهێناوە بـە دەسـتەواژەی "سـەرمایەی کۆمەڵایەتی" یان "بنیاتی کۆمەڵایەتی و سیاسی" [1]. بەڵام هەنـدێ لـە زانایان ناڕازیبوون لە بەکارهێنانی وشەی "سەرمایە" بـۆ هێمـاکردن بـۆ تەنیا شتێك و ناکرێتە موڵـك، وەك سـەرمایەداریی مـادیی تاکەکـەس.[2] بۆیـە بـەکارهێنانی وشـەی "تیرەگـەری یـان تائیفەگـەری" یـاخود "هاوکاریی کۆمەڵایەتی" وەك دەردەکەیت، جوانترین جێگرەوەیە.

---

1. See Dasgupta, and Serageldin. Social Capital: A Multifaceted Perspective

2. بۆ نموونە بڕوانە:

-Arrow, Kenneth J. " Observations on Social Capital. " In Partha Dasgupta ans Ismail Serageldin (eds. ), Social Capital: A Multifaceted Perspective. Washington, D. C. : The World Bank, 2000, p. 3-5. -Bowles and Gintis, " Social Capital and Community Goverance".

## سێهەم: ڕۆڵی شەریعەت (ش) و حکومەت (ح)

دادوەری، پێویستی بە هەندێ یاسای ڕەفتار هەیە، کە پێیان دەوترێت "دامەزراوەکان" لە ئابووریی دامەزراوەییدا و "بەها ڕەوشتییەکان" لە تێڕوانینی پێکهاتە ئاینییەکاندا. ئەمانە جۆرە پێوانەیەکن بۆ کارلێکردنی خەڵکی پشتیان پێ دەبەسترێت، بەوەش لە ئەرکەکانیان بەرانبەر یەکتری دڵسۆز دەبن.(1) ئەم یاسایانەش لە هەموو کۆمەڵگایەکدا هەن و پشت بە تێڕوانینی پێکهاتەییەکانیان دەبەستن، کە بریتین لە یەکەم بناغە بۆ ئەم یاسایانە لە کۆمەڵگای ئیسلامی و شەریعەتدا، واتە "پابەندبوون بەوەی خوای گەورە لە کتێبەکەیدا ناردوویەتیە خوارەوە، لە فەرمان و قەدەغەکراو و حەڵاڵ و حەرامەکانی".(2) هەروەها ئیبن خەلدون وا لێی دەڕوانێت کە "بریتییە لە چاکە و بە تەنگەوەهاتنی بەرژەوەندییەکان".(3) سەرچاوەی خواوەندییان بەستراوە بە هێزێکەوە یارمەتییان دەدات ئامادەیی و پابەندبوونیان تێدا بێت، کار دەکات بۆ چەسپاندنێکی بەهێز لەگەڵ یەکتریدا، بۆ دروستکرنی کۆمەڵەیەکی گەورە.(4) ئەمە دەبێتە هۆکارێك بۆ ڕێگەگرتن لە ڕەفتاری کۆمەڵایەتیی زیانبەخش، دابینکردنی

---

1. ابن خلدون، المقدمە، سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٦ ـ ١٤٧.
2. سەرچاوەی پێشوو، ل٢٧٩.
3. سەرچاوەی پێشوو، ل١٣٤
4. سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٠ ـ١٤١.

دادپەوەری، هاوکاری و باوەڕبوون بە یەکتری لە نێوان خەڵکیدا پتەوتر دەکات، هەر ئەمەشە کە گەشەپێدان پێش دەخات.

شەریعەت، ناتوانێت ڕۆڵی شیاوی خۆی ببینێت، تاوەکو بە تەواوەتی و یەکسانی و بێلایەنانە جێبەجێ نەکرێت.[1] شەریعەت بریتییە لە یاساکانی ڕەفتار، بەڵام خۆی ناتوانێت جێبەجێی بکات، دەستەڵاتی سیاسی بەرپرسیارە لە جێبەجێکردنی، لە میانەی دەستەبەرکردنی هەموو پێداویستییەکان.[2] عومەری کوڕی خەتاب خوا لێی ڕازی بێت لەم بارەیەوە بە ڕوونی وتویەتی: "إن الله يزع بالسلطان أكثر من القرآن"[3]، واتە خوای گەورە ئەوەی بە دەستەڵات جێبەجێی دەکات زیاترە لەوەی بە قورئان جێبەجێی دەکات. ئیبن خەلدونیش پەیوەندی دەستەڵاتی سیاسی بە شارستانییەتەوە وەك پەیوەندی شێواز بە مادەوە دەبینێت.[4] وڵاتیش بە بێ ئاوەدانکردنەوە نابێت، ئاوەدانکردنەوەش بە بێ دەوڵەت شتێکی مەحاڵە.[5] ئیبن خەلدون بە ڕوونی دووپاتی دەکاتەوە و دەڵێت: " باشیی دەستەڵاتیش بۆ

---

1. سەرچاوەی پێشوو، ل ٤٣ و ل ٤٧.

2. سەرچاوەی پێشوو، ل ١٢٠ ـ ١٢١.

3. الخطيب البغدادي، أحمد بن علي، تأريخ بغداد، بيروت، دار الكتب العلمية، (د. ت)، (د. ط)، بەش٤، ل١٠٧.

4. ابن خلدون، المقدمه، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٤٣ و ل ٣٤٩.

5. سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٤٩.

نەرمونیانی لە مامەڵەکردندا دەگەڕێتەوە".[(١)] ئەگەر پادشا ستەمکار و زۆردار بوو لە سزاداندا و بە دوای کەموکووڕیی خەڵکی و زیادکردنی تاوانەکانیانەوە بوو، ترس و دڵەڕاوکێی خستە دڵیانەوە، دواتر لە ناچاریدا پەنایان بۆ درۆ و فرتوفێڵ برد و بووە نەریت لە ناویاندا، تێڕوانین و ڕەفتاریان بۆگەن بوو بوو...، لەوانەیە هەموو کۆك بن لەسەر کوشتنی.[(٢)]

لەگەڵ ئەوەی ئیبن خەلدون جەخت لەسەر ڕۆڵی دەوڵەت لە گەشەپێداندا دەکاتەوە، بەڵام - بە پێچەوانەی زانا موسڵمانە تەقلیدییەکانەوە - پشتگیریی ڕۆڵی زۆرەملێی دەوڵەت ناکات. ئەو باوەڕی بەو دەستەڵاتە هەیە کە ئێستا پێی دەوترێت "دەستەڵاتی کارامە". مافی موڵکدارییەتی کەسی و ڕێزگرتن لە ئازادیی تاکە کەس لە سنووری بەها ڕەوشتییەکاندا، بەشێکن لە ڕێنماییەکانی ئیسلام و ئەمەش بە بەردەوامی لە فیکری ئیسلامیدا پەیڕەو کراوە. ئەرکی دەوڵەتیشە، وەك لە نووسینی زۆربەی زانایانی موسڵمانە تەقلیدییەکاندا هاتووە، لەناویشیاندا ئیبن خەلدون - کە بریتییە لە - سەرەڕای بەرگری و پارێزگاریکردن لە یاسا و دەستەڵات - دەستەبەرکرنی دادپەوەری و ڕاستگۆیی لە پەیمانەکاندا، نەهێشتنی ستەم، دابینکردنی

---

[1]. سەرچاوەی پێشوو، ل ١٧٦.

[2]. سەرچاوەی پێشوو، ل ١٧٦و ل ١٨٩.

داواکارییەکان، پابەندبوون بە ڕێنماییەکانی ڕەفتارەوە[1]، بە دەربڕینێکی تر، پێویستە لەسەر دەوڵەت ئەو کارانە ئەنجام بدات کە هاوکاریی خەڵکی بۆ ڕاپەڕاندنی کارە باشەکان دەکەن و ڕێگر دەبن لە زیادەڕۆیی و ستەمکردن لە یەکتر.

ئیبن خەلدون پێی باش نییە دەوڵەت ڕاستەوخۆ بچێتە ناو چالاکییە ئابوورییەکانەوە.[2] ئەنجامدانی ئەو کارە تەنیا زیان بە هاووڵاتیان ناگەیەنێت کە ڕێگەپێدان و قازانجیان سنووردار دەکات (ئێستا پێی دەوترێت کێبڕکێی کەرتی تایبەت)، بەڵکو داهاتی دەوڵەتیش لە ڕێی باجەوە کەمدەکاتەوە.[3] بەم شێوەیە تێڕوانینی ئیبن خەلدون بۆ دەوڵەت، تێڕوانینی نییە بۆ دەوڵەتێك کە ئابووریی ئازاد بێت

1 . ئیبن خەلدون ئەرکەکانی دەوڵەتی لە چەند شوێنێکی (المقدمە)دا تاوتوێکردوە، بۆ نموونە لە شوێنێکدا دەڵێت: پێویستە لەسەر فەرمانڕەوا "لە بەرانبەر دوژمندا بەرگری و پارێزگاری لە میللەتەکەی کە خوا کردوویەتی بە وەکیلی خۆی. پێویستە یاسای توند بچەسپێنێت و ڕێگر بێت لە هەر دوژمناکارییەك دژی هەر کەسێك وماڵومولّکی بکرێت. پێویستە ئاسایشی ڕێگاوبان دابین بکات. پێویستە هاوکاریان بێت بۆ دابینکردنی بەرژەوەندییەکانیان. پێویستە سەرپەرشتیی هەموو ئەو شتانە بکات کە کار دەکەنە سەر بژێوی و مامەڵەکانیان، لە نێوانیاندا کەلوپەلی خۆراك و پێوانەکان و ترازووەکان و ڕێگەگرتن لە فڕوفێڵ. هەروەها پێویستە گرنگی بدات بە لێدانی پارە، بۆ پارێزگاریکردن لەو پارەیەی مامەڵەی پێوە دەکەن لە ساختەکاری. . . یەکێك لە زانا گەورەکان وتوویەتی: جولاندنی شاخێك ئاسانترە لە دڵڕاگرتنی خەڵکی". ابن خلدون، المقدمە، سەرچاوەی پێشوو، ل٢١٦.

2 . ابن خلدون، المقدمە، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٥٧.

3 . سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٥٧ ـ ٢٥٩.

(Laissez Faire) و دەوڵەتێکی گشتگیریش نەبێت، بەڵکو دەوڵـەتێك بێت کار بۆ سەروەریی شەریعەت بکات و ئامڕازێك بێـت بـۆ خێراکردنـی گەشەپێدانی مرۆیی و خۆشگوزەرانی خەڵکی.[(١)] ڕووکردنە خۆماڵیکردن، هەندێ لە نووسەرە موسڵمانەکانی لەژێر کاریگەریی سۆشـیالیزمدا فریـو دا، هەندێ لە ژەنەراڵ و سیاسییەکان لە چەند وڵاتێکـی ئیـسلامیدا، بـۆ بەرژەوەنـدیی تایبــەتی خۆیـان بــەکاریان هێنـا. بـەڵام سۆشـیالیزم لـە هەژاری زیاتر هیچی تری بۆ هەموو وڵاتە ئیسلامییەکان نـەهێنا، کـە لـە میانەی کودەتا سەربازییەکانەوە دەسەپێنرا.[(٢)]

---

[1] . ئـیبن خەلـدون دەسـتەڵاتی سیاسـی دەکـات بـە سـێ بەشـەوە:– یەکـەم: دەسـتەڵاتێکی سروشـتییە کـە بتوانێـت هـەموو پێداویـستیی و تایبەتمەندییـەکانی خـۆی بـەدیبهێنێت. دووەم: دەستەڵاتێکی سیاسیی عەقڵانییـە کـە هـەموو تاکێـك دەتوانێـت خزمـەتی بەرژەوەنـدیی خـودیی دنیایی وەدەست بهێنێت و ڕێگر بێت لە هەر زیانگەیاندنێك بە پێـی هەنـدێ پـەیڕەوی عـەقڵانی. سێهەم: دەستەڵاتێکی "سیاسیی ئایینییە" یاخود "خیلافەت" کە خۆشگوزەرانی لە دونیا و لـە ئاخیرەتیش بۆ هەموو تاکێك بەدەست دەهێنێت، بە پێی ڕێنماییـەکانی شـەریعەت. بڕوانـە: ابـن خلدون، المقدمە، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٦٥ ـ ٢٦٦. ئەگەر بمانەوێت ئەم زاراوە نوێیانە بۆ ئـەم سـێ شـێوازەی حکومـەت بـەکار بهێـنین، دەتـوانین پێـی بڵـێین دەوڵـەتی عـەلمانیی نـەرێنی (Laissez Faire)، دەوڵـەتی خۆشـگوزەرانی عـەلمانی، دەوڵـەتی خۆشـگوزەرانی ئیـسلامی یاخود "خیلافەت". بۆ زانیاریی زیاتر دەربارەی دەوڵەتی خۆشگوزەرانی ئیسلامی، بڕوانە:
-Chapra, M. Umer. The Islamic Welfare State and its Role in the Economy. Leicester, Uk: The Islamic Foundation, 1979.
-Chapra, M. Umer. Islam and The Economic Challenge. Leicester, Uk: The Islamic Foundation, 1992. (Chapter 1, 3 and 5)

[2] -Desfosses, Helen, and Jacques Levesque (eds. ). Socialism in the Third World. New York: Praeger, 1975.

**چوارەم: ڕۆڵی سامان (س)**

پارە، داهاتی پێویست بۆ دەستەبەرکردنی دادپەوەری و گەشەپێدان و جێبەجێکردنی ئەرکەکانی حکومەت بە شێوەیەکی کاریگەر و خۆشگوزەرانی بۆ خەڵکی دابین دەکات. پارەش پشت بە بەخت و فاڵگرتنەوە[(١)]، یاخود هەبوونی کانە زێڕ و زیو نابەستێت[(٢)]، بەڵکو پشت بە چالاکییە ئابوورییەکان[(٣)]، قەوارەی بازاڕ[(٤)]، ئەو پێداویستی و کارئاسانیانەی حکومەت دابینی دەکات[(٥)] و ئامێرەکان دەبەستێت[(٦)]. کە ئەمیش لە لای خۆیەوە پشت بەو شتانەی خراونەتە گەنجینەوە، یان "زیاترن لە پێویستیی کارمەندەکان، دەبەستێت".[(٧)] تا چالاکی زیاتر بێت، داهاتیش زیاد دەکات، چونکە بەرزبوونەوەی داهات هاوکار دەبێت بۆ زیادکردنی پاشەکەوت و زۆربوونی وەبەرهێنان لە ئامێرەکاندا.[(٨)] ئەمیش لە لای خۆیەوە هاوکار دەبێت بۆ زیاکردنی گەشەپێدان و

---

[1]. ابن خلدون، المقدمە، سەرچاوەی پێشوو، ل٣٣٩.
[2]. سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٣٩.
[3]. سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٣٤.
[4]. سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٧٣.
[5]. سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٨٠.
[6]. سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٣٣ و ل٣٣٤.
[7]. سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٣٣.
[8]. سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٣٤.

پارە.[1] ئیبن خەلدون زیاتر جەخت لەسەر ڕۆڵی وەبەرهێنان دەکاتەوە و دەڵێت: "بزانە ئەگەر پارە هەڵگیرا و لە گەنجینەکاندا پاشەکەوت کرا، هیچ گەشە ناکات، بەڵام ئەگەر بۆ خزمەتی میللەت و پێدانی مافەکانیان و ئازارنەدانیان بوو، گەشە دەکات و پاکیش دەبێتەوە. چاکسازی دەبێت بۆ هەمووان و وڵاتیشی پێ ڕێك دەخرێت، بارودۆخەکە چاك دەبێت و سەربەرزی و سوودی بۆ هەمووان دەبێت".[2] ئەم شتە "کاروبار و ژیانیان چاك دەکات، ئەگەر هاتوو ئەمەت کرد، ئەوە بڕیاری دەوڵەتت بۆ خۆت داوە" [3]. هۆکارە هاندەرەکانیش بریتین لە کەمکردنەوەی ڕێژەی باج[4]، دابینکرنی ئاسایشی ژیان وماڵومولك[5]، ژینگەیەکی سروشتی و تەندروستی کە درەخت و ئاو و پێداویستییەکانی تری ژیانی تێدا بێت.[6]

سامانیش پشت بە دابەشکردنی کار و پسپۆڕی دەبەستێت، تاوەکو زیاد بێت پارەش گەشە دەکات. "وەك زانراوە و دووپاتبووەتەوە، هیچ تاکێك لە مرۆڤەکان ناتوانێت بە تەنیا ژیانی ڕۆژانەی خۆی

---

1. سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٣٤.
2. سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٨١.
3. سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٨١.
4. سەرچاوەی پێشوو، ل٢٥٥ ـ ٢٥٦.
5. سەرچاوەی پێشوو، ل ٢٦١.
6. سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٢١ ـ ٣٢٣.

بەدەســـــتبهێنێت، بـــــەڵکو هــــەموویان هاوبەشـــــی یـــــەکترن لــــە ئاوەدانکردنەوەدا. ئەو پێداویستییانەی کـە بـە یارمـەتیی کۆمـەڵێکیان بەدەست دێت، پێویستیی چـەند جـارەی ژمارەیـەکیان دابـین دەکـات، زیادەکەشی لە بوارەکانی خۆشی و شادیدا خەرج دەکرێت، پێداویستیی خەڵکانی تری شارەکەیانی پێ دابین دەکەن و پاشان لە بری بەهاکەیان لێوەردەگرتەوە، ئەمەش دەبێتـە جـۆرە بـەختێکی دەوڵەمەنـدی. ئـەم حاڵـەتی دەوڵەمەنـدی و خۆشـگوزەرانییەش، دەبێتـە هـۆی خۆشـی و دابینکردنی پێویستییەکانی وەك جوانکاری لە شوێنی نیـشتەجێبوون و جلوبـــەرگ، نوێکردنـــەوەی قاپوقاچـــاخ و بـــەکارهێنانی خزمـــەتکار و ئۆتۆمبێل. ئەمـەش دەبێتـە هۆکـاری پێـشکەوتنی پیـشەسازی و کـارە پیـشەییەکان. بـازاڕی کـار و پیـشەوەرەکان دەگەشـێنەوە و داهـات و خەرجییەکانی وڵاتیش زیاد دەکـەن". [1] لەبـەر ئەوەشـە کـە مرۆڤـەکان ڕازی نابن بە خۆڕایی کار بکەن [2]، بۆیە دابەشکردنی کار دروست نابێت، ئەگەر ئاڵوگۆڕی یەکسان دروست نەبێت. [3] بۆیە پێویستە بازاڕی باش و ڕێکوپێـــك هــــەبێت بـــۆ ئــــەوەی خــــەڵکی بتـــوانن ئـــاڵوگۆڕ بکـــەن و پێداویـستییەکانیان دەسـت بکـەوێت. [4] بەرزبوونـەوەی داهـات و پـارە

---

1. سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٣٤.
2. سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٧٣.
3. سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٥٣.
4. سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٣٣ـ ٣٣٦.

هاوكار دەبێت بۆ زۆربوونی داهاتەكانی باج و حكومەت دەتوانێت زیـاتر بۆ خۆشگوزەرانیی میللەت خەرج بكـات، ئەمـەش دەبێتـە هۆكارێـك بـۆ زیـادبوونی بـوارە ئابوورییـەكان[1]، زیـادبوونی گەشـەپێدان، دواتـریش دەبێتـە هۆكارێـك بـۆ زیـادبوونی سروشـتیی ژمـارەی دانیـشتووان و كرێكاری شارەزا و نەشارەزا و زانایان لە شوێنەكانی تـرەوە كۆچـی بـۆ دەكەن.[2] پاشـان سـەرمایەی مرۆیـی و فیكریـی ئـەو كۆمەڵگایـە زۆر و پتەو دەبێت. ئەو زۆربوونی ژمـارەی دانیـشتووانەش، داواكـاری لەسـەر كـاڵا و خزمەتگوزارییـەكان زیـاد دەكـات، پیـشەسازییش زیـاتر بـەهێز دەبێـــت و داهـــاتیش بەرزدەكاتـــەوە، زانـــست و فێركـــردنیش پێشدەكەوێت[3]، خێرایی گەشـەپێدانیش زیـاتر دەكـات.[4] لەسـەرەتادا نرخەكان بەرەو دابەزین دەڕۆن، لەگەڵ زۆربوونی گەشەپێدان و بەرهەم، بـەڵام داواكـاری لەسـەر كاڵاكـان زیـاد دەكـات و سـستیی خستنەڕووی كاڵاكان كە ناتوانێـت هاوشـانی بێـت، دەبێتـە هـۆی دەركـەوتنی چـەند حاڵەتێكی كەمبوونەوە، ئەمیش دەبێتە هۆی بەرزبوونەوەی نرخی كـاڵا و خزمەتگوزارییەكان، نرخی پێداویستییە سەرەكییەكانیش خێراتـر لـە نرخـــی شـــتومەكی جوانكـــاری بەرزدەبێتـــەوە، نـــرخ لـــە ناوچـــە

---

1. سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٥٣.
2. سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٣٥ .
3. سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٣٣ و ل ٣٧١ ـ ٣٧٣.
4. سەرچاوەی پێشوو، ل٣٣٦ و ل ٣٣٧ ـ ٣٧٣.

پێشکەوتووەکاندا خێراتر لە ناوچە گوندنشینەکان بەرزدەبێتەوە، کرێی کارمەندانیش بەرزدەبێتەوە، لەگەڵیدا باجەکان زیاد دەبن، ئەمانەش دەبنە هۆی بەرزبوونەوەی نرخەکان کە کاریگەریی خراپی لەسەر سەرخەڵکی دەبێت، دەبێتە هۆی نەهاتنی خەڵکی و بەجێهێشتنی ئەو شوێنە، لەگەڵیدا پێشکەوتن و شارستانییەتیش دادەبەزن.[١]

دابەزینی داهات، دەبێتە هۆی دابەزینی داهاتی باجەکان، کە بەشی خەرجییەکانی دەوڵەت ناکات، بەوەش دەوڵەت بەرەو سەپاندنی باجی زیاتر و زیاتر دەڕوات، هەروەها هەوڵ دەدات دەست بەسەر هەموو سەرچاوەیەکی هێز و پارەدا بگرێت. ئەم هۆکارەش وای لێ دەکات بە شێوەیەکی نەرێنی داهات لە جووتیار و بازرگانەکان وەربگرێت، کە ئەمان زۆربەی باجەکان دابین دەکەن. بۆیە کە داهات دادەبەزێت، داهاتی باجەکانیش دادەبەزێت، دەوڵەت ناتوانێت هیچ خەرجییەك بۆ گەشەپێدان و خۆشگوزەرانی دابین بکات، گەشەپێدانیش دادەبەزێت و سستی یاخود بێ بازاڕی زۆرتر دەبێت، هەروەها هێزە ڕووخێنەرەکان زیاد دەکەن و لە کۆتاییدا دەبێتە هۆی نەمانی بنەماڵەی فەرمانڕەواش.[٢]

---

1. سەرچاوەی پێشوو، ل١٥٧ و ل ٣٣٦ ـ٣٣٧.
2. سەرچاوەی پێشوو، ل١٥٧ و ل ٢٥٥ ـ ٢٥٧.

ئەگەر بمانەوێت دەربارەی شیکارییەکەی ئیبن خەلدون لە شێوەی پەیوەندی ئەرکەکاندا، دەتوانین بڵێین:

ح= ف (ش، م، س، د، گ)

ئەم هاوکێشەیە ژیاریی نموونەکەی ئیبن خەلدون ڕوون ناکاتەوە، بەڵام ڕەنگدانەوەی شەقڵی ئەوی پێوە دیارە، ئەو شەقڵەش جۆراوجۆرە و چەند لقێکی مەعریفیی بە یەکەوە نووساوە (Interdisciplinary)، لە میانەی وەرگرتنی هەموو گۆڕانکارییە سەرەکییەکان، کە لەم هاوکێشەیەدا بە وردی گفتوگۆی لەسەر کردوون، پاشان دەرکەوتنی (ح) یاخود دەسەڵاتی سیاسی، کە ئەو دواکەوتەی گۆڕانکارییەکانە، چونکە یەکێك لەو گرنگییە سەرەکییانەی ئیبن خەلدون بریتی بوو لە ڕاڤەکردنی سەرهەڵدانی بنەماڵەی فەرمانڕەوا و وڵاتان و شارستانییەت و دارمانیان. ئەو وای دەبینێت کە هێزی بنەماڵەی فەرمانڕەوا و لاوازییەکەی، پشت بە هێز و لاوازیی دەسەڵاتی سیاسی دەبەستێت کە لەسەری دروست بووە، مانەوەی دەسەڵاتی سیاسی لە کۆتاییەکەیدا پابەندە بە خۆشگوزەرانیی خەڵکەوە، کە پێویستە پێش چەسپاندنی شەریعەت بۆی دابین بکات، ئەگەر دەسەڵاتی سیاسی گەندەڵ بوو و لێهاتوو و شیاو نەبوو، نەچووە ژێر باری بەرپرسیاریەتیی میللەت، ئەوا کارەکانی بە ویژدانێکی زیندووەوە ئەنجام نادات. بۆیە ئەگەر ئەو داهاتەی لەبەردەستدایە، بە شێوەیەکی کاریگەر بەکار نەهات، ئەو خزمەتگوزارییەشی کە پێویستە بۆ

کارئاسانیی گەشـەپێدان پێـشکەشی بکـات، لەبەردەسـتدا نـەبوو، ئـەوا گرفت بۆ گەشەپێدان و خۆشگوزەرانی دێتە پێش. ئەگەر گەشەپێدانیش نەبوو، ئەو داهاتەی کە کۆمەڵگا و حکومەت بۆ ڕووبەڕووی بەربەستەکان و بەرەوپێشچوون و بـەدیهێنانی ئامانجـە کۆمەڵایـەتی ـ ئابوورییـەکان پێویستیانە، هیچ زیاد ناکات.

## پێنجەم: ڕۆڵی میکانیزمی دەستپێکردن

سەرەڕای پەیوەندیی نێـوان ئـەنجام و هـۆ، ڕێڕەوەکـەیان پێـچەوانە نابێتـــەوە بـــە هـــەر هۆیـــەك بێـــت، چـــونکە هۆکارەکـــە بازنەییـــە و بەستراونەتەوە بەیەکەوە لە کۆمەڵگای مرۆییدا. ئیبن خەلـدون جـەختی لەسـەر دەکاتـەوە و پێـی باشـە ئـەو پەیوەندییـە پێـچەوانە ببێتـەوە، (ئەوەش لە نموونەکەی پێشتر بڵاوکرایەوە و لە میانەی خاڵ و هێماکاندا دەردەکـــەوێت). دەتوانرێـــت هەریـــەك لـــەو زاراوانـــە کـــە هەریـــەکیان سەربەخۆن، بە تایبەتیش گەشەپێدان، بگۆڕێکی دواکەوتـەی ئـەوی تـر بێت، لە کاتێکدا زاراوەکـانی تـر دەتـوانن بـە سـەربەخۆیی بمێننـەوە، ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کە میکانیزمی دەسـتپێکردن بـەرەو داڕمـانی کۆمەڵگایـەك، لەوانەیـە هـەمان میکـانیزمی دەسـتپێکردن بێـت بـەرەو داڕمانی هەر کۆمەڵگایەکی دی. لە کۆمەڵگا ئیسلامییەکاندا، کە جێگەی گرنگیپێدانی ئیبن خەلـدونن، میکـانیزمی دەسـتپێکردن لـە دەسـتەڵاتی سیاسیدا خۆی دەبینێتەوە، کە ـ لە بێ بەختیدا ـ تـا ئـەمڕۆ لـە هـەموو

ولآتــانی ئیــسلامیدا هەیــە.[1] ئــەم میکانیزمــەش وایکــردوە داهاتــە گشتییەکان بە شێوەیەکی خراپ بەکاربهێنرێن، نەبوونیشی بووەتە هۆی بەدینەهاتنی دادپەوەری و گەشەپێدان و خۆشگوزەرانیی گشتی.

لەگــەڵ ئــەوەی هــەموو هۆکارەکــان ڕۆڵــی گــرنگ لــە گەشــەپێدانی کۆمەڵگا و دارِمانی دەبینن، بەڵام میکانیزمی دەستپێکردن ڕۆڵـی گـرنگ و یەکلاییکـەرەوە دەبینێـت. لەوانەیـە میکـانیزمی دەسـتپێکردنی هـەر زاراوەیـەك کـە گۆڕاناکارییـان بـە سـەردا دێـت لـە نموونەکـەی ئـیبن خەلدوندا، بۆ نموونە تێکچوونی خێزانـی، کـە لـە کـاتی ئـیبن خەلدونـدا نەبوو بوو بە گرفتێك، بۆیە لە شـیکارییەکەیدا باسـی نـەکردووە. بـەڵام بەشێکی بنەڕەتییە لە (م) (مرۆڤــ )ەکان و ئێستا لە جیهـانی ڕۆژئـاوادا هەیە و زۆربـەی کۆمـەڵگاکان بـە ڕێـژەی جیـاواز کاریگـەریی لەسـەریان هەیە. ئەگەر ئـەم تێکـچوونە بـەردەوام بـوو و نەوەسـتا، دەبێتـە هـۆی نەمانی پەروەردەیەکی گونجـاو بـۆ منـداڵان، پاشـان بـەرەو هەڵـدێر لـە چۆنیەتی مرۆڤەکاندا، کە دەبنە بـەردی بناغـەی هـەر شارسـتانییەتێك. ئینجا مەحاڵە بۆ ئەو کۆمەڵگایە لەسەر پێشکەوتنی ئابووری و زانستی و تــەکنۆلۆژی و ســـەربازییەکەی بمێنێتـــەوە، لەوانەیـــە میکـــانیزمی دەستپێکردنیش لاوازیی ئابووری بێت لە ئەنجامی سیستمێکی ئابووریی هەڵە لەسەر بنەڕەتی بەهاو دامەزراوەیەکی بێ سـوود بنیـات نـرا بێـت،

[1] هەر وەك لە بەشی ٣ ــ ٦ دا دەیبینین.

وەك ئەوەی لە یەكێتیی سۆڤیەتی پێشوودا ڕووی دا. هەروەها لەوانەیە بــەهۆی نــەبوونی دادوەری و دەزگــا فێرخــوازی و تەندروســتییەكان، نەگەیەشتن بە سەرمایەی پرۆژەكان ڕوو بدات، لەوانەیە ببێتە هۆی باش بەكارنەهێنانی داهاتە مرۆییەكان و چەقبەستنی گەشـەپێدان، هـەروەك لە چەندین وڵاتی تازەپێگەیشتوودا ڕوو دەدات كە جیهانی ئیـسلامییش بەشێكی سەرەكین لەوان.

بەم شێوەیە، ئیبن خەلدون هەوڵەی نەكردووە كاتێك تـەنیا خـۆی بـە زاراوەی گۆڕانكارییــە ئابوورییەكانــەوە بــۆ ڕاڤــەكردنی گەشــەپێدان و دارِمان، بەستووەتەوە، بەڵكو پـشتی بـە لێـك نزیكردنەوەیـەكی ژیـاری چـەندان لقـی مەعریفـەت بەسـتووە، بـۆ ڕوونكردنـەوەی چۆنیەتی ئـەو پەیوەندییە بە یەكـەوە بەسـتراوەی هۆكـارە كۆمەڵایـەتی و ڕەوشـتی و ئـابووری و سیاسـی و مێـژوویی و دیمۆگرافییـەكانن، كـە دەبنـە هـۆی ڕابوونی كۆمەڵگا و كەوتنی. هـەروەها دەتوانرێـت ئەمـەش بـە هۆكـاری خێرا گەشەپێدانی هەندێ وڵات لە وڵاتانی دی دابنرێت، وای لـێ دەكـات گەشــەپێدانەكە بــەردەوام بێــت، ئــەوەش بگەیــەنێت چ كاتــێ گــەل خۆشـگوزەرانیی ڕاسـتەقینە بەدەسـت دەهێنێـت. خۆشـبەختانە وردە وردە خەریكە ئابووریی گەشەپێدان حیساب بـۆ نزیكـەی هـەموو زاراوە گۆڕانكارییەكان دەكرێت، سەرەڕای ئاوێتەبوونی دوولایەنەیی لە میانەی هۆكارە بازنەییەكەوە.

لەگەڵ ئەوەشدا بۆچوونی ئیبن خەلدون بۆ میکانیزمی دەستپێکردن، بە شێوەیەکی تەواو بەکارنەهێنراوە، بە بێ ئەم بۆچوونەش دەبینین دووپاتکردنەوەی نۆرس (North) و تۆماس (Thomas)[1] لەسەر مافی موڵکایەتی لە جیهانی ڕۆژئاوادا، هیچ دادێکمان نادات. مافی موڵکایەتی لە زۆربەی کۆمەڵگاکاندا هەبوو، بە تایبەتیش لە جیهانی ئیسلامیدا، بە هۆی پابەندبوونی ئیسلامەوە بەم مافە. مەرج نییە کۆمەڵگاکان گەشەپێدان بە هەموو شێوازەکانیەوە وەدەستبهێنن، چونکە مافی موڵکایەتی، وەکو دامەزراوەکانی تر، ئەگەر جێبەجێ نەکرێت، هیچ قورساییەکی نییە، بەڵام بۆچی لە وڵاتانی ڕۆژئاوا جێبەجێ کرا؟ لەوانەیە بە هۆی سەرهەڵدانی دیموکراتییەتەوە بێت، کە بووە هۆی لێپرسینەوەی سیاسی. وای لە دامەزراوەکان کرد مافی موڵکایەتی تێیدا بەشێکی یەکلاییکەرەوە بێت.

بۆیە لێپرسینەوەی سیاسی، دەرەنجامی دیموکراتییەتە، کە وای لە چۆنیەتی دەستپێکردن کرد مافی موڵکایەتی و دادپەروەری بسەپێنێت، ئەمەش بووە هۆی گەشەپێدان. لەوانەیە نۆرس و تۆماسیش تا ڕادەیەك درکیان بەمە کرد بێت، ئەوان دەڵێن داهێنان و ئابووریی قەوارەیی (داهاتی بەرهەمهێنان بە شێوەیەکی بەرفراوان لە کاڵایەکدا -

[1] See: North, Douglass C. And Robert Paul Thomas. The Rise of the Western World: A New Economic History. Cambridge: Cambridge University Press, 1973.

(economies of scale) و فێرکــردن و گردبوونــەوەی ســەرمایە، هۆکاری گەشەپێدان نین، بەڵکو خۆیان گەشەپێدانن.[1] بە بـەکارهێنانی خودی لۆژیك، دەتوانرێت مافی موڵکایەتیش بچەسپێنرێت وەك ئەنجام، نــەك وەك هــۆ. مــافی موڵکایــەتی لــە بــەها مەســیحییەکاندا خــۆی دەبینێتــەوە، بــەڵام نەکراوەتــە فــەرمان و بــچەسپێنرێت، ئەگــەر دیموکراتییەت نەبووایە، لەوانە بوو مافی موڵکایەتی بچەسپێنرایە.

ئیبن خەلدون هەڵەی ئابووریناسە کلاسیکییە نوێکانی نەکردووە، کە بـە پلـەی یەکـەم گرنگـی بـە شـیکاریی نـەگۆڕی (static) کورتخایـەن بـدات، بـە هـۆی نـەگۆڕیی هۆکارەکـانی دی، لـە کاتێکـدا دەبینرێـت لـە هەموو کۆمەڵگا مرۆییەکانی تردا گۆڕانکاری لە هۆکارەکاندا دەکرێت، لە میانــەی زنجیرەیــەك ئاوێتــەبوون. لەگــەڵ ئەوەشــدا لەوانەیــە ئــەم گۆڕانکارییانە زۆر بـچووك بـن و نـەبینرێن. هـەروەها کاریگـەری لەسـەر گۆڕانکارییە ئابوورییەکان گرنگیی خۆیان هەیە، نابێت پشتگوێ بخرێن، بۆیە سەرەڕای پشتبەستنی زانایـانی ئـابووری بـە گریمانەیـەك کـە ئـەو گۆڕانکارییانە بۆ ئاسانکاری و ئاسانکردنی شیکارییەکان یەکسانن، بۆیە پێویستە لە هـەمان کاتـدا هۆکـاری ژیـاری هەمـەجۆری مەعریفـەت لـەو جــۆرەی ئــیبن خەلــدون بــەکاری هێنــاوە، بــەکاربهێنرێت، بــەهۆی ڕەخــساندن و کارئاســانی لــە دارشــتنەوەی سیاســەتە کۆمەڵایــەتی و

---

[1] North and Thomas. The Rise of the Western World, p. 5

ئابوورییەکان، کە هۆکار دەبن لە باشـکردنی کارەکـانی ئابوورییـەك بـۆ ماوەیەکی درێژخایەن، هەروەها بەرزکردنەوەی ئاستی خۆشـگوزەرانیی میللــەت، کــە ئەمــەش لــە زانــستی ئــابووریی کلاســیکیی نوێــدا (Neoclassical Economics) جێبەجێکردنی زەحمەتە، چونکە وەك (نۆرس) پرسیارێکی ڕەوا دەکات و دەڵێت: "چۆن دەتوانین ڕەچـەتەی سیاسـی (دیـاریکردنی سیاسـەتەکان) بـدەین، کاتـێ مرۆڤەکـە نازانێـت گەشەپێدانی ئابوورییەکان چییە؟" بۆیـە زانـستی ئـابووریی کلاسـیکیی نوێ، بـە "ئـامرازێکی نـەگونجاو دادەنرێـت بـۆ شـیکاری و دیـاریکردنی سیاسەتەکان کە بتوانێت گەشە بە گەشـەپێدان بـدات"[1]. لەبەرئـەوەی ئـیبن خەلـدون نموونەیـەکی پرشـنگداری بـۆ ڕاڤـەکردنی سـەرهەڵدانی کۆمەڵگایەك یان داڕووخانی دانـاوە، بۆیـە تـوینبی (Toynbee) ڕاسـت دەکات کە پێی دەڵێت: "فراوانی و قووڵیی تێڕوانین و بێلایەن لە هێـزی فیکریـدا"، چـونکە ئـیبن خەلـدون لـە (مقدمـە)کەیـدا بـۆ مێژوویـەکی گشتگیر: "داهێنەر بووە و فەلسەفەیەکی بۆ مێژوو داناوە ـ ئەمـەش بـە بێ گومان ـ بە مەزنترین کار دادەنرێت لەو جۆرە، هەر عەقڵێك لـە هـەر کات و شوێنێکدا دایهێنابێت".[2]

لەگـەڵ ئـەوەی مـن نموونەکـەی ئـیبن خەلـدونم بـەکارهێناوە، بـەڵام پێویستە هەندێ گۆڕانکاریی تێدا بکرێت، ئەمەش دەگەڕێتەوە بۆ ـ وەك

---

[1] North and Thomas. The Rise of the Western World, p. 359.
[2] Toynbee, A Study of History. Volume 3, p. 321-322.

لە پێشەکیی ئەم کتێبەدا ئاماژەم پێ دا ـ ڕوودانی ژمارەیەك گۆڕانکاری لـە هـەموو لایەنـەکانی ژیـانی مرۆییـدا. چـونکە هـەموو کۆمـەڵگاکان و سیستمی فەرمانڕەوا و ئابوورییـەکان، دووچـاری گۆڕانکـاریی بنـەڕەتی هاتوون.

أ– لە کاتێکدا کە ڕۆڵـی میللـەت بەهەنـد وەردەگیرێـت، پێویـستە چاومان لەوە بێت کە ڕای هـەمووان ناگەیـەنێت، بـەڵکو کەمپینێکـە لـە چـەند پێکهاتەیـەکی جیـاواز پێکهـاتووە، لەناویانـدا پیـاوان و ژنـان و زانایان و هەڵبژاردەی سیاسی و خەڵکی ئاسایی و خێـزان و هۆزەکـان و کۆمەڵە کۆمەڵایەتی و ئابووری، کۆمەڵگاش بە شێوەیەکی گشتی. ئـیبن خەلدون هەندێکی بە هەند وەرگرتووە، بەڵام نەك هەموویان.

ب– لەگەڵ ئەوەی ئابووریی وڵاتە ئیسلامییە سەرەکییەکان دەسـتی بە داڕمان کردووە، بەڵام هێشتا بەهێزە، گەر بەراوردیان بکـەین لەگـەڵ هاوشانەکانیاندا، بێگومان ڕێژەی پێگەکەی  وەك ئێستا ئەوەنـدە لاواز نەبووە، یەکێك لە هۆکارە سەرەکییەکانی ئەم لاوازییە بۆ ئـەو بۆشـاییە لـە فێرکـردن و مەعریفـەت و بنـەمای تـەکنۆلۆژیادا دەگەڕێتـەوە. ئـەم بۆشاییەش کاتێکی زۆری دەوێت تا پڕدەبێتەوە، هەتاوەکو ئەگـەر ئـەم کۆمەڵگایانەش هەوڵێکی جیددی دەوێـت بـۆ چاکسازیی کۆمەڵاییـەتی ـ ئابووری و سیاسیی پێویست ئەنجام بدەن.

ج– ئـەو فراوانییـە گەورەیـەی لـە مەعریفـەی مرۆیـی و بنـەمای تەکنۆلۆژیدا هەیە، ئەرکی ناڕەحەتی ڕۆتینی کە ژنان پێـی هەڵدەسـتن،

زۆر کەمکردووەتەوە، ئازادی کردوون کە ڕۆڵێکی گرنگ ببینن لە ڕابوونی فێرکـردن و فیکـری و کۆمەڵایـەتی ـ ئـابووری کۆمـەڵگاکانیان. ئەگـەر هاوکارییان نەکرێت بۆ هەستانیان بەم ڕۆڵە، ئەوا تووشی هەستکردن بە تێکشان دەبن، هـەروەها کاریگـەریی نەرێنیـشی لەسـەر کۆمەڵگاکـەیان دەبێت. بەڵام ئەگەر ڕێگەیان پێ بدرێت بـە شـێوەیەکی کاریگـەر ڕۆڵـی خۆیـان ببیـنن، ئـەو کاتـە نـاتوانن وەك ژنـانی پێـشوو خـەریکی پەروەردەکردنی منداڵەکانیان بن. ئەمەش پرسیارێك دێنێتە کایەوە کـە پەیوەندی بە چارەسەری جێگرەوە هەیە بۆ پڕکردنەوەی ئەم بۆشاییە. پاشان ئەو هەوڵە نێودەوڵەتییانەی دەدرێـت لـە زانـست و تـەکنۆلۆژیا، وایکـردووە کـە پێوسـت بێـت نێـر و مـێ لـە کۆمـەڵگادا مەعریفەیـەکی گشتگیر بەدەستبهێنن، کاتێکی زۆرتریش بەسەربەرن بۆ ئـەم مەبەسـتە کە لە ڕابووردوودا کەمتر بوو، دیارە ئەمەش داهاتێکی زۆرتری دەوێت و بە زەحمەت دابین دەکرێت، ئەگەر هەوڵی هەموو خێزان و کۆمەڵگاکان و حکومـەت لـەم بـوارەدا یەکنـەخرێت. هـەروەها پێویـستە وەبـەرهێنانی زەکـات و ئـەوقاف ڕۆڵـی گرنکیـان هـەبێت، بـە تایبـەتیش لـە پێنـاو گواستنەوەی مەعریفەت و پسپۆڕییەکان بۆ هەژارەکان.

د– بۆ ئەوەی کاروباری ئایینی (الفقـە) کـە بەشـێکە لـە شـەریعەت، پێش بکەوێت، هیچ چارەیەکی دی نییە لەوە زیاتر کـە زانایـان بـەدوور نەبن لە ڕووداو و گۆڕانکارییە نوێیەکانی ئـەم سـەردەمە، بـە شـێوەیەك ڕێگە بە موسڵمانان بدرێت بـە سـەرکەوتوویی ڕووبـەڕووی بەربـەرەکانێ

نوێیەکان ببنەوە. لەگەڵ ئەوەی کاروبـاری ئـایینی لـە سـەردەمی ئـیبن خەلدوندا تووشی وەستان هاتبوو، بەڵام ئێستا زیـاتر تووشـی وەسـتان بووە، بە هۆی ماوە درێژەکەی دارمانی موسڵمانانەوە کە بەسترابووەوە بە داگیرکردنی بیانییەوە. بۆیە پێویستە کاروبـاری ئـایینی لـە حاڵـەتی وەستانەوە بگوێزرێتەوە بۆ هەستان و ئەو ڕۆڵە ژیارییە ببینێـت کـە لـە سەدە سەرەتاییەکاندا ئەنجامی دابوو.

هـ- هـــەتاوەکو بـــەبێ خۆمـــاڵیکردن و پلانـــی ناوەنـــدی، ڕۆڵـــی حکومەتـــەکان ئێـــستا زۆر زیـــاترە، داوای هاوبەشـــی بەشـــێوەیەکی کاریگـــەرتر لێـــدەکرێت بـــۆ جێبـــەجێکردنی دادپـــەروەری و بنـــەمای سەرەکیی کۆمەڵایەتی - ئابووری و گەشەپێدان، کە لە ڕابوردوودا زۆر پێویـــست بـــوون. فراوانکردنـــی بـــواری دادپـــەروەری و گەشـــەپێدان بەشێوەیەکی گەورە لە کۆمەڵگا یـەکرگرتووەکانی ڕابـووردوودا، بـوونی هـۆز و کۆمەڵـە پیـشەیی و دامـەزراوە برایـەتی و تیمـە سـۆفییەکان، هاوکاریی کۆمەڵایـەتیی بـەهێزتر دەکـرد، ئەمـەش یارمەتیـدەر بـوو بـۆ سەپاندنی ڕێسای فەرمی و نافەرمی بۆ ڕەفتار، ڕاستگۆیی و بەویـژدانی لە مامەڵکردندا بەهێز کرد، ئەمانە بوونە هۆی دابینکردنی دادپەوەری و خۆشگوزەرانیی گشتی. لەبەر ئەوەی ئەم شتانە لە ئەنجامی زۆربـوونی ژمارەی دانیشتووان لاواز بوون، زیادبوونی جموجووڵی شارستانییەتی و زیادبوونی بزوتنی خەڵکی، بێگومـان ئـەم بۆشـاییانەش پێویـستیان بـە

پڕکردنـــەوە هەیـــە، لـــە ڕێگـــەی خێـــزان و زانایـــان و قوتابخانـــە و دامەزراوەکانی خوێندنی باڵا و حکومەت.

لە کۆتاییدا، پێویستییەکان وا دەخوازن کە ئابوورییەکی گشتگیر لـە نموونەکەدا دابین بکرێـت، نـەك تـەنیا پـارە، بۆیـە وا پێویـست دەکـات هـەموو پێداویـستییەکان ئامـادە بکـرێن، وەك بـازاڕ و سـستمی پـارە و دارایـی و کـەرتی گـشتی و تایبـەت، بـە مـەرجێك جـەخت لەسـەر جێبـەجێکردنی چـالاکی و دادوەری و یەکـسانییش لـە بـەکارهێنانی داهاتەکانـدا بکرێتـەوە، ئەمانـە هـەموو دەریدەخـەن کـە ئێـستا بـوونی چاکسازی نەك تەنیا بـۆ گـەل، بـەڵکو بـۆ هـەموو دامـەزراوەکانیش کـە کاریگەریی لەسەری هەیە، پێویستە.

# بەشی دووەم

## ئەو هۆكارانەی بوونە هۆی ڕابوونی موسڵمانان

ئێستا كاتی ئەوە هاتووە شیكارییەكەی پێشتر باس كرا، جێبەجێ بكرێت، بۆ دیاریكردنی ئەو هۆكارانەی وەك چۆنیەتی دەرچوون كاریان لە ڕابوونی كۆمەڵگایەكی عەرەبیی كۆچەریدا كرد. كاتێ پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) دەستی بە بانگەواز بۆ ئیسلام كرد، ئەم كۆمەڵگایە لە ژینگەیەكی كۆمەڵایەتی - ئابووری و سیاسی و نێودەوڵەتیدا دەژیا، بە هیچ شێوەیەك ڕێگەی نەدەدا بە گەشەی شارستانییەتێك بە گوێرەی فەلسەفەكەی توینبی (Toynbee) ژیانی تێدا بێت. تایبەتمەندییە سەرەكییەكانی ئەم كۆمەڵگایەش بریتی بوون لە ناكۆكی و شەڕی كاولكاری، كەمیی داهات و ئاووهەوایەكی ناهەموار و زەوییەكی وشك و هەژاری و نەبوونی، لەگەڵ ئەمانەشدا بارودۆخێكی

زەقی نایەکسانی لە داهات و ساماندا. خوێندەواری زۆر کەم بوو، بە دەگمەن هێمایەك بۆ پێشکەوتنێکی خێرا لە ئایندەیەکی نزیکدا ببینرایە. سەرەڕای ئەمانەش، لەم کۆمەڵگایەدا هەستێکی فیکری، یاخود تایبەتمەندییەکی دارایی نەبوو، وەك ئەوەی لە دراوسێ بەهێزەکانی کە لە هەردوو ئیمپراتۆرییەتی ساسانی و بیزەنتیدا خۆی دەبینییەوە، هەبوو. لەگەڵ ئەوەی ئەم دراوسێیانە جەنگی درێژخایانی وێرانکەر هیلاکی کردبوون، بەڵام هێشتا لە بواری ئەکادیمی و ئابووری و سەربازیدا بەهێز بوون، بۆیە ئەو پرسیارەی دێتە ئاراوە، بریتییە لە: ئەو شتە چییە کە بووە هۆی ڕوودانی گۆڕان لە چۆنیەتی ئەم کۆمەڵگا کۆچەرییەدا، بە ڕێژەیەك نەك تەنیا بەسەر بارودۆخە ناسراوەکەیدا سەرکەوت، بەڵکو گۆڕانکارییەکی شۆڕشگێڕانەی لەو کۆمەڵگایانەی کەوتنە ژێر دەستەڵاتیەوە، بەرپا کرد؟

ژمارەیەك لە زانایانی وەك توینبی (Toynbee)، هیتی (Hitti)، هۆدجسۆن (Hodgson)، بایك (Baeck)، لویس (Lewis)[1]،

---

1 . Toynbee, Arnold J. A Study of History, abridgment by D. C. Somervell, London: Oxford University Press, 1957.
-Hitti, Philip. History of the Arabs. London: Macmillan, 1958.
-Hodgson, Marshall G. S. The Venture of Islam: Conscience and History in a World Civilization. Chicago: University of Chicago Press, 1974.
-Baeck, Louis. The Mediterranean Tradition in Economic Thought. London: Routledge, 1994. -Lewis, Bernard. The Middle East: 2000 years of History from the Rise of Christianitt to the present Day. London: Weidenfeld & Nicolson, 1995.

تـاوتوێی ئـەوەیان کـردووە کـە ئیـسلام ڕۆڵێکـی ئـەرێنی گێـڕاوە، بـەو سیفەتەی "چۆنیەتییەکی دەرچوونی هاندەر بووە" لە ڕابوونی کۆمەڵگا ئیـــسلامییەکان، توانیویـــەتی ڕووبەڕووبوونـــەوەی ســـەخت ببڕێـــت و پێشکەوتنێکی خێـرا لـە هـەموو بوارەکـانی ژیانـدا بـەدیبهێنێت. ئەگـەر ئیـسلام نەبووایـە، ئەمـە ڕووی نـەدەدا. وەك تـوینبی دەڵێـت: "ئـەو بڵاوبوونەوە لە سنووربەدەرەی هێزێکـی ڕۆحیـی شـاراوە کـە ئیـسلام و پەیامەکەی تێدا بەرجەستە دەبێت، لە ماوەی شەش سەدەدا."(1) ئیسلام چۆن توانی ئەم گۆڕانە شۆڕشگێڕانەیە لەم کۆمەڵگایەدا بەدیبهێنێت؟

ئـــەوەی ئیـــسلام کـــردی، بریتـــی بـــوو لـــە چـــالاککردنەوەی هـــەموو هۆکارەکـــانی پێـــشکەوتن و ئاراســـتەکردنی بـــە ئـــەرێنی. گرنگییـــەکی لەڕادەبـــەدەری بـــە میللـــەت دا، کـــە بریتییـــە لـــەو هێـــزە بنەڕەتییـــە شاراوەیەی لە پشت ڕابوونی یاخود کەوتنی هەر میللەتێکەوەیە. هەوڵی ڕابوونی ڕەوشت و ماددیی میللەتی دا، تاکەکانی وا لێکرد کە باشتر بـن لەوەی کە تێیدان، چاکسازیشی لـە هـەموو ئـەو دامەزراوانـەدا کـرد کـە

---

1 Toynbee, A Study of History, abridgment by D. C. Somervell, Volume 2, p. 30.

بایك Baeck دووپاتی دەکاتەوە کە: "ئیسلام وای لێ کردن (عـەرەب) هێزێکـی جیهـانی بـن و ڕووناکییەکی هێمن بن بۆ بەشێکی گەورەی دەریای ناوەڕاسـت، لـە قۆنـاغی گواسـتنەوە لـە دوا سەدەی کۆندا تاوەکو سەرهەڵدانی ڕۆژئاوای لاتین لە سـەدەی بیـستەمدا، ئیـسلام لـە ئەوپـەڕی سەرکەوتنیدا بوو و ڕۆڵێکی دیاری لە پێکهێنانی ڕۆشـنبیریی دەریـای ناوەڕاسـت و مێژووەکەیـدا بینی. بڕوانە:

.Baeck, Louis. The Mediterranean Tradition in Economic Thought, p. 95-

کاریگــەریی لەســەریان هەیــە. تێڕوانینــە جیهانییــە شــۆڕگێڕانەکەی، تێڕوانینی بەرانبــەر ژیــان گــۆڕین، بــەوەی مانــا و ئامــانجی پێبەخــشی، هەموو تاکەکانیشی یەکسان کرد بەوەی کە هەموو جێگــرەوەی خــودان کە دروســتی کــردوون و هــەموو جیهانیــشی دروســت کــردووە، ئەمــەش هەســتێکی زیــاتری شــکۆ و یەکــسانی و ڕێــزی خــودی خۆیانیــانی پــێ بەخشین، بە بێ گوێدانە ڕەچەڵەك و ڕەگەز و سامان و پلــە و پایــەیان، ئەم ڕاستییە واقیعییە بووە نموونەی باڵایان لە ڕێگەی پێدانی پلەی باڵا بەو کەسانەی کــە پێــشتر دەچەوســێنرانەوە و ســتەمیان لــێ دەکــرا.[1] ئیسلام پیرۆزییەکی بە ژیان و موڵك و ئابووریی تاکەکان بەخشی، ڕێز و شکۆیشی بۆ مەعریفەت گەڕاندەوە، بەوەی لە یەکەم سروشــی قورئانــدا هاتووە و جەخت لــە گرنگیپێــدانی دەکاتــەوە.[2] پێگەیــەکی بــەرزی لــە ڕێزگرتندا بە ئافرەت داوە و بە "ئەمانەتی خــوا" و خوشــکی پیاوانیــان دادەنێــت، نــەك کــەنیزەکیان بێــت. پێغەمبــەر (درودی خــوای لەســەر) دەفەرموێت: "فاتقوا الله في النساء فإنكم أخذتموهن بعهد الله واسـتحللتم فروجهن بكلمة الله".[3] "إنما النساء شقائق الرجـال".[1] داوا لــە پیــاوان

---

[1]. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِنَّا لَجَمِيعٌ حَاذِرُونَ﴾. الشعراء/٥٦

[2]. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿ اقْرَأْ وَرَبُّكَ الأَكْرَمُ (٣) الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ (٤) عَلَّمَ الْإِنْسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ﴾. العلق /٣ـ٥.

[3]. جابری کوڕی عەبدوڵا بە بەڵگە هێناویەتیەوە لەلایەن موسلیمەوە لە صەحیحەکەیدا، بڕوانە:

دەكات مامەڵەی باشیان لەگەڵدا بكەن.[٢] چاودێریكردن و پەروەردەی گونجاو بۆ مندالآن، یەكێكە لە ئامانجە سەرەكییەكانی شەریعەت، لە پێناو دابینكردندا، چونكە نەوەی ئایندە دەتوانێت بە شێوەیەكی كاریگەر ئالآی پێشكەوتن هەڵبگرێت. هاوسەنگییەكی لە نێوان لایەنەكانی ژیانی مادی و ڕۆحیدا دروستكردووە و بە بابەتێكی سەرەكییان دادەنێت بۆ پێشكەوتن و خۆشگوزەرانیی مرۆڤایەتی. بۆیە پێگەیەكی بەرز و شەرەفمەندانەی بە جووتیار و پیشەوەر و بازرگان داوە، بە بەراورد لەگەڵ دابونەریتی مازدی، یان مەسیحییەكان، كە ئەو كاتە باو بووە. گوێڕایەڵی بۆ خوا، خرایە جێگای گوێڕایەڵی بۆ هۆز، بەم شێوەیە ئاسۆی تاك فراوانتر بوو تاوەكو هەموو ئوممەتی گرتەوە، كە

---

ـ القشيري، مسلم بن الحجاج. صحيح مسلم، تحقيق: محمد فؤاد عبدالباقي، بيروت، دار إحياء التراث العربي، (د. ط)، (د. ت)،، بەش٢ ، ل ٨٨٦، فەرموودەی ژمارە ١٢١٨ .

[1]. ئەبو داود لە سونەنەكەیدا و ترمزی لە جامیعەكەیدا و ئەحمەد لە مەسنەدەكەیدا ڕیوایەتیان كردووە، بڕوانە:

ـ السجستاني، سليمان بن الأشعث. سنن أبي داود، تحقيق: محمد محيي الدين عبدالحميد، بيروت، دارالفكر، (د. ط)، (د. ت). بەش١، ل ١١١، فەرموودەی ژمارە ٢٣٦.

ـ الترمذي، الجامع الصحيح، سەرچاوەی پێشوو، بەش١، ل ١٨٩، فەرموودەی ژمارە ١١٣.

ـ الشيبانی، أحمد بن حنبل. مسند الإمام أحمد بن حنبل، تحقيق: شعيب الأرناؤوط وآخرون، بيروت، مؤسسة الرسالة، ط٢، ١٤٢٠هـ ١٩٩٩م، بەش٤٣، ل ٢٦٤، فەرموودەی ژمارە ٢٦١٩٥ .

[2]. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَنْ تَرِثُوا النِّسَاءَ كَرْهًا وَلَا تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُوا بِبَعْضِ مَا آتَيْتُمُوهُنَّ إِلَّا أَنْ يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ فَإِنْ كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئًا وَيَجْعَلَ اللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا﴾. النساء /١٩.

هەموو تاکەکانی باوەڕیان بە هەمان ئایین هەبوو، پاشانیش هەموو میللەتان بگرێتەوە، کە هەموو تاکەکان بە برای یەك دادەنێت، چونکە هەموویان جێگرەوەی خودان.

کاهن (Cahen) ڕاست دەکات کاتێ کە دەڵێت: "لەبەرئەوەی ئارەزووی نادیار بۆ یاسای قورئان سۆز و بەزەییە بەرانبەر بێبەشەکان[1]، بۆیە یەکێك لە هاوبەشییە دیارەکانی ئیسلام بریتییە لە بەرزکردنەوەی بەهای لاواز و چەوسێنراوەکان، ئەمەش ئیسلام کردی لە ڕێگەی لابردنی دەوڵەمەند و خاوەن دەستەڵاتەکانەوە نەبوو، یاخود لە ڕێگەی نەهێشتنی موڵکی تاکەکەسی و چۆنیەتی بازاڕەوە، بەڵکو لە ڕێگەی دابینکردنی دادپەروەری و بیمەی کۆمەڵایەتی و خۆشگوزەرانی بۆ هەموانەوە بوو - لە ناو ئەمانیشدا ئافرەتان و منداڵان - لە میانەی چاکسازیی ڕەفتار و دامەزراوەکانەوە، کە وای لە تاك کرد هۆشیار بێت بۆ ئەرکەکانی بەرانبەر برا مرۆڤەکانی، لە کاتێکدا هەوڵدەدات بەرژەوەندییە تایبەتییەکانی خۆی لە بازاڕدا دەستبکەوێت. ئەمانە هەمووی یارمەتیدەر بوون بۆ زیاتر پابەندبوونی خەڵکی بە ئایینەکەیانەوە، هاندانێکی لا دروستکردن کە پابەند بن بە یاسا و ڕێساکانەوە، بەڵام ئەمە تەنیا خۆی لە خۆیدا بەس نییە، بۆیە ئیسلام

1. Cahen, Claude. "Economy, Society, Institutions. " In P. M. Holt, Ann Lambton and Bernard Lewis (eds. ), The Cambridge History of Islam. Cambridge: The Cambridge University Press. 1970, Volume 2, p. 542

زیاد لە ئەمەی بە ئەنجام گەیاند، کاتێ حکومەتێکی کارامـەی پێکهێنـا، نەك تەنیا بڵاوکردنەوەی یاسا و سیستمی تێدا بـوو، بـەڵکو دادوەری و بەرزکردنـەوەی ئاسـتی کۆمەڵایـەتی ـ ئابووریـشی تێـدا بـوو. هـەروەها ئازادیی بۆ هەموو تاکێك لە سنووری سیستمی ڕەوشتیدا فەراهەم کرد و گەندەڵی و دەستبەسەراگرتن و زۆرداریی قەدەغـە کـرد.[1] سیـستمێکی دادوەریی دانا کـە یاسـا تێیـدا بـە یەکـسانی بەسـەر گـەورە و بـچووکدا جێبەجێ دەکرا. سەرکەوتنی هەردوو سیستمی سیاسی و دادوەری، بـە شـێوەیەکی سـەرەکی بـۆ ئـەو شۆڕشـە ڕەوشـتییە دەگەڕێتـەوە کـە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) بەدەستی هێنا. ئەو کەسانەی کە پلـە و پایەی باڵایان هەبوو و بە توانا و کارامـە بـوون و ڕەوشتیـشیان بـەرز بـوو، پـاك و نییـەت پـاکیش بـوون و دووربـوون لـە گەنـدەڵی. بیـسلی (Besley) لە وتارێکی نوێدا گەیـشتە ئـەو ئەنجامـەی کـە: "سروشـتی کاری حکومەت پشت بەو کەسانە دەبەسـتێت کـە بـەڕێوەی دەبـەن" و هـەروەها " هـیچ کۆمەڵگایـەك نییـە بتوانێـت دامـەزراوە گـشتییەکانی بەڕێوە ببات، ئەگەر ئاگاداری ئەو کەسانە نەبێت کە لە پۆستی گشتیی

---

1. برنارد لویس وای دەبینێت کە: "نەریتی ئیسلام. . . بە توندی حکومەتی زۆردار و ستەمکار ڕەتدەکاتەوە. ژیان لە سایەی دادپەروەریدا نزیکە لەو شتەی کـە ئێمـە پێـی دەڵـێین ئـازادی".

بڕوانە:

-Lewis, Bernard. The 2007 Irving Kristol Lecture by Bernard Lewis. Posted on the internet 20 March 2007. http://www. aei. org/article/society-and-culture /the -2007-irving-Kristol-lecture-by-bernard-lewis .

بالآدان و نوێنەرایەتیی کێش دەکەن".[1] بەم ڕێگەیە دڵسۆزی لە کاری پێداویستییە دامەزراوەییەکاندا بەرەو پێشکەوتنی برد، کە نۆرس (North) تازە ئەمە پشتڕاست دەکاتەوە.[2] بۆیە شاتزمیلەر (Schatzmiller) ڕاستی کرد کاتێك وتی: "هەموو ئەو هۆکارانەی ئەوروپایان سەرخست، پێشتر و بە ماوەیەکی دووردرێژ لە ئیسلامدا هەبوون".[3]

## یەکەم: گۆڕینی مرۆڤ و دامەزراوەکان

گۆڕانی مرۆڤەکان و دامەزراوەکانیان - لە میانەی "خێرا بڵاوبوونەوەی هێزێکی ڕۆحیی شاراوە" کە لە سایەی بڵاوبوونەوەی خێرای ئیسلامەوە - بە ئەنجام گەیشت، هەندێ بابەتی دەرەکیی ئیجابیی دروست کرد، هۆزەکان کە ماوەی چەند سەدەیەك دەجەنگان، ئێستا پەیوەندیی برایەتی بە یەکەوەی بەستوونەتەوە، ئەمەش بووە هۆکارێك بۆ دروستبوونی حکومەتێکی باش کە نوێنەریان بێت و بەهێز و دامەزراو و "کارامە و چاك بێت". لە سەرەتادا خەڵکی خۆڕسکانە پشتگیرییان دەکرد، چونکە دەیانزانی لە ئامانج و خواستەکانیدا

---

[1]. Besley, Timothy. " Political Selection. " Journal of Economic Perspectives, 19:3. Summer, 2005, p. 43 and 58.

[2]. North and Thomas, The Rise of the Western World, p. 2-3 ; and North, Douglass C. Institutions, Institutional Change, and Economic Performance. Cambridge: Cambridge University Press, 1990, p. 3-10.

[3] . Schatzmiller, Maya. Labour in the Medieval Islamic World. Leiden: Brill, 1994, p. 405.

دڵسۆزە و کار بۆ بەرژەوەندیی هەموو خەڵکی دەکات، نەك گرووپێك. ئەمە یارمەتیی بڵاوبوونەوەی یاسا و ڕێنماییەکانی دەدا، هەروەها ئاسایشی ژیان و ماڵومولك و بازاڕێکی ڕێکوپێك ـ کە بە ویژدانەوە کار دەکەن، بە گیانێکی کێبڕکێ ـ بە درێژایی شەقامە کۆنە بازرگانییەکانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاست. ئەم شتە لە پێشوودا کارێکی ئاسان نەبوو، بەهۆی ناکۆکیی هۆزەکان کە لە زووەوە لە وڵاتی عەرەبدا بڵاوبووبووەوە، جەنگی وێرانکاری نێوان ساسانی و بیزەنتینییەکانیش کە باجێکی زۆریان دەسەند بۆ خەرجیی شەڕەکانیان، بووبووە ڕێگر لەبەردەم پێشکەوتندا.

ئەو ناوچەیەی لەژێر دەستەڵاتی ئیسلامدا بوو، بازاڕێکی هاوبەشی فراوان و ئابووریی دراو و جموجووڵی ئازاد و دڵنیایی لە کاڵا و سەرمایەکانی هەبوو، بەردەوام گەشەی دەکرد. ئەمە بووە هۆکارێك لە پاڵ ڕێژەیەکی کەمی باج، بۆ پێشکەوتنێکی گشتگیر لە کشتوکاڵ و کاری پیشەیی و بازرگانیشی گرتەوە، کە بووە هۆی بەرزبوونەوەی داهاتی هەمووان. هەموانیش سوودیان لە پێشکەوتنەکە بینی، ئەگەر بە پلەیەکی باشیش – وەك ئەوەی ئیسلام داوای دەکات – یەکسانیی تێدا نەبووبێت. هەروەها بڵاوبوونەوەی دادپەروەری هاندەرێك بوو بۆ ڕاستگۆیی و دەستپاکی و کاری ڕێکوپێك و کۆکردنەوەی سەرمایە و پێشکەوتنی تەکنۆلۆژیا، هەروەها زۆربوونی دەزگاکانی خوێندن و

تــەکنۆلۆژیا، بوونــە هــۆی باشــتربوونی پــسپۆڕیی خــەڵکی، ســەرەڕای پێشکەوتنی فیکری و تەکنۆلۆژی.

لە ڕووانگـەی بیردۆزەکـەی ئـیبن خەلدونـەوە، دەتـوانین بڵـێین ئـەم دەمەزەرکردنەوەیەی هێزی میللەت، کە ئیسلام دروستی کرد، لە ڕێگەی بەها و دامەزراوە پەیوەندیدارەکانەوە بوو، بە یەکسانی و سەپاندنێکی کاریگــەر لەلایــەن دەســـتەڵاتی سیاســـی و دامەزراوەکانیــەوە، کــە دادپەروەری و دەستەڵاتی یاسای بۆ هـەموو ئاسـتەکانی میللـەت دابـین کردبوو. ئەمەش تەنیا هاوکاری و متمانەی بۆ میللەت دابـین نـەکردبوو، بەڵکو ڕۆڵێکی ژیاریی گەورەی لە پێشکەوتنی شارستانییەتی ئیسلامیدا لـە هـەموو لایەنـەکانی ژیانـەوە بینـی، لەگەڵیـشیاندا لایـەنی ئـابووری. ئەمەش ئەوە ناگەیـەنێت کـە بـارودۆخێکی نموونـەیی خولقـابوو، بـەڵام مانای وایە کە هێـزی ئـەرێنی کـە هاوکـارە بـۆ پێـشکەوتنی کۆمـەڵگای ئیـسلامی، هێزێـك بـوو کـە پارسـەنگی کاریگـەریی هێـزە نەرێنییـەکان دەبووەوە.

**دووەم: ئەو پێشکەوتنەی لە بواری کشتوکاڵ و گونددا هاتەکایەوە**

کۆمـەڵگا کۆچـەری و گونـدەکان، لـەو ڕۆژانـەدا سـوودمەندی یەکـەم بــوون لـــە فراوانبــوونی فتوحــات و گەشـــەکردنی خێــرای کــشتوکاڵ، بەرزبوونــەوەی ئاســتی کۆمەڵــەگای گونــدەکان پاڵپــشتێك بــوو بــۆ

پێشکەوتن، هەر وەك لە نزیکەی هەموو کۆمەڵگاکانی تردا ڕووی داوە.[1] ئەم ڕۆڵە هاندەرەی کە کشتوکاڵ بینی، لە سەرەتایەکی پێشوەخت لە کۆمەڵگای ئیسلامیدا چاوەڕوانکراو بوو، وەك ژمارەیەك لە زانایان ڕوونیان کردووەتەوە. بۆ نموونە: خەلیفە موعتەسیمی عەباسی (٢٢٧ ك/ ٨٤١ ز کۆچی دوایی کردووە) دەڵێت: "بابەتی زۆر باشی تێدابوو، یەکەمیان پێشکەوتنی زەوی کە خەڵکی پێی دەژییێت و خەراجی لێ دەردەکەن، کە پارە زۆر دەبێت و ئاژەڵان پێی دەژین، هەروەها نرخ دادەبەزێت و دەستکەوت زیاد دەکات و بژێوییش فراوان

لەگەڵ بڵاوبوونەوەی ئیسلام، کتوپڕ ژیان لە هەردوو کەرتی کشتوکاڵ و گونددا زیندوو بووەوە. لە ئەنجامی پابەندبوون بە ڕێنماییە یاسایی و فەرمییەکانەوە، هەردووکیان بەهێز و چالاك بوون. بازاڕیش بە شێویەکی بەرفراوان کرایەوە، بێ ئەوەی ترسی چەتە و ڕێگریان هەبێت کە ڕێگری لە کاروانەکانیان بکەن، یاخود بە زۆر سەرانەیان لێ بستێنن.

---

[1]. بانکی نێودەوڵتی ئاماژەی پێ داوە و دەڵێت: نزیکەی لەو هەموو وڵاتانەی کشتوکاڵ تێیاندا بەهێز بووە، گەشەی ئابووری بە ڕێژەیەکی خێرا پێشکەوتووە، هەروەها: "لە کاتێکدا ڕۆڵی کشتوکاڵ لە گەشەپێداندا لە ماەی سەدان ساڵدا جێگەی مشتومڕ بووە، بەڵگە کۆن و هاوچەرخەکان، وەك یەك پشتگیریی ئەمە دەکەن، بۆ نموونە: لە ئەوروپا و ژاپۆن و ویلایەتە یەکگرتووەکان، هێزی کشتوکاڵ لە پرۆسەی پیشەسازی و گەشەپێدان نزیکبووەتەوە". بڕوانە:

-World Bank. World Development Report, 1982, p. iii and 39.

[2]. بە بەڵگە هێناویەتیەوە: المسعودي، مروج الذهب ومعادن الجوهر. سەرچاوەی پێشوو، بەرگی ٤، ل٤٧. ئەو وشە بەهێزەی موعتەسیم بەکاریهێناوە بریتی بوو لە (عمران) مەبست لێی پێشکەوتن بوو، بەڵام لە چوارچێوەی وتەکەیدا سەرەڕای پیشکەوتنی موسڵمانان لەو کاتەدا، لەوانەیە هێمایەك بێت بۆ کشتوکاڵ.

ئەمە وای لە هەمووان کرد چی لە توانایاندا بێت لە پێناو پێشکەوتنی خۆیان و کۆمەڵگاکەیان ئەنجامی بدەن.

بۆ دووپاتکردنەوەی دادوەری، کە ئیسلام داوای دەکات، پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) و هەر چوار خەلیفەی ڕاشیدین، پشتیان بە شێوازێکی زیاتر مرۆییانە بەست، کە زەوییە کشتوکاڵییەکانیان لە کاتی فتووحاتدا لای خاوەن زەوییە ڕەسەنەکان و جووتیارەکان هێشتەوە، بە پێچەوانەی هەڵسوکەوتی بیزەنتی و ساسانییەکانەوە کە زەوییەکانیان لە خاوەنەکانیان و جووتیارەکان دەسەندەوە و بەسەر پلەدار و سەربازەکانیاندا دابەش دەکرد.[1] هەموو ئەو جیاکردنەوە و دابەشکردنی زەوییانەی پێی هەڵدەستان، قەوارەکانیان تا ڕادەیەك بچووك بوون، لەو زەوییانەش ئەنجام دەدرا کە نەچێنرابوون و خاوەنیان نەبوو، ڕێگەش بە موسڵمانەکان نەدەدرا زەوی لە خاوەنە ڕەسەنەکانیان بکڕن.[2] ئەم سیاسەتە مرۆییانە ڕێگەی لە موسڵمانەکان نەگرت کە نەبنە ئاغا و دەرەبەگ، بەڵکو یارمەتیی دان بەردەوام بن لە

---

[1] . See: Hodgson, The Venture of Islam, Volume 1, p. 242 ; and Haque, Ziaul. Landlord and Peasant in Early Islam. Isalamabad: Islamic Research Institute, 1977. See also Cahen, Claude. " Kharaj in the Central and Western Islamic Lands. " The Encyclopedia of Islam, Leiden: Brill, 1990, Volume 4, p. 1031 ; and Lambton, Ann K. S. "Kharaj in Persia. " The Encyclopedia of Islam, Leiden: Brill, 1990, Volume 4, p. 1045

[2] . بروانە: ـ ابن ابراهيم، أبو يوسف يعقوب. كتاب الخراج، القاهرة، المطبعة السلفية، ط٢، ١٣٥٢ هـ، ل٢٤ وما يليها.

ـ القرشى، يحيي بن آدم. كتاب الخراج، تحقيق: أحمد محمد شاكر، القاهرة، المطبعة السلفية، ط٢، ١٣٨٤ هـ، ل ٤١ـ٤٢.

-Haque, Landlord and Peasant in Early Islam, p. 171.

-Cahen, "Economy, Society, Institutions. ", p. 571.

بەڕێوەبردن و ژیـانی ئـابووری لـەو زەوییانـەی فـەتح گرتوونیەتییـەوە، هەروەها ئەم سیاسەتە مرۆییانە پاڵپشتیش بوو بـۆ دادوەری لـە نێـوان هەرێمەکاندا، سەرەڕای بەدیهێنانی یەکسانی کە ئیـسلام بانگـەوازی بـۆ دەکات.[1] جێبەجێکردنی ڕێنمایی دەستکەوت (الفـيء) لەسـەر زەوییـە کشتوکاڵییەکان، ئەوانەی فـەتح گرتوونیەتییـەوە، مانـای دابەشـکردنی بەرهەمە لە نێوان دەوڵەت و جووتیارەکاندا، داوا لە جووتیارەکان دەکرا کە بەشی دەوڵەت بدەن وەك باج، پێی دەوترا (الخراج). ئـەم بەشـەش یاخود ئەم باجە، لەوپەڕی دەستەڵاتی ئیسلامدا بە ڕێژەیـەکی زۆر کـەم بوو، لە نێـوان ٥٪ بـۆ ١٠٪ی کـۆی بەرهەمـەکان بـوو، هـەر ئەمـەش لـە حاڵەتی زەوی (العشری)دا کاری پێ دەکرا.[2]

لەبەرئەوەی باجەکان بڕێکی گەورە و قورس و هەمیـشەیی نـەبوون، بـەڵکو ڕێژەیـەکی بـچووکی دەسـتکەوتی بەرهـەم بـوو، کاریگەرییـەکی ئەوتۆی لەسەر جووتیار نەبوو، مەگەر ئەو ساڵە بەروبووم کـەم بووایـە.

---

[1]. القرشی، کتاب الخراج، سەرچاوەی پێشوو، ل ٥٢ و١٥٧ و١٥٨.

[2]. ابن سلام، أبو عبيـد القاسـم. كتـاب الأمـوال، تحقيـق: محمـد خليـل الهـراس، القـاهرة، مكتبـة الكليـة الأزهرية، ١٩٦٨، ص ٥٩ – ٦٦. بە تایبەتی بڕوانە بڕگەکانی ١١٠ و١١٤ و١١٨. هەروەها بڕوانە:

– ابن ابراهیم، کتاب الخراج، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٤ و دواتریش.

– القرشي، کتاب الخراج، سەرچاوەی پێشوو، ل٤١–٤٢.

-Hitti, History of the Arabs, p. 349 and p. 384 -386.
-Cahen, " Kharaj in the Centeral and Western Islamic Lands. ", p. 1031.
-Lambton, Ann K. S. "Kharaj in Persia. ", p. 1038.
-Haque, Landlord and Peasant in Early Islam, p. 171.

لە کاتی ڕوودانی کارەساتە سروشتییەکانیشدا، وەك لافاو و وشکەساڵی و فـەوتانی کـشتوکاڵ بـەهۆی نەخۆشـی و دەردی سروشـتییەوە کـە چارەسەری نەبێت، جووتیارەکان لە خەراج دەبووردران، پشتبەست بە ڕێنماییەکانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) و پـەیڕەوکردنی لەلایـەن خەلیفەکانی ڕاشیدییەوە.[1] بێجگـە لـەوەی ئـەم کـردارە بـۆ ماوەیـەکی درێـژ بـەردەوام بـوو، سـەرەڕای بەرزبوونـەوەی ڕێژەکـەی بـە هـاتنی سـەلجووقییەکان (٤٤٧-٥٩٠ك / ١٠٥٥-١١٩٤ز) بـۆ دەسـتەڵات، ئـەو "باجەی دەستەڵاتی سەلجووقی بەسەر مەسیحییەکاندا سـەپاندبووی" لەوانەیە "کەمتر بووبێت لەو بڕەی کە یاسای دارایی بیزەنتیی تێکشکاو پێشتر سەپاندبووی".[2]

ڕێژەیـەکی کـەمی بـاجیش دەبێتـە بـارگرانی، ئەگـەر داهـاتێکی بەسوودی ڕاسـتەوخۆ یـان ناڕاسـتەوخۆی نـەبێت بـۆ ئەوانـەی باجەکـە وەردەگرن. بۆیە شەریعەتی ئیسلامی پابەندبوونێکی ڕەوشـتیی بەسـەر دەوڵەتـدا سـەپاند، کـە بەنـداو و جۆگـەی ئـاودێران دروسـت بکـات و پارێزگاریشیان بێت، بەمەبەستی باشترکردنی بەرهـەمی زەوییـەکان.[3]

---

[1] . ابن ابراهیم، کتاب الخراج، سەرچاوەی پێشوو. هەروەها بڕوانە:
-Aghnides, Nicholas P. Mohammedan Theories of Finance with an Introduction to Mohammedan Law and a Bibliography. New York: Columbia Univeristy, 1916, p. 389.

[2]. Bosworth, C. E. " aljuqids. " In The Encyclopedia of Islam. Leiden: Brill, 1995, Volume 8, p. 959.

[3] . ئەم دووپاتکردنەوەیە لەم سەرچاوانەدا ڕووندەبێتەوە:

داهاتــەکانی خــەراج بــۆ پاڵپــشتیکردنی خۆشــگوزەرانیی گــەل لــە چوارچـێوەی خـەرجیی گشتیدا بـەکار دەهێنـران، وەك: بنیاتنانـەوەی بنیاتە سەرەکییە ماددی و کۆمەڵایەتییەکان و چاککردنەوەیان. مێژووی ئومەوییەکان و عەباسییەکان و فەرمانڕەواکانی تر، تا دەگاتە سەرەتای عوسمانییەکان، نمونەیەکی ڕوونن لـە دروسـتکردنی پـرۆژەی ئـاودێریی بەرفراوان لەسەر ڕووباری دیجلە و فورات و خاپوور و سەخت و بەردین، هەروەها پارێزگاری پێویست بۆیان.[1] بنیاتنانی کەناڵە درێژەکانی ئاوی ژێرزەوی، کە هەندێ جار شاخیان بۆ بڕیوە، تاوەکو ئـاو لـە سەرچـاوە شـاخاوییەکانەوە بـۆ ماوەیـەکی دوورودرێـژ بەسـەر گـرد یـان دەشـتدا بگوێزنەوە.[2] مەقریزی (٨٤٥ ك/ ١٤٤٢ز کۆچی دوایی کردووە) ئاماژەی بەوە داوە کە ڕۆژانە ١٢٠ هەزار کرێکار لە دۆڵی نیلدا کاری چاککردنەوە و پاریزگاریکردنیان دەکرد.[3]

ســەپاندنی بــاجێکی دادپەوەرانــە و بــەکارهێنانی داهاتــەکانی بەمەبەستی ئاوەدانکردنەوە، دوو هۆکار بوون بۆ ئـەوەی جووتیارەکـان دەســتەڵاتدارانی موســڵمانانیان لــە دەســتەڵاتدارانی بیزەنتــی و

– ابن ابراهیم، کتاب الخراج، سەرچاوەی پێشوو. هەروەها له (کتابات کبار الفقهاء).
- Shihabi, Mustafa al-, et al. " Filaha. " The Encyclopedia of Islam. Leiden: Brill, 1965, Volume 2, p. 901.

1 . Shihabi, Mustafa al-, et al. " Filaha. " The Encyclopedia of Islam. Leiden: Brill, 1965, Volume 2, p. 901.

2 . Hodgson, The Venture of Islam, Volume 1, p. 301.

٣. المقريزی، تقي الدين أحمد بن علي. الخطط المقريزية، بيروت، دار الصياد، د. ت، بەرگ ١، ل ٧٤.

ساسانییەکان پێ باشتر بێت، چونکە ئەمانەی دوایی باجێکی زۆر و بڕێکی دیاریکراویان دەسەپاند و داهاتەکەشیان بۆ پشتگیریی خۆشگوزەرانیی گەل نەبوو. سەرەڕای ئەمەش، جووتیارەکانیان ناچار دەکرد سەرەڕای کەمیی بەروبوومیان لەو ساڵانەدا، ئەو بڕە باجە بدەن، ئەمەش بە پێی هەندێ مەرجی ناحەق جێبەجێ دەکرا.(١)

یاسای باجەکان تا ماوەی یەکەمی دەستەڵاتی عوسمانییەکان لە بەرزبوونەوە و دابەزیندا بوو و قورساییشی کەمتر بوو، تا ئەو کاتەی سوڵتانەکان دەیانویست دەستوپێوەندی خۆیان لە هەموو جۆرە ستەم و خراپەکارییەك بپارێزن.(٢) لەوانەیە ئەو هۆکارە بێت کە وای لە مارتن لۆسەر کرد ساڵی ١٥٤١ز دەستەڵاتدارانی ئەوروپا لەوە ئاگادار بکاتەوە کە ئەو خەڵکە هەژارەی لەلایەن میرە چاوچنۆك و دەرەبەگ و نیشتەجێ خۆشگوزەرانەکانەوە دووچاری چەوساندنەوە دەبن، ژیانی ژێر دەستەڵاتی تورکەکانیان پێ باشترە لەبری نموونەی ئەم مەسیحییانە.(٣)

---

1 . See Watson, Andrew M. Agricultural Innovation in the Early Islamic World: The Diffusion of Crops and Farming Techniques: 700-1100. Cambridge: Cambridge University Press, 1983 ; and Cahen, " Kharaj in the Central and Western Islamic Lands. ", p. 1031.

2. See: Inalcik, Halil and Dovald Quataert (eds. ). An Economic and Social History of the Ottoman Empire, 1300-1914, p. 16-17.

3 . Cited by Lewis from Luther>s " Admonition to prayer against the Turks ". See: -Lewis, Bernard. The Middle East: 2000 years of History from the Rise of Christianity to the Present Day. London: Weidenfeld & Nicolson, 1995.

ڕەنگە ئەم سیاسەتە مرۆییە بەسۆزە، یەکێك لە گرنگترین هۆیەکان بووبێت بۆ شۆڕشی کشتوکاڵی کە لە جیهانی ئیسلامیدا ڕووی دا.(١) ئەم سیاسەتە جووتیارەکانی هان دا و وای لێکردن زەوییەکانیان و ئامێرەکانیان بە شێوەیەکی کاریگەرتر بەکاربهێنن. تەکنیکی نوێیان خستە ناو کشتوکاڵەوە و بەروبوومی زۆری نوێیان چاند، لە بەکارهێنانی ئاویشدا پێشکەوتنێکی بالآیان بەدەستهێنا. واتسۆن (Watson) دەڵێت: "زۆربوونی بەرهەمی خواردەمەنی لە ئەنجامی شۆڕشی کشتوکاڵییەوە زۆر بوو، بە پلەیەك نەك هەر خواردەمەنی بۆ ژمارەیەکی زۆری دانیشتووانی گوندەکان دابین دەکرد، بەڵکو بۆ دانیشتووانی شارەکانیشی دابین دەکرد".(٢) ڕەنگە ئەمە یەکێك لە هەرە گرنگترین هۆکاری بەرپرس لە "جێگیربوونێکی لەڕادە بەدەر لە نرخی گەنمی میسریدا لە سەدەی شەشەمەوە تاوەکو سەدەی نۆیەم"(٣)، بێت.

## سێیەم: پێشکەوتنی شارستانی

پێشکەوتنی گوندەکان گوازرایەوە بۆ هەموو کەرتەکانی ئابووری و **کۆمەڵگاکانی** دی، بووە هۆی فراوانبوونێکی گەورەی شارستانییەت و پێشکەوتنی پیشەوەری و پیشەسازیی شارستانی. "کۆمەڵگای

---

[1] . بۆ زانینی زیاتر دەربارەی شۆڕشی کشتوکاڵی، بڕوانە:
Cahen, " Economy, Society, Institution. ", p. 512 ; and Watson, Agricultural Innovation in the Early Islamic World.

[2] Watson, Agricultural Innovation in the Early Islamic World. P. 45.

[3]. Cahen, " Economy, Society, Institutions. " p. 512.

ئیسلامی گواستنەوەیەکی لە کشتوکاڵەوە بۆ پیشەسازی بەدی هێنا، چەند لایەنێکی پیشەیی هێنایە کایەوە کە پێشتر نەبوون".[1]

گواستنەوەی پێشکەوتنی کەرتێك بۆ کەرتێکی دی لەگەڵ تێپەڕبوونی کاتدا، یەکێکە لە کۆڵەکە گرنگەکانی بنیاتنان بە هۆی هۆکارە بازنەییە دووبارەییەکان و دینامیکیەتی کۆمەڵایەتی - ئابووری و سیاسییەکەی ئیبن خەلدونەوە. ئەم بازاڕە هاوبەشە فراوانە، بووە هۆی جموجووڵێکی ئازادی کاڵا و سەرمایە و کرێکار و خاوەن پرۆژەکان، فراوانبوونی ئابووری ناوەوە و دەرەوە. بناغەی پەیوەندیی ئابووریی ناوەوەی ئیمپراتۆرییەتیش لەگەڵ جیهانی دەرەوە دانرا.[2] چالاکییە ئابوورییەکان فراوانبوونیان بە خۆوە بینی، تا لە سەردەمی هاروونە ڕەشیددا (١٧٠-١٩٣ك/٧٨٦-٨٠٩ ز) گەیشتە چڵەپۆپە. بەم ڕێگەیە ئەو هێزە گەورە شاردراوەیە بە شێوازێکی نموونەیی بۆ پێشکەوتن بەکار هێنرا، عێراق بووە مەڵبەندێکی ئابووری و دارایی جیهانی.

---

1. Schatzmiller, Labour in the Medieval Islamic World, p. 399-400.

2. Cahen, " Economy, Society, Institutions. ", p. 516.

## چوارەم: پێشکەوتنی فیکری

پێشکەوتنی گوند و شارەکان، پاڵشت بوون بۆ هێنانە کایەی "ڕۆشنبیرییەکی شارستانیی پێشکەوتووی جۆراوجۆر".[1] هەروەها بوونی یارمەتیی دارایی بۆ فێرخواز و زانایان لە پاڵ کارئاسانیی پێویست بۆیان، فەراهەمکردنی ژینگەیەك بۆ چالاکیی فیکریی باش، سەرەڕای لێبووردەیی کە بارێکی خوڵقاندبوو "لەو کاتەدا لە هەموو ئەوروپاشدا نموونەی نەبوو"، وای لە جیهانی ئیسلامی کردبوو کە ببێتە شوێنی دیداری زانایان لە هەموو بوارەکان و لایەنەکاندا (لە موسڵمان و مەسیحی و جوولەکە و زەردەشتی و صابیئە).[2] گفتوگۆی ئازاد دەربارەی هەموو بابەتە فیکرییەکان ئەنجام دەدرا، کە بووە هۆی پێشکەوتنێکی فیکریی گشتگیر. جیهان "ڕابوونێکی فیکریی زۆر گرنگی"[3] بەخۆوە بینی. بە تایبەتی لە سەردەمی هاروونە ڕەشیددا (١٧٠-١٩٣ك/٧٨٦-٨٠٩ز)، کە نزیکەی چارەکە سەدەیەکی خایاند،

---

1 . Lewis, Bernard. "Abbasids. " In The Encyclopedia of Islam. Leiden: Brill, 1960, Volume 1, p. 15-26

2 . aunders, John J, (ed. ). The Muslim World on the Eve of Europe's Expansion, p. 24 ; See also Gibb, H. A. R. Studies on the Civilization of Islam. London: Routledge and Kegan Paul, 1962, p. 20; Lewis, The Middle East: 2000 Years Of History. . . , p. 72.

کەنەدی (kennedy) دەڵێت: لێبووردن لەگەڵ ڕەگەزەکانی تر، زۆرێکی لە یۆنانی و جولەکە و ناجولەکە (مەسیحییەکان) هێنایە خزمەت سوڵتان. بڕوانە:

-kennedy, The Rise and Fall of the Great Powers, p. 11.

3. Hitti, History of the Arabs, p. 306

کاتێ بەغدا هەستایەوە، کە پێیان وابوو بوونی نییە و دوایی بووە مەڵبەندێکی جیهانیی سامان و زانست. "ئەم سەردەمە بۆ ئیسلام، نموونەیی بوو، شارستانییەتێکی نوێ و دەوڵەمەند و ڕەسەن پێگەیشت، کە لە ئەنجامی بەیەکگەیشتنی ژمارەیەك توخم و نەریت دروست بوو". [1] لێکۆڵینەوە لە قورئان و فەرموودە و فیقهیش لەم ماوەیەدا پێشکەوتنیان بە خۆوە بینی، بناغەیەکی بنەڕەتی بۆ سیستمی دادوەری دابین کرا کە هەموو پێداویستییەکانی یاسایی و دامەزراوەیی بۆ کۆمەڵگایەکی خێرا پێگەیشتووی تێدا بوو. سەرەڕای ئەمانەش، هاوبەشییەکی داهێنەرانە و ئەفراندن بۆ بیرکاری و زانست و پزیشکی و فەلسەفە و زانستی زمان و ئەدەب و هونەری خرایە سەر، وای لە جیهانی ئیسلامی کرد بۆ ماوەی نزیکەی چوار سەدە لەم بوارانەدا لە پلەی یەکەمدا بێت، لە ناوەڕاستی سەدەی هەشتەمەوە تاوەکو ناوەڕاستی سەدەی دوازدەیەم. [2] هەرچەندە جیهانی ئیسلامی لە پلەی یەکەمەوە هاتە دواوە، بەڵام بەردەوام بوو لە هاوبەشیکردنی بابەتی پەیوەندیدار بۆ ماوەی دوو سەدە بە لای کەمەوە.

ئەگەر ئیلهام و ئەو هاندەرە نەبوونایە کە ئیسلام بەدەستی خستبوون، ڕابوونی کۆمەڵگایەکی کۆچەریی عەرەبی دەستی پێ

[1]. Lewis, "Abbasids. ", p. 20.

[2] . Sarton, George. Introduction to the History of science. Washington, DC: Cafnegie Institute, 1927. Particularly Volume 1 and book 1 of volume 2.

نەدەكرد، دواى كۆچى دوايـى پێغەمبـەر (درودى خـواى لەسـەر) سـاڵى ١١ك/ ٦١٢ز و دواى خیلافــەتى ڕاشــیدین ســاڵى ٤١ك/٦٦١ز، كۆتــایى دەهات، بەڵام نـەك ئـەوە ڕووى نـەدا، بـەڵكو دواى ڕووخانـدنى هـەردوو خیلافەتى ئومەوى و عەباسییش، تـوانیى خۆڕاگربێـت بەرانبـەر هێرشـە یەك لە دواى یەكەكانى خاچپەرستان (١٠٩٥-١٢٩١ز) و ناردنە ناوەوەى داگیركـەرانى خۆیـان - لـە ئاسـیاى ناوەڕاسـت و چـینەوە - بـۆ نـاو ئیـسلام.[1] بـەم شـێوەیە جـۆرج سـارتۆن (George Sarton) لـە كتێبەكەیـدا (دەروازەیـەك بـۆ مێـژووى زانـستەكان) ستایـشى ئیـسلام دەكات و دەڵێت: "ئایین بە جۆرێك دەسـتى بەسـەر ژیـانى موسـڵماناندا گرتووە، لە پێشووشدا نموونەى نەبووە، هیچ گەلێكیش وەك موسڵمانان بە شێوەیەكى باش پابەند نەبوون بە ئایینەكەیانەوە، بێگومان ئەمـەش هۆى سەرەكییە بۆ یەكڕیزى و هێزیـان دژى دوژمنـەكانیان، كـە پارچـە پارچە بوون و بیروباوەڕیان لاواز و پەرت و بڵاو بوو".[2]

---

[1] . كە بریتى بوون لە موەحیدونەكان و سەلجووقیەكان و مەغۆلەكان.

[2] . Sarton, Introduction to the history of science, Volume 1, p. 503.

سۆرۆكین (Sorokin)واى دەبینێت كـە "شارسـتانییەتى عـەرەبى (كـە تـوینبى پێداگرى لەسـەر سیفاتە باوەكانى ناكات) ڕۆحێكى زانستى و تەكنۆلۆژیى گەورەى لە سەدەى سیازدەیەمدا پیشان دا، كە زۆر زۆر زیاتر بوو لە شارستانییەتى ڕۆژئاوا لە ماوەى ئەو سەدانەدا. بڕوانە:

-Sorokin, Social Philosophies of an Age of Crisis, p. 238.

# بەشی سێیەم

## هۆکاری بەرپرس لە دارمانی موسڵمانان

ئەگەر ئیسلام خۆی دەسپێك بووبێت بۆ شارستانییەتی ئیسلامی، پێویستە ئەو پرسیارە بکرێت: سەرەتای دارمانی کۆمەڵگاکانی ئیسلامی دوای ئەوەی گەیشتبووە لووتکە، بۆ چی دەگەڕێتەوە؟ لەگەڵ ئەوەی ئیسلام ئەو ئاستە بەرزەی بۆ ئەو کۆمەڵگایانە دابین کردبوو، هیچ بیانوویەك نییە کە گلەیی لە ئیسلام بکرێت بە هۆی دارمانیانەوە لەم دواییەدا. ژمارەیەك لە زانایان — وەك پێشتر باس کرا— گفتوگۆیان لەسەر ئەوە کرد کە ئیسلام هۆکاری دارمانی موسڵمانان نەبووە، چونکە ئەگەر شایانی گلەیی بێت، موسڵمانان هەر لە زووەوە وازیان لە ئیسلام دەهێنا، ئەوەی کە خەڵکی ئارەزووی لێیەتی و بە شێوەیەك دەیەوێت پێی هەستێت، دوور کەوتنەوەیە لەو شتەی خوویان پێوە گرتبوو و سەرچاوەی کێشەکان و دارمانیان بوو. ئەمەش ئەوەیە کە قورئان خۆی

دووپاتی دەکاتەوە: ﴿فَأَمَّا الزَّبَدُ فَيَذْهَبُ جُفَاءً وَأَمَّا مَا يَنْفَعُ النَّاسَ فَيَمْكُثُ فِي الأَرْضِ كَذَلِكَ يَضْرِبُ اللَّهُ الأَمْثَالَ﴾ الرعد /١٧. ئەمەش تا ئێستا لە ئیسلامدا ڕووی نەداوە، بەڵام حەزی گەڕانەوە ماوەی چەند سەدەیەکە بەردەوامیی هەیە، هەوڵی زیندووکردنەوەشی بە شێوەیەکی بەرچاو زیادی کردووە. موسڵمانەکان سەرچاوەی تێڕوانینیان لە ئیسلامەوە هەڵێنجاوە، تێڕوانینێک تێیدا تاک بەرپرسی ڕەوشتی و پەیوەندییەکانە بە خەڵکانی ترەوە، کە بریتییە لە پەیوەندیی بەهێزی برایەتی و مرۆڤایەتی. منداڵەکان خۆشەویستی و سۆز و چاودێریی دایك و باوك بەدەست بهێنن و تاوان و دڵەڕاوکێ و بەدڕەفتاری کەم ببێتەوە، گونجان و هاوسۆزیی کۆمەڵایەتی بڵاو ببێتەوە، خۆشگوزەرانی بۆ هەمووان دابین بکرێت. هۆدجسۆن (Hodgson) ڕوونی کردووەتەوە و دەڵێت: "تێڕوانین هەر بەردەوامە و واز لەو پرۆژەیە نەهێنراوە، ئەو هیوا و هەوڵانە هێشتا دڵیان بۆ ژیان لە جیهانێکی نوێدا لێ دەدات".[١]

ئەوەی گرنگە لە ئیسلامدا، سەرەڕای جیاوازیی زمان و ڕەگەز و تێکچوونی باری سیاسی و بێهێزیی وڵاتە ئیسلامییەکان و دارمانی ئابووری، بەڵام هێشتا ئیسلام سەرچاوەی ئیلهامی خەڵکییە، هێشتا جیهانی ئیسلامی لە سۆز و خۆشەویستیدا یەکگرتووە، "یەکەیەکی مێژوویی گشتگیرە بە شێوەیەکی کاریگەر و هۆشیار".[٢]

---

[1] . Hodgson, The Venture of Islam, Volume 1, p. 77.
[2] . Ibid. , Volume 2, p. 3.

## یەکەم: ئایا ئیسلام هۆکاری دارمانی موسڵمانانە؟

هەندێ زانا تاوتوێی ئەوە دەکەن کە ئیسلام هەرچەندە لە ڕابوردوودا پاڵپشتی گەشەپێدان بووە، بەڵام ئەمڕۆ جیهانی ئیسلامی هەژار و دواکەوتووە، بە هۆی هەندێ دامەزراوەی ئیسلامییەوە کە "بۆ خزمەتی ئامانجە ئابوورییەکان دانراون و جێی ڕێزن"، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا کاریگەریی دوور لە مەرامیان هەبووە کە بووەتە هۆی دروستبوونی "بەربەست لەبەردەم گەشەپێدانی ئابووریدا".(١) بەڵام نۆلاند (Noland) لە لێکۆڵینەوەیەکی نوێیدا کە هێشتا بڵاونەکراوەتەوە، گەیشتە ئەو ئەنجامەی کە "ئەو شیکارییانەی پشت بە پێوانە ئابوورییەکان دەبەستن، نەیان سەلماندووە، چ لە ئاستی وڵاتدا بێت یاخود لەسەر ئاستی خودی وڵاتێکدا بێت" هەروەها "ئیسلامیش ڕێگر نییە لە بەردەم گەشەدا، یاخود گەشەپێدانی لەغاو کردبێت، وەك دەڵێن، بەڵکو وەك دەردەکەوێت پێچەوانەکەی ڕاستە".(٢) لەگەڵ ئەوەشدا وا باشترە سێ دامەزراوەی ئیسلامی بەدواداچوونیان بۆ بکرێت، کوران (Kuran) ڕایدەگەیەنێت ئەمە دژی گەشەپێدانە، کە بریتیین لە:

---

1 . Kuran, "Why the Middle East is Economically Underdeveloped. . . ", p. 71-72.

2 . Noland, Marcus. "Religion, Culture, and Economic Performance. "Unpublished paper (mnoland@iie. com), p. 26-27.

أ – سیستمی میراتی ئیسلامی دادپەروەرانەیە، ڕێگەی نەداوە سیستمی میراتی تەنها بۆ کوڕە گەورە لە کۆمەڵگای ئیسلامیدا ڕەگ دابکوتێت.

ب – نەبوونی بۆچوونێکی بەرپرسیارێتی دیاریکراو و کەسایەتییەکی مەعنەوی یاخود یاسایی لە ئیسلامدا.

ج – دامەزراوەی ئەوقافی ئیسلامی.(1)

کوران دەڵێت: "دوو خاڵی یەکەم بوونە هۆی کەڵکە نەبوونی سەرمایە و دامەزراندنی کۆمپانیاکان، هەردووکیشیان سەرەکین بۆ خێراکردنی گەشەپێدان". هەروەها دەڵێت: "دامەزراوەی سێیەم ڕێگر بووە لە داهاتی زۆر گەورە، کە لە پرۆژەکاندا دانراوە، لەگەڵ ڕابووردنی کاتدا کاری پێ نەکراوە".(2)

---

1. Kuran, "Why the Middle East is Economically Underdeveloped. . . ", p. 71-72.
2. Ibid. , p. 71-72.

## دووەم: نەبوونی سیستمی نۆبەرە (نۆبەرەی کوڕ)

گومانی تێدا نییە کە ئیسلام بڕیاری میراتییەکی دادپەوەرانەی داوە و بە هیچ شێوەیەك ماوەی نەداوە بە نۆبەرەی کۆڕ (تەنها کوڕی گەورە میراتی ببات) میراتی ببات، بەڵام کوران (Kuran) قسەکانی پشتڕاست نەکردووەتەوە، کە سیستمی نۆبەرەی کوڕ هاوکار بووە لە دامەزراندنی پرۆژەی گەورە لە ڕۆژئاوادا. سیستمی نۆبەرە بە پلەی یەکەم خزمەتی پێداویستییەکانی سیستمی دەربەگایەتیی کردووە، لە ڕێگەی دابەشنەکردنی میراتەوە لەنێوان هەموو منداڵەکانی خاوەن موڵك یان کرێگرتەدا، تەنها یەك کەس بە بەرپرس دەمێنێتەوە بۆ پێشکەشکردنی خزمەتگوزاری سەربازی و خزمەتگوزارییەکانی تر بۆ سەرۆکی دەرەبەگەکان.[1] دەرەبەگایەتیش سەرۆکە دەرەبەگەکانی وا لێکردبوو کە دەیانتوانی "بە زەبرێکی لەڕادەبەدەری ئابووری کرێیان لێ وەربگرن". لە ئەنجامی ئەمەشدا جووتیارەکان هیچ "هاندەرێکی ئابوورییان نەبوو تا بە دڵ و بە گیان کار بۆ سەرکردە دەرەبەگەکان بکەن". ئەمەش "چاککردنی توانای ئابووریی کشتوکاڵی ڕاگرتبوو".[2] بۆیە سیستمی دەرەبەگایەتی لە سەرەتای ساڵی (١٥٠٠ز)ەوە لە ئەوروپای ڕۆژئاوا لە گۆڕ نرا "کاتێ سەرمایەداری – وەك ئێستا

---

1 . Rheinstein, Max, and Mary Glendon. "Inheritance and Succession. " The New Encyclopedia Britannica, 15th ed. , 1994, p. 638-47, p. 641.

2 . Brenner, Robert. "Feudalism. "The New Palgrave Dictionary of Economics, London: Macmillan, 1987, Volume 2, p. 309-16, p. 309 and 311.

نەناسرابوو – نەهاتبووەکایەوە و شۆڕشی پیشەسازییش دوو سەدە و نیو لە ئایندەوە دوور بوو".[١] بە نەمانی سیستمی دەرەبەگایەتی، سیستمی نۆبەرەش لاواز بوو، مەگەر بە دەگمەن لەلایەن خێزانە دەستەڵاتدارەکانەوە بەکار دەهێنرا. لە ئەمەریکاش دەبینین شۆڕشی ئەمەریکی ڕیشەکێشی کرد، بەڵام لە ئەوروپا لە کاتی شۆڕشی فەرەنسیدا هەرەسی هێنا، دوای ئەوەی یاسا ناپلیۆنییەکان بەڵێنیان دا نەگەڕێتەوە.[٢]

دەستپێکی گەشەپێدانی ئابووری لە ئەوروپا، پشتی بەلێهاتوویی بەستبوو، بە "گۆڕینی پەیوەندییەکانی موڵکایەتیی دەرەبەگایەتی بۆ پەیوەندییەکانی موڵکایەتیی سەرمایەداری".[٣] بۆیە نابینین زانایەك یان بیرمەندێك، لەناو هۆیەکانی شۆڕشی پیشەسازیدا، باسی نۆبەرە بکات. ئەو هۆیانەی دووپات دەکرێنەوە، بریتین لە سەپاندنی مافی موڵکایەتی لەلایەن حکومەتە دیموکراتییەکانەوە و ئەو قەوارەیەی کە بۆ گەشەپێدانی دابین کرد لە فێرکردن و توێژینەوە و تەکنۆلۆژیا.[٤]

---

1. North and Thomas, The Rise of the Western World, p. 102.
2. Rheinstein and Glendon. "Inheritance and succession.", p. 642.
3. Rheinstein and Glendon. "Inheritance and succession. ", p. 642
-Brenner, " Feudalism. ", p. 133 ; Dobb, M. Studies in the Development of Capitalism. London: Routledge and Kegan Paul, 1964. ; and Hilton ? R. H. The Decline of Serfdom. London: Macmillan, 1969.
4. See North, Institutions, Instituional Change, and Economic Performance, p. 130-40, and Checkland, S. G. " Industrial Revolution. "The New Palgrave Dictionary of Economics. London: Macmillan, 1987, Volume 2, p. 811-15.

ئارنۆڵـد تـوینبی (Arnold Toynbee)، کـە مـامی مێژوونووسـی گەورە ئارنۆڵـد جـی تـوینبی (Arnold J .Toynbee)یـە، زۆر جـار گرنگیـی ڕۆڵـی داهێنانـەکانی دووپـات دەکـردەوە، کـە یارمـەتیی بەدەسـتهێنانی تـەکنۆلۆژیای پێویـستیان بـۆ شۆڕشـەکە لـە بـواری کشتوکاڵ و پیشەسازی و گواستنەوەدا داوە.[1] لە کـەرتی کشتوکاڵیدا ئامێری هـەڵمی کـێڵان هاوکـاربوو بـۆ یەکخـستنی یـاخود کۆکردنـەوەی کێڵگە بچووکەکان لە کێڵگە گەورەکاندا، هەروەها توانرا ئەو زەوییانەش کـە زۆر گـرنگ نـەبوون، بکێڵـدرێن بـە سیـستمی سـنووردارکردنی زەوییەکان. لە کەرتی پیشەسازییش، چەرخی چنین و ئامێری هەڵمی و ئامێری جـۆلایی، هاوکـار بـوون بـۆ دامەزرانـدنی کارگـە گـەورەکان، لـە کـەرتی گواسـتنەوەش، بـە هـاتنی هێڵـی ئاسـنین لـە سـاڵی (١٨٣٠ ز) بازرگانی و بازاڕ فراوانبـوونێکی بەرچـاوی بـەخۆوە بینـی.[2] "چـینێکی نـوێ لـە سـەرمایەداری گـەورەی خـاوەن کـار، سـامانێکی گـەورەیان دەستکەوت".[3] ئەم سەرمایەیە، لە پاڵ تەکنۆلۆژیادا، نەوەك سیستمی نۆبەرەدا، بووە هۆی دامەزراندنی کاری گەورە و هەر ئەمیش بووە هۆی دامەزراندنی کۆمپانیاکان.

---

[1] . Toynbee, Arnold. Industrial Revolution. Boston: Beacon Press, 1961. (First Published as Lectures on the Industrial Revolution in England, 1884).

[2] . Ibid. , p. 58-66.

[3] . Ibid. , p. 65.

هەتاوەکو ئەگەر واشمان دانا کە سیستمی نۆبەرە ڕۆڵێکی کاریگەری لە ئەوروپا و ئەمەریکا هەبووە، ئەمە ئەوە ناگەیەنێت ئەم سیستمە بۆ گەشەپێدانی هەموو وڵاتان پێویستە، لە ژاپۆن و ڕۆژهەڵاتی ئاسیا گەشەپێدانیش بەدەستهات بێ ئەوەی سیستمی نۆبەرە ڕۆڵێکی لە ڕێڕەوی گەشەپێدانیاندا هەبێت. هەندێ کاریگەری کە ڕۆڵی یەکلاکەرەوەیان لە گەشەپێدانیاندا هەبووە، وەك: دەستەڵاتی کارامە و چارەسەرکردنی کشتوکاڵ و یەکسانیی کۆمەڵایەتی و بەها ڕۆشنبیرییەکان، بوونیان هەبووە.(١) لەناو ئەم کاریگەرییانەشدا چارەسەرکردنی کشتوکاڵ کە کاریگەرییەکەی لەم بوارەدا پێچەوانەی سیستمی نۆبەرەیە، لە ژاپۆن ڕێژەی ناوەندیی هەر خێزانێك لە زەویی کشتوکاڵی بۆ دوو دۆنم و نیو کەمکرایەوە.(٢) هەتاوەکو لە ساڵی ١٩٨٥ز قەوارەی ناوەندی هەر کێڵگەیەك لە ژاپۆن پێویست بوو ١,٢ دۆنم بێت، تەنها لە ٤٪ی هەموو کێڵگەکان لەسەر زەوییەکی سێ هێکتاری (٧,٤١ئەکرات / دۆنم)دا بوون.(٣) ساکس (Sachs) وای دەبینێت کە "چارەسەرکردنی کشتوکاڵ لەو وڵاتانەدا، گشتگیرتر بوون لە چاکسازییەکانی تر کە لە مێژووی نوێدا کرابن".(٤) لە کاتێکدا ئەو

---

[1]. See Chapra, Islam and the Economic Challenge, p. 173-181

[2]. Jansen, Marius B. "Japan, History of. " The New Encyclopedia Britannica, 15th ed. , 1973-74, Volume 10, p. 88.

[3]. Australian Bureau of Agricultural and Research Economics, " Japanese Agricultural Policies. " Policy Monograph, No: 3, Canberra, Australia, 1988.

[4]. Sachs, Jeffrey D. "Trade and Exchange Rate Policies in Growth Oriented Adjustment. " In Vittorio Corbo, Morris Goldstein and Mohsin Khan (eds. ), Growth-

زەوییانەی موڵکی خەڵکی بوون، بچووك بوون و زۆر بەسوود نەبوون، بۆیە پشتیان بە هاوکاریی حکومەت بەستووە، بەڵام کاریگەریی کتوپڕی لەسەر دەستەڵاتی گەورە دەرەبەگەکان هەبووە، بە تەواوەتیش بەکرێگرتنی کێڵگە نەماوە، کە پێش چاکسازییەکان باو بوو. ئەمەش کاریگەریی ڕوون و دیاری لە کەمکردنەوەی حاڵەتی یەکسان نەبوون لە داهات و ساماندا هەبوو. بۆیە بەرزبوونەوەی داهاتی جووتیارە بچووکەکان، لەگەڵ بەهای ڕۆشنبیری کە هەڵێنجاوی ژیانە سادەکەیان بوو، توانیی پاشەکەوتەکانیان زیاد بکات. بەرزبوونەوەی ڕێژەی پاشەکەوت وایکرد هەڵاوسان و نرخی سوود تا ڕادەیەك لە ئاستێکی نزمدا بمێنێتەوە، توانرا گەشەپێدانێکی گوندی و شاری بەدەست بهێنرێت، بێ ئەوەی پێویست بە فراوانکردنی پارە و قەرز و قەرزی دەرەکیی ناپێویست بکات.[1] لەبەر ئەوەی پشتبەستن بە سامان دەبێتە ڕێگری سەرەکی لەبەردەم بەجێهێنانی دادپەروەریی کۆمەڵایەتی - ئابووری لە جیهانی ئیسلامیدا، بۆیە نەبوونی نۆبەرە پێویستە و کاریگەریی بەسوودی خۆی لەسەر دادپەروەری و گەشەپێدان دەبێت.

---

Oriented Adjustment Programmes. Proceeding of a Symposium Held in Washington, DC, February 25-27, 1986. IMF/IBRD, Washngton D. C. , 1987, p. 301.

[1] . بۆ زانیاریی زیاتر، بڕوانە:

- Chapra, Islam and the Economic Challenge, p. 173-81 .

## سێیەم: قەوارەی دادوەری و بەرپرسیارێتیی دیاریکراو

بێگومان (کوران) ڕاستی کرد کە دووپاتی بوونی قەوارەیەکی یاسایی بەرپرسیارێتی دیاریکراوی لە کۆمپانیاکاندا کردەوە، لە پێناو وەبەرهێنانێکی بەرفراوان، بەڵام بوونی ئەم دوو چەمکە لە گفتوگۆ ئاساییە کەلتوورییەکانی فیقهی ئیسلامیدا هەیە. نزیکترین شتیش بۆ قەوارەیەکی یاسایی، بۆ کۆمپانیا "بیت المال" و موڵکەکانی مزگەوت و وەقفەکانە.[1] بۆیە چەمکی بەرپرسیارێتیی دیاریکراو لە شێوەی "المضاربة"[2]دا هەبووە. فراوان کراوە بە بێ هیچ ناڕەحەتییەك، بۆ ئەوەی لەم سەردەمەدا کۆمپانیایەکی گەورە بگرێتە خۆ، بۆیە بەرژەوەندیی گشتی وا دەخوازێت و "لەم بارودۆخەشدا دەکرێت

---

[1] . Al Khafif, 1962, p. 22-7 ; Udovitch, Abraham L. Partnership and Profit in Medieval Islam. Princeton, NJ: Princeton University Press, 1970, p. 99 ; and Abdullah, Ali Ahmad, Al-Shakhsiyyah al -L'tibariyyah fi al-Fiqh al-Islami (Legal Personality in Islamic Jurisprudence). Khartoum, Sudan: Al-Dar al-Sudaniyyah Li al-Kutub, (n. d). P. 235-239

[2]. Chapra, M. Umer. Towards a Just Monetary System. Leicester, UK: The Islamic Foundation, 1985, p. 255-256 ; Cizakca, Murat. The Comparative Evolution of Business Partnerships. Leiden: E. J. Brill, 1996, p. 14. ; and Usmani, Muhammad Taqi. An Introduction to Islamic Finance. Karachi: Idaratul Ma'arif, 1998, p. 221-228.

سیزاکا (Cizakca) دەڵێت: لێپرسراوێتیی دیاریکراو لە گرێبەستی (المضاربة)دا (المضاربة– کە برتییە لەو مامەڵەیەی کەسێك پارە دەدات بە یەکێکی تر بازرگانیی پێوە بکات و قازانجەکەشی بە پێی ئەو ڕێکەوتنە دەبێت کە لە نێوانیادا دەکرێت – وەرگێڕی کوردی) بڵاوبوو و بە باشی دەزانرا کە چییە، هەر بازرگانێك، بازرگانیی نێودەوڵەتیی کردبێت، دەتوانێت بە ئاسانی بەرگری لە کێشەکەی لە دادگا بیانییەکاندا بکات.

کۆمپانیاکان و دامەزراوە گشتییەکان کەسایەتییەکی متمانەپێکراو و لە هەمان کاتدا بەرپرسیارێتییەکی دیاریکراویش بن".[١]

شتێکی نامۆیە گەر وا دابنێین پێویستە هەموو شتێك دەربارەی گەشەپێدان لە قورئان و سوننەتدا هەبێت. لە یەکێك لە گرنگترین بیروباوەڕەکانی فیقهی ئیسلامیدا و بەناوبانگترینیاندا، هاتووە و دەڵێت: هەر شتێك بە دەق حەرام نەکرابێت، ئەوە ڕێگە پێدراوە. لەبەر ئەوەی شتە بە ئاشکرا حەرامکراوەکان زۆر کەمن، کەواتە بوارێکی گەورە هەیە کە بتوانرێت پێشکەوتن لە دامەزراوەی پێویستدا بۆ پشتگیریکردنی گەشەپێدان بکرێت، ئەمەش بە ڕاستی لە کۆمەڵگای ئیسلامیدا ڕووی داوە، هەر وەك کوران خۆی دانی پێدا دەنێت، کاتێ دەڵێت: "سیما ئابوورییە تایبەتەکانی شارستانییەتی ئیسلامیی تەقلیدی، لە ماوەی ئەم سێ ساڵەی دوایدا پەرەی سەندووە".[٢] ئەم گەشەپێدانەش بە گوێرەی پێویست بووە، ئەمش لەگەڵ پرۆسەی بەرزبوونەوەی ئاستی سروشتیی پەرەپێدانی دامەزراوەکانی کۆمەڵگای مرۆییدا ڕێك دەکەوێت، هیچ کۆمەڵگایەکیش نییە هەموو دامەزراوە پێوستەکانی پەیوەست بە بەدیهێنانی گەشەپێدانی لە ئایندەدا، بە یەکجار و لە یەك کاتی گەشەپێداندا بەدی هاتبێت. ئەمەش ناڕەزایی و پرسیارێك دێنێتە

[1]. عبدالله، أحمد علي. الشخصية الاعتبارية في الفقه الاسلامي،الخرطوم، الدار السودانية للكتب.

[2])Kuran, " Why the Middle East is Economically Underdeveloped. . . ", p. 72.

پێشەوە: چۆن لە ماوەی پێشوودا لە کۆمەڵگا ئیسلامییەکان پێویستیی دامەزراندنی کۆمپانیا نەهاتووەتە ئاراوە؟

بۆ وەڵامی ئەم نارەزاییە، پێویستە ئەوە دووپات بکەینەوە کە ڕێنماییەکانی ئیسلام لەوە بەرپرس نین، بەڵکو حکومەتە ستەمکارەکان بەرپرسن کە بە شێوەیەکی باش مافی مۆڵکییەتیان نەچەسپاندووە، کە ڕێنماییەکانی ئیسلام جەختی لەسەر کردووەتەوە. نورس (North) گفتوگۆ لەسەر ئەوە دەکات و دەڵێت: "مافی مولکایەتی دەستەبەر نەکراوە و دەبێتە هۆی بەکارهێنانی تەکنۆلۆژیایەك کە سەرمایەیەکی کەمی نەگۆڕ بەکار دەهێنێت، هیچ ڕێکەوتنێکی درێژخایەن بە دوای خۆیدا ناهێنێت، بۆیە کۆمپانیاکان بچووك دەردەچن".[1] لە جیهانی ئیسلامیدا بەم شێوەیە ڕووی دا، چونکە ئەگەر مافی مولکایەتی دەستەبەر بکرایە، ئەوا قەوارەی گەشەپێدان کە لە سەدەی هەشتەمەوە بنیاتنراوە، تاوەکو سەدەی چواردەیەم بەردەوام دەبوو، ئێستا پێوست دەکات کۆمپانیا بچووکەکان بگۆڕدرێن بە دامەزراوەی کاری گەورە.

شتێکی وا نییە گریمانە بخوازێت کە پێویستیی زۆر بە پارە – کە پێویست بوو لەسەر ئەمانە دابین بکرێت – نەدەبووە هۆی دامەزراندنی کۆمپانیای گەورە، کە بنەمای کارەکەیە، وەك پێشتر باسمان کرد، لە بنەڕەتدا لە فیقهی ئیسلامیدا هەیە. لە سەدەی بیستەمدا کاتێ

[1]. North, Institutions, Institutional Change, and Economic Performance, p. 65.

گەشـەپێدان لـە جیهـانی ئیـسلامیدا دەسـتی پـێ کـرد، پێوسـت بـوو دامەزراوەی کاری گەورە بنیات بنرێت، زانایانی ئایینی هیچ گرانییەکیان نەبینییەوە لە بڕیاردان لەسەر شێوازی ڕێکخستنی ئابووری کە شـێوەی کۆمپانیای گەورەی وەرگرت. ئەگەر هەر ڕێگرییەك پێـچەوانەی ئیـسلام هەبوایـە، ئـەوا ئـەو هـەموو یەکدەنگییـە بـۆ قبـوولکردنی نـەدەبوو. تێبینییەکەی لال (Lal) ڕاسـتە کـە "دامـەزراوە ئیـسلامییەکان خۆیـان ڕێگـر نـەبوون لـە گەشـەپێدان، بـەڵکو ئـەرك و ئاراسـتە ناجێگیرەکـانی سۆشیالیستیی دەوڵـەت بـوو، بـەڵام کـاتێ هەنـدێ بەشـی ئیـسلامی لـە خوارووی ڕۆژهـەڵاتی ئاسـیا بـە پێـچەوانەوە کاریـان کـرد، بەرهـەمێکی زۆری لەڕادەبەدەری هەبوو". [1]

لە ئینگلتەرای چاخەکانی ناوەڕاستدا، کۆمپانیا گەورەکان لە ناوچە سـەربەخۆکان و سـەندیکاکان و کڵێـسکان و کۆمەڵـە خێرخوازەکانـدا خۆیان دەبینییەوە. [2] ئەمەش وەك ئەوەیە کە لە ئیسلامیشدا ڕووی دا، بـەڵام ئـەو کۆمپانیـا گەورانـە لـە ئینگلتـەرای چـاخەکانی ناوەڕاسـتدا، پێـشووتر چـەند قەوارەیـەك نـەبوون بـۆ دروسـتبوونی ئـەو کۆمپانیـا گەورانەی ئێستا هەن، بەڵام ئێستا بە گشتی تایبەتن، هەر وەك چۆن لە

---

1. Lal, Deepak. Unintended Consequences: The Impact of Factor Endowments, Culture, and Politics on Long-Run Economic Performance. Cambridge, MA: MIT Press, 1998, p. 66.

2. Hessen, Robert. "Corporation. " The New Palgrave Dictionary of Economics. London: Macmillan, 1987, Volume 1, p. 675-77, p. 675.

کۆتایی سەدەی حەڤدەیەم ڕووی دا[1]، پـاش ماوەیـەکی دووردرێـژ لـە دیارنـەمانی سیـستمی دەرەبەگایـەتی و لاوازبـوونی سیـستمی نۆبـەرە. لەگــەڵ ئەوەشــدا، بنیاتنــانی بناغــەی بیروبــاوەڕی بەرپرســیارێتیی دیاریکراو لـە ویلایەتـە یـەکگرتووەکان و شانـشینی یـەکگرتوو، تـاوەکو سەدەی نۆزدەیەم نەبوو.[2]

شۆڕشی کشتوکاڵی و زانستی کە لە سەردەمەکانی یەکەمی ئیسلامدا ڕوویان دا، نەتوانرا بۆ شۆڕشێکی پیـشەسازی بگۆڕدرێـت، لەبـەر چـەند هۆکارێك کە گرنگترینیان نەبوونی شەرعیەتێکی سیاسی، هەروەها مـاف موڵکایەتیش مسۆگەر نەبوو، بۆیە خەڵکی ناچـار دەکـرد سـامانەکانیان بشارنەوە بۆ ئەوەی نەچنە ژێر ڕکێفی باجی زۆری نایاساییەوە، یـاخود دەستی بەسـەرا بگیرێـت، بـەوەش کۆمپانیـا بچووکەکان کەمبوونـەوە. ســەرەڕای ئەمانــەش، زەحمــەت بــوو لــەو ژینگانــەدا پــرۆژەی کــارە گـەورەکان دابمـەزرێت، ئەگـەر ئـەم حاڵەتانـە نەبوونایـە، ئـەوا نـەمانی سیــستمی نۆبــەرە دەبــووە هانــدەرێك بــۆ دروســتبوونی کۆمپانیــا گەورەکان، لە ڕێگەی هاندانی خەڵکەوە بۆ کۆکردنەوەی سەرمایەکانیان بە شێوەی پشك، بەمەبەستی پێکهێنانی پرۆژەی کاری گەورەتر کە بـۆ ژیانیش شیاو بێت.

---

[1]. Ibid. , p. 678.

[2]. Oesterle, Dale Arthur. " Limited liability. " The New Palgrave Dictionary of Money and Finance. London: Macmillan, 1994, Volume 2, p. 590-91.

### چوارەم: ئەوقاف

دامەزراوەی ئەوقاف لە جیهانی ئیسلامیدا لە سەرەتای سەردەمی یەکەمی ئیسلامدا دامەزرا، پێش دامەزراندنی بە ماوەیەکی درێژ لە ڕۆژئاوا. هاوکاریی باشی بۆ پێشخستنی کۆمەڵگا ئیسلامییەکان پێشکەش کرد، هەر وەك (کوران) دانی پێدا دەنێت کە "وەقف کۆمەڵێك خزمەتگوزاریی فراوانی دابین کرد"[1]، کە بریتی بوون لە فێرکردن، تەندروستی، تاقیگە زانستییەکان، دروستکردن و پارێزگاریی مزگەوتەکان، هەتیوخانەکان (خانەی بێ سەرپەرشتان)، شوێنی نیشتەجێبوون بۆ خوێندکاران و مامۆستایان و ڕێبواران، پرد و بیر و ڕێگا و نەخۆشخانە.[2] ئەمانەش لە کاتێکدا بوون کە وەقف سەرپەرشتی و ڕێکخستنێکی ڕێکوپێك دەکرا.[3] بەڵام بە نەمانی سەرپەرشتی و ڕێکخستنی ڕێکوپێك و چەکی ڕەسەن و سەرهەڵدانی گەندەڵی، هەروەها نەبوونی پارێزگاریی پێویست و خراپ بەکارهێنانی

---

1 . Kuran, " Why the Middle East is Economically Underdeveloped. . . ". P. 75.

2. See for example Makdisi, G. The Rise of Colleges: Institutions of Leraning in Islam and the West. Edinburgh University Press, 1981, p. 35-74 ; Hodgson, The Venture of Islam, Volume 2, p. 124; Kahf, Monzer. Shari'ah and Historical Aspects of Zakah and Awqaf. Background paper prepared for the Islamic Research and Training Institute / Islamic Development Bank, Jeddah, 2004. ; and Ahmed, Habib. Role of Zakah and Awqaf in Poverty Alleviation. Jeddah: Islamic Research and Training Institute/ Islamic Development Bank, Occasional Paper No. 8, 2004.

3. Inalcik, Halil. "The Rise of the Ottoman Empire. " In P. M. Holt, Ann Lambton and Bernard Lewis (eds. ), The Cambridge History of Islam. Cambridge: Cambridge University Press. 1970, Volume 1, p. 307.

موڵکـەکانی وەقـف و دەستبەسـەراگرتنیان [1]، ئـەوقاف –وەك کـوران ئاماژەی پێ دا– تووشی ئیفلیجی بوو.

دەتوانرێت ئاستی بڵاوبوونەوەی گەندەڵیی ئەو ساتە بـەپێی ئـەو ئامۆژگارییەی ئیبن عابدین (١٢٥٨ك / ١٨٤٢ز کۆچی دوایـی کـردووە) ـ زانایەکی ئـایینیی حەنـەفیی نـاودار بـوو، لـە نیـوەی یەکـەمی سـەدەی نۆزدەیەمدا ـ پێشکەشی کرد، بخەملێنرێت. بۆ ئەو کەسانەی ئـارەزووی دامەزراندنیان بە چاودێر بۆ پارێزگاریکردنی مزگەوتە وەقفەکان هـەبوو، وا چـاوەڕوان دەکـرا ئـەم دامەزراندنـە لـە ڕێگـەی چـەکێکەوە بێـت لـە دادگاوە دەرچووبێت، لەگەڵ ئەوەشدا ئیبن عابدین ئامۆژگاریی کردن کە دادگاکان ئاگـادار مەکەنـەوە بـۆ ئـەوەی بـەم وەقفانـە نـەزانن، چـونکە دادوەرەکان بە ڕێژەیەکی زۆر دووچاری گەنـدەڵی هـاتبوون، گـەر بێتـو دادگاکان بەم موڵکانە بزانن، هـەوڵ دەدەن دەسـتی بەسـەردا بگـرن.[2] ئەگەر بێتو دادگاکان گەندەڵ بـن، دەبێـت حـاڵی موڵکـەکان چـی بێـت، ئەگەر چاودێرەکانیش نیەتی ناپاکییان هەبێت. هیچ بوارێکیش نەبوو بۆ پەنابردنە بەر دادگای یاسایی. سەرەڕای گەندەڵیی دەستبەسەرداگرتن،

---

[1]. Ahmed, Role of Zakah and Awqaf in Poverty Alleviation, p. 42-44.

[2]. ابن عابدین، محمد أمین. حاشیة رد المختار، القاهرة، مصطفی البابي الحلبي، ١٣٨٦ هـ م ١٩٦٦م، ج٤، ل٤٢٢. (منذر قحف ئاگاداری کردمەوە بۆ ئەم سەرچاوەیە).

سیستمی باجیش ڕۆڵێکی گەورەی لە بەربەست دانان لە بەردەم گەشەپێدانی چاوەڕوانکراو لە سیستمی وەقفدا دەبینی.

بە لەبەرچاوگرتنی ئەم هۆکارە نەرێنییانە، ستەمە بۆ ئەو شتانەی ڕوویان دا، ئیسلام سەرزەنشت بکرێت، چونکە ئیسلام هەمیشە هەوڵی داوە ڕێگر بێت لەو جۆرە گەندەڵییانە، نەك هانیان بدات. حکومەت و دادگا بەرپرسن لە جێبەجێکردنی ڕێنماییەکانی ئیسلام. ئەوەی دڵخۆشکەرە و پێویستە بیزانین، دامەزراوەی وەقف لە جیهانی ئیسلامیدا هێز و قورسایی خۆی بۆ گەڕایەوە، بە هۆی پیرۆزکردنی ماف مولکایەتی و نوێبوونەوەی دەستپێشخەرییە تایبەتەکانەوە، ئەمانە لە پاڵ ڕێکخستن و سەرپەرشتیکردن لەلایەن حکومەتەوە.[1] چاوەڕوان دەکرێت وەقف سەرلەنوێ بگەڕێتەوە و ڕۆڵی یەکلاکەرەوە لە پێشخستنی بناغەی بنیاتی کۆمەڵایەتی و سروشتی ببینێت، لە ڕێگەی کارە خێرخوازییە تایبەتەکانەوە، هەر وەك چۆن لە ڕابوردوودا ئەنجام دەدرا.

لە کۆتاییدا، ئەوە دەردەکەوێت کە ئیسلام هۆی هەژاری و دواخستنی کۆمەڵگا ئیسلامییەکان نەبووە، بەڵکو شوێنەوارە نەرێنییەکانی نەبوونی لێپرسینەوەی سیاسی بوو، لەگەڵ ئەوانەشدا دەستدرێژیکردنە سەر ماف مولکایەتی و کەمبوونەوەی هاوکاریی

[1]. Ahmed, Role of Zakah and Awqaf in Poverty Alleviation, p. 42-44.

ڕەسمیی خوێندن و لێکۆڵینەوەی تەکنۆلۆژی و گەشەپێدان. حکومەتە دیمکوراتییەکان لە ڕۆژئاوا، بە چەند ڕێوشوێنێك پاڵپشتیی گەشەپێدانیان کرد، وەك پاراستنی مافی موڵکایەتی و هاوکاریی خوێندن و لێکۆڵینەوەی زانستی. ئەم گەشەپێدانە بووە هۆکاری پێویست بۆ دروستبوونی کۆمپانیا گەورەکان، بۆیە ئەو حکومەتە ناشەرعییانەی کە ناکەونە ژێر لێپرسینەوەی میللەتەوە، ناکەونە ژێر – بە شێوەکی گشتی – فشارێك بۆ سەپاندنی مافی موڵکایەتی و خزمەتی بەرژەوەندییەکانی میللەتەوە، پاشان گەشەپێدان دەبێتە قوربانی و هیچ کەسێکیش لەگەڵ (کوران) هاوڕا نییە کە "ئەم حکومەتە _ زۆردارانە_ پێشتر تا سەدەی نۆزدەیەم لەژێر– بە لای کەمەوە – و لە هەندێ جاردا تاوەکو ئەم نزیکانەش یاساکانی شەریعەتی ئیسلامدا بووبن.[١]

---

[1]. Kuran, " Why the Middle East is Economically Underdeveloped. . . ". P. 83.

## پێنجەم: ئایا بێڕەوشتی هۆکاری دارمانی موسڵمانانە؟

ئەگەر ئیسلام هۆکاری دارمانی موسڵمانان نەبووبێت، پێویستە ئەو پرسیارە بکەین: ئایا دەتوانین بێڕەوشتی بە بەرپرس لەو دارمانە دابنێین؟ ئەگەر شێوەی شیکارییە دینامیکییە ئابووری و کۆمەڵایەتییەکەی ئیبن خەلدونمان بەکارهێنا، ئەو کات وەڵامەکە بە نەخێر دەبێت. لەگەڵ ئەوەی کە گومان لەوەدا نییە بێڕەوشتیی موسڵمانان ڕۆڵێکی گەورەی لە پووکانەوەی تواناکان بۆ داهێنان و ژیاری و هاوکاری گێڕاوە، وای لێکردوون نەتوانن ڕووبەڕووی بەربەستەکانی بەردەمیان ببنەوە، بۆیە (المقدمة) وا لە مرۆڤ دەکات بگاتە ئەو ئەنجامەی کە بێڕەوشتی هەر خۆی ئەنجام بووە، نەك هۆ.

خەڵکی لە نێر و مێ، پێویستیان بە ژینگەیەکی پێویست هەیە کە: پەروەردەیەکی ڕەوشتی و هونەریی و دامەزراوەی سیاسی و یاسایی و کۆمەڵاییەتی - ئابووریی بۆ دابین کرابێت، بۆ دەستەبەرکردنی دادپەروەری و پێشخستنی توانا مرۆییەکانیان بە تەواوەتی، تا هاوبەشییەکی تەواویان لە پێشخستنی کۆمەڵگاکەیاندا هەبێت. نەمانی وردە وردەی ئەم جۆرە ژینگە پێویستە، لەوانەیە هۆکاری سەرەکیی بێڕەوشتبوونی گەلانی ئیسلامی و نەمانی ژیاری و هاوکارییان بێت. ئیبن خەلدون ئاماژەی بەوە داوە کە لە سایەی دەستەڵاتێکی زۆرداردا "خەڵکی دەترسن و گۆشەگیر دەبن، هەوڵ دەدەن لە ڕێگەی درۆ و

فرۆفێڵـەوە خۆیـان بپـارێزن، ئەمـەش دەبێتـە سـیفەتێکی جیاکـەرەوە تێیاندا و هەستیاری و کەسایەتییان گەندەڵ دەبێت.[1]

لە هەمان کاتدا ئەو حاڵەتی ستەمەی بڵاوبووبووەوە، کاریگەرییـەکی نەرێنیی لەسەر ڕەوشت هەبوو، چونکە ئیـسلام خـۆی پێـداگری لەسـەر خووڕەوشتی جوان دەکاتەوە – یەکێکـە لـە سـیفەتە سـەرەکییەکان و ڕێنماییەکانی ئیسلام – مانای خۆی نەدەپێکا. باوکـەکان نەیانـدەتوانی خووڕەوشتی جوان لە منداڵەکانیاندا بچێنن، چونکە نەخوێندەوار بـوون و بـاش لـە ڕێنماییـەکانی ئیـسلام حـاڵی نـەبووبوون، هـەروەها ئـەم قوتابخانـە عەلمانییـە نوێیانـە، گرنگـی بـەو لایەنـە نـادەن، هـەتاوەکو مزگـەت و "قوتابخانـەکان"یـش بـە هـۆی تێنەگەیـشتنی تـەواویان لـە ئیسلام سەرکەوتوو نەبوون. ئـەوەی کـە ئێـستا پێویـستە، دابینکردنـی دادپەروەرییەکی زیاترە لە پاڵ فێکردنێکی گونجاودا.

**شەشەم: ئایا سـەرەتا ناشـەرعییەتی سیاسـی بـووە دەسـتپێکی داڕمان؟**

ئەگـەر ئیـسلام ئـەوە بێـت کـە پێغەمبـەر (درودی خـوای لەسـەر) بانگەشەی بـۆ کـرد، ئەگـەر بێڕەوشـتیی موسـڵمانانیش، هـەردووکیان، نەبنـە هۆکـار بـۆ دەسـتپێکردنی داڕمـانی موسـڵمانان، ئـەی هۆیەکـەی چییە؟ ئایا نەمانی "ڕۆح"ی ئیسلامییە؟ زەحمەتە بتوانرێت وەڵامێکـی

---

[1]. M: PP. 88-2 ; R: 1, p. 383.

تێروتەسەلی ئەم پرسیارە لە ڕێگـەی ئـەم کتێبـە بـچووکەوە بدرێتـەوە. لەبەرئەوەی مەبەستەکە نووسینەوەی مێژوو نییە وەك نموونەکەی ئیبن خەلــدون، بــەڵکو وەرگرتنـــی هەنــدێ پەنـــدە بــۆ پێـــشنیارکردنی ستراتیژییەتێکی گونجاو لە پێناو گەشـەپێدان لـە ئایندەدا، سوودیشی دەبێت لە دەرخستنی لایەنەکانی مێژووی ئیسلامی کە ڕۆڵێکی سەرەکی لە دارماندا بینیوە.

بۆ دوورکەوتنـەوە لـە زیـادەڕۆیی و دووبارەکردنـەوە، شـیکارییەکە تەنها تایبەت دەبێت بە وڵاتە مەڵبەنـدە ئیـسلامییەکان، کـە ئومـەوی و عەباسی و مەمالیك و عوسمانییەکان حوکمیان کردوون، ناوچەکانی تری وەك: ئیـــسپانیا و ئەفـــەریقیا و ئاســـیای ناوەڕاســـت و هیندســـتان و ڕۆژهــەڵاتی ئاسـیا، لـەم شـیکارییە بـەدوور دەگـرین. لەگـەڵ ئەوەشـدا شیکارییەکە لەوانەیە بەسەر ئەم ناوچانەشـدا جێبـەجێ بکرێـت، ئەگـەر ناویـشیان نـەهێنرێت، چـونکە شـەپۆلە ژێرخانییـەکان کـاری لـەوانیش کردووە.

ئیبن خەلدون و ژمارەیەك لە زانا موسڵمانە تەقلیدییەکانی پێش ئـەو و دوای ئەویش، وای دەبینن کە مێژووی ئیسلامی بە نەمانی خیلافـەتی ڕاشـیدین، هــەروەها کــە موعاویــە لــە ســاڵی ٤١ ك/٦٦١ز هاتــە ســەر دەستەڵات و یەزیدی کوڕی کرد بـە جێنـشینی خـۆی لـە خیلافەتـدا لـە ســاڵی ٦٠ك / ٦٧٩ز و دامەزرانـدنی دەوڵـەتی ئومـەوی (٤١ – ١٣٢ك /

٦٦٣– ٧٥٠ ز)، لـه ڕێـی ڕاسـت لایـداوە.[١] ئـەم گۆڕانکارییـە تـۆوی نایاسـایی سیاسـی ڕوانـد و میراتیـی موڵکایـەتی خـاوەن دەسـتەڵاتێکی ڕەهای دروست کرد، کە ناچێتە ژێرباری هیچ لێپرسینەوەیەك، ئەمـەش شکاندنێکی زەقی پێداویستییە ڕەوشـتییەکانی (Moral Imperative) خیلافەت و شوورایە، یاخود سیستمی سیاسـی نموونەییـە، کـە ئیـسلام داوای لە موسـڵمانان کـردووە پێـوەی پابەنـد بـن.[٢] ئـەم پێـشێلکارییە ناڕەزاییەکی زۆری لای کۆمەڵگای ئیسلامی دروست کرد، بە تایبەتی لای یارانی پێغەمبەری خۆشەویست (درودی خـوای لەسـەر) کـە هێـشتا لـە ژیاندا مـابوون، "کاتـێ بارودۆخەکـە بـە لای موعاویـەدا ئـارام بـووەوە، سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص چووە لای و وتی: سـڵاوی خـوات لـێ بێـت ئەی پادشا. موعاویـە پێکـەنی و وتـی: پێویـست نـەبوو وا بڵێیـت ئـەی باوکی ئیـسحاق، دەبـوو بتگوتایـە: ئـەی ئـەمیری ئیمانـداران. سـەعدی کوڕی ئـەبو وەقـاص وتـی: ئـاوا بـە ڕوونـی و پێکەنینـەوە دەیڵێیـت؟!

---

1 . Osman, Fathi. "The Contract for the Appointment of the Head of an Islamic State. " In Mumtaz Ahmad (eds. ), State Politics and Islam. Washington: American Trust Publications, 1986, p. 51-85, p. 52-55.

2 . سەیری ئەو وتارە بکە کە لەسەر شوورا بڵاوکراوەتەوە، لە:

- وزارة الأوقاف والشؤون الإسلامية. الموسوعة الفقهية، الكويت، وزارة الأوقاف والشؤون الإسـلامية، ط٢، صدر حتى الآن ٤٣ مجلدًا حتى حرف الواو، ١٩٨٣ بەرگی ٢٦، ل ٢٧٩ –٢٨٣. هەروەها بڕوانە:
- القرطبي، أبو عبدالله محمد. الجامع لأحكام القران، تحقيق: أحمد علیم البردونـي، بـيروت، دار الكتـاب العربي ن ١٩٥٧ م، بەرگ٤، ل٢٤٩ – ٢٥٢. بەرگ١٦، ل١٤–١٨.
- الجصاص، أبو بكر. أحكام القرآن، القاهرة، المطبعة البهية المصرية، ١٣٤٧هـ، بەرگ ٢، ل ٤٨–٥٠.

سوێند بە خوا من حەزناکەم بەو شێوەیە ببم بە خەلیفە کە تۆ بوویت".[1] چەند شۆڕشێکیش ڕووی دا، بە تایبەتی لە مەدینە (وقعة الحرة) و مەککە و کەربەلا (عێراق)، بەڵام ئەم شۆڕشانە بەبێ هیچ سۆز و بەزەییەك کپکرانەوە. لە ئەنجامی ئەمەدا مێژووی ئیسلامی ئەوەی تۆمار کردووە کە یەزیدی کوڕی موعاویە یەکێك بووە لەوانەی خەڵکی زۆر ڕقیان لێی دەبووەوە.

لەوانەیە لەو دەمەدا هێشتا کاتی ئەوە نەهاتبێت چاکسازی سیاسیی بنەڕەتی بۆ چۆنیەتی خیلافەت و شوورا، کە ئیسلام نوێنەرایەتیی دەکرد، بکرێت، کە هەر چوار یاوەرە نزیکەکەی پێغەمبەریش (درودی

---

[1]. سەعدی کوڕی ئەبو وەقاص: یەکێکە لەو یارە ناودارانەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) کە مژدەی بەهەشتیان پێ دراوە (٥٥ك /٦٧٤ز کۆچی دوایی کردووە)، چاوی بە موعاویە کەوت، دوا ئەوەی موعاویە بە شێوەیەکی نایاسایی خۆی کردە خەلیفە و دەستەڵاتداری یەکەمی بنەماڵەی ئومەوییەکان لە دژی ئارەزووی کۆمەڵەکەی. سەعد بەم شێوەیە سڵاوی لە موعاویە کرد: "سڵاوی خوات لێ بێت ئەی پادشا"، لەجیاتی ئەمیری ئیمانداران، ئەو دەستەواژەیەی موسڵمانەکان بۆ خەلیفەکانی ڕاشیدین بەکاریان دەهێنا. بڕوانە:

- ابن الأثير، الكامل. بەش٣، ل ٢٠٥. كتاب الجاحظ (ت ٢٥٥هـ /٨٦٩م)، لە ساڵی دووەمدا کە موعاویە خۆی کردە فەرمانڕەوا، خیلافەت گۆڕا بۆ شانشینیی کیسرا و زۆرداریی قەیسەر. بڕوانە:
- الجاحظ، عمرو بن بحر. تحقيق: عبدالسلام هارون، القاهرە، ١٩٦٤م، بەرگ٢، ل١٠-١١.

Lewis, The Middle East: 2000 Years of History. . . , p. 141.

- مەسعودی مێژوونووس، لە کتێبەکەیدا خەلیفەکانی ئومەوی و عەباسی بە پادشا ناو دەبات:

- المسعودی، مروج الذهب ومعادن الجوهر، سەرچاوەی پێشوو، بەرگ ٣، ل ٢٤١، تێیدا بە کورتی باسی کەوتنی ئومەوییەکان دەکات.

**خـواى لەســەر) هــەموو هــەوڵێكيان بـۆ جێبــەجێكردنى دا. هــەر بۆيــە ناشەرعييەتى سياسى لە سەدەكانى دواييدا لە بازنەيەكى بەتاڵى هۆكـار خـولاودا دەسـتى پـێ كـرد، كـە كاريگـەريى نـەرێنيى لەسـەر هـەموو لايەنەكانى كۆمەڵگاى ئيسلامى هەبوو. ئەمەش پرسيارێك دێنێتە ئاراوە: هۆى چى بوو لە دواييدا هيچ هەوڵێك بـۆ ڕزگـاربوون لـە ناشـەرعييەت و دامەزرانـدنى شـێوازێكى ئيـسلاميى نموونـەيى لـە دەسـتەڵاتدا نـەدرا؟ ژمارەيەك لە زانايان و بيرمەندان لەوبارەيەوە بيروڕاى خۆيان دەربڕيـوە و دەڵێن، هۆكـەى تـرس بـووە لـە ڕوودانـى گێرەشـێوێنى و تێكـچوونى بارودۆخەكە[1]، ئەوەش بووە هۆكارى بەردەواميى ئەو بارودۆخە.**

---

[1]. غەزالى دەڵێت: "لەبەر ئەوەى فـەرمانڕەواى سـتەمكار و نـەزان، هەرچـەند دەسـتەڵات و لابردنـى بـە ناڕەحەت يارمەتيدەرى بن، گۆڕينى پشێويەكى لەڕادەبـەدەرى لێدەكەوێتـەوە، بۆيـە پێويـستە وازى لـێ بهێنرێت، پێويستە گوێڕايەڵيى بكرێت، وەك چۆن گوێڕايەڵيى فەرمانڕەواكان دەكرێت". بڕوانە :

– الغزالي، أبـو حامـد. إحيـاء علـوم الـدين، القـاهرة، مكتبـة ومطبعـة المـشهد الحسيني، ١٩٤٧م، مـج٢، ص.١٤٠. واتە تاوەكو فەرمانڕەوا هێزى سەربازيى هەبوو، چاوەڕوان دەكرێـت ئـەو هەوڵانـەى بـۆ لابردنـى دەدرێت، گێرەشێوێنى و تێكچوونى لێ بكەوێتەوە و كێشەكانى خەڵكى زياتر ببن، بەرژەوەنـديى گـشتى لەوەدايە گوێڕايەڵيى بكرێت، وەك چۆن گوێڕايەڵيى فـەرمانڕەواكان دەكرێـت، هـەتاوەكو ئەگـەر نـەزان و نادادپەروەريش بێت. بڕوانە:

-Ahmad, Mumtaz (ed.). State Politics ans Islam. Washington: American Trust Publications, 1986.

-Osman, " The Contract for the Appointment of the Head of an Islamic State. ", p. 72-74.

## **حەوتەم: خیلافەت و دیموکراتییەت**

**خیلافەت - هەروەك زانایانی موسڵمان بە شێوەیەکی گشتی لێی تێگەیشتوون - شێوەیەکە لە شێوەکانی حکومەت، کە تێیدا خەلیفە (سەرۆکی دەوڵەت) لەلایەن گەلەوە هەڵدەبژێردرێت و بەرپرسە بەرانبەریان، لێپرسراویەتیی سەرەکیشی لە دامەزراندنی سیستمێکی دادپەروەرانە و کارکردن بۆ بەدیهێنانی خۆشگوزەرانیی خەڵکیدا خۆی دەبینێتەوە، لە ڕێگەی بەڕێوەبردنی کاروباری دەوڵەت بە پێی ڕێنماییەکانی شەریعەت و بڕیارەکانی شوورا. لەگەڵ ئەوەی شوورا بە مانای ئەنجومەنی ڕاوێژکاری دێت، بەڵام زۆربەی هەرە زۆری زانا تەقلییدی و هاوچەرخەکان، بە دەستەیەکی سەربەخۆی هەڵبژێردراوی دادەنێن، کە پێویستە هەبێت. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ﴾/ آل عمران /١٥٩، هەروەها دەفەرموێت: ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ﴾/ الشوری /٣٨، مەرجە بڕیارەکانیشی جێبەجێ بکرێن.[1] داهاتی**

---

[1]. أبو فارس، محمد عبدالقادر. حكم الشورى في الإسلام ونتيجتها، عمان، دار الفرقان، ١٩٨٨ م، ص٢٠ وص ١٩-٣٠. سەید قوتب لە تەفسیری ئەم ئایەتەدا ﴿**وَشَاوِرْهُمْ فِي الأَمْرِ فَإِذَا عَزَمْتَ فَتَوَكَّلْ عَلَى اللَّهِ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُتَوَكِّلِينَ**﴾**ال عمران /١٥٩**، دەڵێت: ئەم شێوازە گشتگیر و فراوانترە لە دەوڵەت لە ژیانی موسڵماناندا. ئەوە شێوازی کۆمەڵگای ئیسلامییە لە هەموو حاڵەتێکدا. . بەسەر ژیانی تاوەکو کۆمەڵدا زاڵە. وێنەیەکی گونجاوە بۆ هەموو بارودۆخ و کاتێك، لە دوای ئەنجامدانی ڕێگە نادات بە دوودڵی و گەڕانەوە و سەرلەنوێ ڕا گۆڕین، کە ئەمش ئەنجامەکەی ئیفلیجی و نەرێنییە و مێژووش کۆتایی نایەت. . ڕای شووراش بریتییە لە بڕیاردان و ئازایەتی و پشتبەستن بە خوای گەورە، خواش پشتبەستووەکانی خۆش دەوێت. بڕوانە:

گەنجینەی گشتی بە ئەمانەت دادەنرێت، بۆیە پێوستە داهاتەکان بە شێوەیەکی دادپەروەرانە کۆبکرێنەوە، خەرجکردنیشی پێویستە بە شێوەیەکی کاریگەر و دادپەروەرانە لە خزمەتی بەرژەوەندییەکانی گەلدا بێت. پێویستە مافی ئازادیی ڕادەربڕین لە سنووری شەریعەتدا هەبێت، پێویستە هەموو هاوولاتیان و ئەوانەشی کە موسڵمان نین، لە مافەکانیاندا یەکسان بن.[1] ئەرکی شوورا ئەوەیە کە لێپێچینەوە بکات و بزانێت خەلیفە دەستەڵاتەکانی و داهاتەکانی بە پێی شەریعەت لە پێناو خۆشگوزەرانیی گەلدا بەکار دەهێنێت، خەلیفە و ئەندامانی ئەنجومەنی شوورا، تاکو متمانەی گەلیان هەبێت، لە پۆستەکانیاندا دەمێننەوە.

شەریعەت، دەرگای والآ کردووە بۆ هەر ڕێگەیەك بگیردرێتەبەر بۆ هەڵبژاردنی خەلیفە و ئەنجومەنی شوورا، بۆیە میللەت خۆی بڕیار دەدات بە گوێرەی بارودۆخی خۆی. ئەوەی کە ڕوون و ئاشکرایە، هەڵبژاردنی هەر چوار خەلیفەی یەکەم، لەگەڵ میراتگری و بەکارهێنانی هێز، بە ئاشکرا و بە تەواوەتی پێچەوانەی ڕێنماییەکانی ئیسلامە. لە

---

– قطب، سيد. في ظلال القرآن، جدة، دار القلم، ١٩٨٦، مج١، ص٤٩٧. هەروەها لە تەفسیری ئایەتی ﴿وَأَمْرُهُمْ شُورَى بَيْنَهُمْ﴾ **الشورى /٣٨**، دەڵێت: ئەم ئایەتە بەسەر کاروباری دەوڵەتدا جێبەجێ ناکرێت، بەڵکو بەسەر کاروباری خێزان و کۆمەڵگادا جێبەجێ دەکرێت. بڕوانە:

– قطب، سيد. في ظلال القرآن، سەرچاوەی پێشوو، بەرگ ٥، ل٣١٦٥ –٣١٦٦، بڕوانە:

-Ahmad, State Politics and Islam, p. 1-22.

-Osman, " The Contract for the Appoinment of the Head of an Islamic State. ", p. 51 -84.

[1] . See: Mawdudi, Khalifat -o-Mulukiyyat, p. 83-102 and p. 157 -75. ; Lewis, The Middle East: 2000 Years of History. . . , p. 72-73.

کۆمەڵگا فرە ڕەگەزەکانی ئەم چەرخە تازەیەدا، لەگەڵ بوونی هەموو هۆیە خێراکانی گەیاندن و توانای بەئەنجامگەیاندنی هەڵبژاردن لە هەموو ناوچەکانی وڵاتدا، بۆیە باشترین ڕێگە بۆ هەڵبژاردنی خەلیفە و ئەندامانی ئەنجومەنی شوورا، هەڵبژاردنە بە شێوەی دەنگدانی نهێنی، لەگەڵ ئەنجامدانی هەندێ چاکسازی لە سیستمی هەڵبژاردندا، بە شێوەیەك ڕۆڵی سامان و دەستەڵات و گەندەڵی لە هەڵبژاردندا کەمبکرێتەوە.

ئەمە وا دەکات دیموکراتییەت و خیلافەت دوو شتن کە زۆر لە یەك دەچن، بەڵام لەگەڵ ئەوەی کە گەل سەرکردەکانی هەڵدەبژێرێت و لێپرسراوێتیی ئەم سەرکردانەش لە بەردەم گەلدا دوو شتی هاوبەشن لە نێوان خیلافەت و دیموکراتییەتدا. بۆیە گەل خودی خۆی و سەرکردەکانی، لە سایەی خیلافەتدا ئازادیی ڕەهایان نییە، ئەوان پابەندی گرێبەستێکی ئامانج و پەیوەستەی ڕەوشتی و دامەزراوەییەکانن، کە پابەندن بە شەریعەتەوە، ڕێگەیان پێ نادرێت لە ڕێگە لا بدەن، هەتاوەکو پابەندن بە ئیسلامەوە. فاگلیری (Vaglieri) دەڵێت خیلافەت دامەزراوەیەکە "هاوشێوەی نییە، چارەنووسیشی وایە کە نموونەی لە دەرەوەی جیهانی ئیسلامیدا نییە".[1]

---

[1] . Vaglieri, Laura. " The Patriarchal and Umayyad Caliphates. " In P. M. Holt, Ann Lambton and Bernard Lewis (eds. ), The Cambridge History of Islam, Cambridge: Cambridge University Press. 1970, Volume 1, p. 57.

لەوانەیە فاگلیری (Vaglieri) ڕاست بکات، ئەگەر وا دابنـێین هـیچ کۆتوبەندێك لەسـەر دیموکراتییـەت نییـە، بـەڵام سـەرەڕای ئـەوەی کـە عەلمانییە، ڕاست نییە، ئەوەی عەلمانییەت لە ڕۆژئاوا هێنـای، بریتییـە لـە خـۆ ڕزگـارکردن لـە تایبەتمەندییـەکانی کەنیسە، بـەڵام پەیوەسـتە ڕەوشتییەکان هەموو کات بەردەوامن. ئەمەش تا ئاستێکی گەورە زیاتر لە دەستوور و دامەزراوەکانی تردا، لە وڵاتە دیموکراتە جۆراوجۆرەکاندا بـە باشـی دەردەکـەوێت، ئەمـە یەکێکـە لـە هۆیـەکان کـە وای لـە دیموکراتییەت کرد بە شێوەیەکی گشتی، پاڵپـشت بێـت بـۆ دادوەری و خۆشگوزەرانی لە کۆمەڵگا ڕۆژئاواییەکاندا، بەو ڕێژەیەی کە لـە سـایەی عەلمانییەتدا دێتە دی.

بە ڕەچاوکردنی نەبوونی کەنیسە لە ئیسلامدا تاوەکو خـۆی بەسـەر حکومەتـدا بـسەپێنێت و پەیوەسـتە ڕەوشـتییەکانیش بەسـەر دیموکراتییەتدا، لەبەر ئەوە جیاوازییەکی گەورە لە نێوان دیموکراتییەت و خیلافەتدا نییە. لەگەڵ ئەوەشـدا لەوانەیـە دیموکراتییـەت بـە تیـۆری بتوانێت سیـستمی ڕەوشـتیی کۆمەڵگایـەك پێـشێل بکـات، ئەمـەش بـە ئاسایی ڕوو نادات. ئەگەر هەر لەڕێدەرچوونێك ڕوو بدات، دەبێتـە هـۆی ڕەنگدانەوەی ڕوودانی گۆڕانکاری لە بـەهای گۆمـەڵگادا بـە شـێوەیەکی سەرەکی، ئەمەش بە زۆری و کتوپڕی ڕوو نادات، بەڵکو وردە وردە و لە ماوەیـەکی دوورودرێـژدا ڕوو دەدات. ڕێگەپێـدانی یاسـایی قومـار و خواردنەوەی مەی و نێربازی و پانپانۆکێ و بێئابڕوویی کـە زگوردەکـان

(ڕەبەن) لە هەندێ کۆمەڵگای دیموکراتیدا دەیکەن، هەموو نموونەن بۆ لادان لە بەهاکان. ئەمانەش دەبنە هۆکار بۆ هەندێ کێشەی دیکە، لەوانە پچڕانی خێزان، هەروەها کاریگەریی نەرێنی دەکاتە سەر ڕەوشت و خۆشگوزەرانی ماددی لەو کۆمەڵگایانەدا، ئەمەش وا دەکات سێبەری دەستەڵاتی ئابووری و تەکنۆلۆژیا و سەربازیی ئەم کۆمەڵگایانە لە ئایندەدا بەردەوام بێت. بۆیە یاسای ڕەوشت، دەبێتە مەڵبەندی سەرەکی لە هەموو شوێنێك و لێ دەربازبوونی نییە. ئەمەیە مەبەستی قورئان کاتێ دەڵێت: ﴿**وَتَمَّتْ كَلِمَتُ رَبِّكَ صِدْقًا وَعَدْلًا لَا مُبَدِّلَ لِكَلِمَاتِهِ وَهُوَ السَّمِيعُ الْعَلِيمُ**﴾ **الأنعام /١١٥**، هیچ میللەتێکیش ناتوانێت خۆی لە کاریگەرییە نەرێنییەکانی پێشێلکردنی یاسای ڕەوشت بەدوور بگرێت، بە بێ ڕەچاوکردنی ئایینی ئەو میللەتە، ئیتر موسڵمان یاخود عەلمانی بن. بۆیە زیادەڕۆییکردن لە جیاوازیکردن لە نێوان دیموکراتییەت و خیلافەتدا، کەمێك ناواقیعییە.

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) وردە وردە دەستی کرد بە دانانی کۆمەڵەیەکی یەکگرتوو لە سیاسەتەکان و چەند دامەزراوەیەکی دامەزراند ماوەی جێبەجێکردنی بڕەخسێت "لە پێناو جێگیرکردنی یاساکانی سیستمی ئیسلامی"[(١)]. دەیتوانی بەردەوامییەکی زیاتر بۆ

---

[1]. Watt, W Montgomery. "Muhammad" In P. M. Holt, Ann Lambton and Bernard Lewis (eds. ), The Cambridge History if Islam. Cambridge: Cambridge University Press. 1970, Volume I, p. 55.

خەلاقــەت دابــین بکــات، لــە ڕێگــەی لابردنــی هــەموو پەیکــەرەکانی دەستەڵاتی ئەو کاتە، کـە لـەناو کۆمـەڵگادا زۆر بـوون، ئـەم پـەیکەرانـە ئەشــکەنجە و چەوســاندنەوەیان بەرانبــەر موســڵمانان ئــەنجام دەدا، ناچـاریان دەکـردن بـۆ کۆچـکردن، بـە بـەردەوامی لـە دژیـان شـەڕیان دەکـرد. دوای فـەتحی مەککـە لـە ٨ك/٦٢٩ز دا، مـاوەی بـۆ ڕەخـسا و توانای هەبوو ئەم ئەرکـە جێبـەجێ بکـات (سـزای کۆمـەڵگا کافرەکـەی مەککە بدات) بەڵام ئەم کارەی نەکرد، چونکە ئەمە نموونەیەکی خراپـی نیشان دەدا، بۆیە حەزی نەدەکرد ئـەم کـارە بکـات. لـەبری ئـەوە، لـە هەموویان خۆشبوو، لەگـەڵ ئـەوەی ئـەو پێـشبینیی دەکـرد، هـەر وەك هەنــدێ فــەرموودە دەیــسەلمێنن، کــە نــەوەی هەنــدێکیان لەوانەیــە پەیکـەری ئـەو دەسـتەڵاتە لـە ئاینـدەدا زینـدوو بکەنـەوە.[1] لەوانەشـە پێغەمبـەر (درودی خـوای لەسـەر) بـیری لـەوە کردبێتـەوە ناتوانرێـت پەیکەرەکانی دەستەڵات بە شێوەیەکی هەمیشەیی لەناو بـبرێن، بـەڵکو

---

[1]. پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) دەفەرموێت "لە دوای من هەندێ پێشەوا دێن پابەندی ڕێنماییەکانی من نابن، هەندێ پیاویان لێ دەردەچێت دڵیان وەك دڵی شـەیتانە لـە لەشـی مرۆڤـدا". (لـە حوزەیفـەی کوڕی یەمانەوە، لە صحیحی موسلم، بەرگ ٣ ل ١٤٧٦ :٥٢، کتاب الإمارة، الباب ١٣). لە فەرمودەیـەکی تریشدا هـاتووە کـە "خەلافـە لـە دوای مـن بـۆ ئومەتەکـەم سـی ساڵە، پاشـان پادشـا دێـت". أحمـد والترمذي ومسند أبي يعلى وابن حبان).

ــ السـيوطي، جـلال الـدين. الجـامع الـصغير، القـاهرة، عبدالحميـد أحمـد حنفـي، د. ت، بـەرگ١، ل١٣. هەروەها لە فەرمودەیەکی تریشدا بە هەمان دەق هاتووە لە (أبو هريرة، حديث صحيح نقلـه الـسيوطي في "الجامع الصغير"، بەرگ ١، ل١٢. پشتبەست بە "مسند أحمد "، الترمذي، مسند أبي يعلى، وصحيح ابن حبان) هاتووە.

له دەستێکەوە دەگوازرێتەوە بۆ دەستێکی تر و هەوڵ دەدات جارێکی تر بگەڕێتەوە و جەخت لەسەر خودی خۆی بکاتەوە. پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) ویستی ڕێگەیەکی ڕەوشتیی بەرز بۆ دەستبەسەراگرتنی پەیکەرەکانی دەستەڵات بگرێتەبەر، بە پەیڕەوکردنی شێوازێکی خۆی بۆ بێهزکردنیان، لە ڕێگەی ڕۆشنبیرکردنی خەڵکی و چاککردنی بارودۆخی کۆمەڵایەتی - ئابوورییان و دانانی ڕێنمایی چاودێریی کاریگەری ڕەوشتی و یاسایی و دامەزراوەکانی دی، کە لغاویان بکات، بە شێوەیەك نەتوانن دەستەڵاتێکی ڕەها یان ناڕەهایان دەست بکەوێت و بەکاری بهێنن.

## هەشتەم: چەسپاندنی ناشەرعییەت یاخود بەهێزکردنی

ئەوەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) پێشبینیی دەکرد، ڕووی دا. دوای دامەزراندنی دەوڵەتی ئومەوی (٤١-١٣٢ك/ ٦٦١-٧٥٠ز) پەیکەرەکانی دەستەڵاتی سەردەمی جاهیلی دەرکەوتنەوە. ئەو ڕێنماییە ئیسلامییانەی تایبەت بوون بە بەڕێوەبردنی دەوڵەت، پەیڕەو نەدەکران، کە پێویست بوو لە دامەزراوە سیاسییەکانی جیهانی ئیسلامیدا پەیڕەو بکرێن. چەند شۆڕشێکیش ڕوویان دا، بەڵام — وەك پێشتر باسمان کرد — هیچ سەرکەوتنێکیان بەدەست نەهێنا، چونکە "ئەم لایەنە ئامانجی دەستەڵاتی کەسێتیی گەورەتر بوو، نەك کەمتر، لە

پادشا و داروده‌سته‌كه‌ی". [1] عومه‌ری كوڕی عه‌بدولعه‌زیز (١٠١ك/٧٢٠ز كۆچی دوایی كردووه) خه‌لیفه‌ی هه‌شته‌م، له‌ناو دوازده خه‌لیفه‌ی زنجیره ده‌سته‌ڵاتداره‌كانی ئومه‌ویدا، هه‌وڵی دا ئه‌م ناشه‌رعییه‌ته قه‌ده‌غه بكات، به‌ڵام هه‌وڵه‌كه‌ی سه‌ری نه‌گرت و ده‌رمانخوارد كرا، دوای ماوه‌یه‌كی كورتی حوكمڕانی كه نزیكه‌ی دوو ساڵ و نیوی خایاند، خاوه‌ن به‌رژه‌وه‌ندییه‌كان كوشتیان. ئه‌مه‌ش به شێوه‌یه‌كی گشتی چاره‌نووسی زۆربه‌ی هه‌ره زۆری چاكه‌خوازه‌كان بووه، كه ویستوویانه چاكسازی له دامووده‌زگای سیاسی و ئابووریدا بكه‌ن، به شێوه‌یه‌ك ڕێگر و له‌غاوكه‌ری خاوه‌ن به‌رژه‌وندییه‌كان بێت.

عه‌باسییه‌كان له ١٣٢ك/٧٥٠ز پاش ئه‌وه‌ی ئومه‌وییه‌كانیان ڕووخاند، هاتنه سه‌ر ده‌سته‌ڵات، ئه‌مه‌شیان وا پینه‌كرد، گوایه هاتوون ئه‌وه‌ی ئومه‌وییه‌كان خراپیان كردووه، ئه‌مان چاكی ده‌كه‌نه‌وه له بنیاتنانه‌وه‌ی ده‌وڵه‌تدا. به‌ڵام به‌ڵێنه‌كه‌یان به‌جێ نه‌هێنا. كه شتێك نه‌بێت ناچاریان بكات بیكه‌ن، بۆچی بیكه‌ن؟! پێویسته پابه‌ندبوونی ڕه‌وشتی به چوارچێوه‌یه‌كی یاسایی و دامه‌زراوه‌یی گونجاوه‌وه په‌یوه‌ست بێت، ده‌كرا پابه‌ندی په‌یمانه‌كه‌ی خۆیان بن، ئه‌گه‌ر به‌رپرس بوونایه له‌به‌رده‌م گه‌لدا، ئه‌گه‌ر دانانیان و لابردنیان له ده‌سته‌ڵاتدا به ده‌ست گه‌له‌وه بووایه. له سایه‌ی ڕژێمێكی میراتیی یه‌ك له دوای یه‌ك بۆ سه‌ر

---

[1]. Lewis, The Middle East: 2000 Years of History. . . , p. 144.

کورسی دەسەڵات، گەلیش ئەم ماف و دەسەڵاتانەی نەبوو، دەستەڵاتدارەکانیش هیچ ترسێکیان لە گەل نەبوو، ئەگەر پابەندیش نەبوون بەو بەڵێنانەی داویانە بەو گەلەی فەرمانڕەواییان دەکرد، بێگومان گەل دەیتوانی هەستێت، بەڵام ئەو شۆڕشانە بە بێبەزەییانە کپدەکرانەوە.

عەباسییەکان لە سەردەمی خیلافەتی هاروونە ڕەشیددا (١٧٠-١٩٣ك/ ٧٨٦- ٨٠٩ز) گەیشتنە ئەوپەڕی دەسەڵات. دوای ئەوە خلیسکانێکی خێرا ڕووی دا، ئەمانیش وەك پێشینەکانیان لە ساسانییەکان و بیزەنتینییەکان، دەستیان بە بەکارهێنانێکی ڕەهای بێسەروبەرەی میراتگری کرد، لە ئەنجامی میراتگریش جەنگ ڕووی دا، کە خیلافەت بۆ کام لە هەردوو کوڕەکەی (ئەمین و مەئمون) بێت، شۆڕشیش لە هەموو ناوچە جۆراوجۆرەکانی ئیمپراتۆرییەت بەرپا دەبوو. تێکچوون و نائارامی بە گشتی بڵاوبووبووەوە، بە تایبەتی کاتێك مەئمون هەندێ لە بیروباوەڕەکانی موعتەزیلەی سەپاند، کە پەسەند نەبوون و دژی خواستی کۆمەڵی موسڵمانان بوون. هەرەسهێنانەکە زیاتر بوو، کاتێك خەلیفەکانی عەباسی بوونە بووکەڵەیەك بە دەست بوەیهییەکان (٣٣٤-٤٤٧ك/٩٤٥-١٠٥٥ز) و سەلجوقییەکانەوە (٤٤٧-٥٩٠ك/ ١٠٥٥-١١٩٤ز) کە ئەمانیش نە خۆیان و نە دەستوپێوەندەکانیان لە دەسەڵات، ئەو کۆنترۆڵ و ڕێکخستنەیان نەبوو کە عەباسییەکان هەیانبوو، بە هۆی ئەو دەسەڵاتە سیاسییەی

که هەوڵیان بۆ دەدا، پاڵپشت بە خزمایەتییان لەگەڵ (عباس)ی مامی پێغەمبەر و بانگەشەکردنیان بۆ چاکسازی.

دیاره داگیرکردنی مەغۆل (٦٥٦-٧٥٨ك/١٢٥٨-١١٩٤ز) و داگیرکردنی تەیموور لەنگەکان (ئاماژەیە بۆ تەیموور لەنگ) (٧٣٤-٨٠٧ك/١٣٣٦-١٤٠٥ز) ناڕەحەتترین و زۆرترین وێرانکاری و چەوساندنەوەبوو کە مێژووی ئیسلامی بەخۆوە بینیبێتی. کاتێ ئیمپراتۆرییەتی مەغۆلەکان و تەیموور لەنگەکان پاش هاتنیان بۆ سەر دەستەڵات، دابەشبوون بە چەند دەوڵەتێك، جیهانی ئیسلامی پەرتەوازە بوون و چوونە ژێر دەستی چەند بنەماڵەیەکی فەرمانڕەوا، بەم شێوەیە پێناسەی بازاڕی هاوبەش - کە خەریك بوو بەرهەمی خۆی دەدا و گەشەپێدانیش خەریکبوو پێدەگەیشت - تا ڕادەیەکی زۆر هەموو لەناوچوو، ئەگەر هەمووشی نەبێت و دووبارە دروست نابنەوە، تاوەکو لە سەردەمی عوسمانییەکاندا بەشێکی جیهانی ئیسلامی هەرچۆنێك بێت، خراپ نەبوو، یەکیان گرتەوە، کاتێ میسر و سووریایان لە ٩٢٣ك/١٥١٧ز داگیر کرد و بەغدا و تەبرێزیش لە (٩٤٠ك/ ١٥٣٤ز)دا.

دیاره نازناوی خەلیفە، ڕێز و شکۆی تایبەتی خۆی هەبوو، بۆیە فەرمانڕەوایانی بنەماڵەی دەستەڵاتەکان، بە تایبەتیش ئومەوییەکان (٤١-١٣٢ك/ ٦٦١-٧٥٠ز) و عەباسییەکان (١٣٢- ٦٥٦ك/٦٦١- ٧٥٠ ز) و عوسمانییەکان (٦٩٨-١٣٤٢هـ / ١٢٩٩-١٩٢٤ز) پێیان باش بوو، لە لایەنە سیاسییەکەشیەوە سوودیان لەوە دەبینی خۆیان بە خەلیفە

ناو بنێن، بەڵام ئەمە نەبووە پێناسەیەکی ناشەرعی و بە درێژایی مێژوو یەکێکە لە هۆیە سەرەکییەکانی ناکۆکیی نێوان زانایانی موسڵمان و فەرمانڕەواکان. بە نەمانی نازناوی خەلیفە، هەردوو وشەی سوڵتان و پادشا ناوبانگیان دەرکرد. هەردوو دامەزراوەی شوورا و بەیعە، بە شێوەی پراکتیکی، تەنها کۆپییەکی گاڵتەجاری بوون. گەر بەراورد بکرێن لەگەڵ سەردەمی خەلیفە ڕاشیدییەکاندا، هیچ ڕۆڵێکیان نەبینی لەوەی چاوەڕوانییان لێ دەکرا، لە ڕاگرتنی زۆرداریی فەرمانڕەواکان.

بێجگە لە هەندێ فەرمانڕەوای لە خواترس، کە لە میانەی نزیکەی ئەو ماوە جۆراوجۆرەی بنەماڵەی دەستەڵاتدارەکاندا دەبینران، و لێهاتووش بوون، هەوڵیاندا هەندێ کاری گرنگ بکەن کە پەیوەندی بە خیلافەتەوە هەبێت، بەڵام زۆربەی هەرە زۆری فەرمانڕەواکان، پادشابوون و دەستەڵاتی ڕەهایان هەبوو، فەرمانڕەواتییەکەیان ڕەنگدانەوەی ڕێنماییەکان ئیسلام نەبوو. یەکسانی لەبەردەم یاسا و ئازادی ڕادەربڕین وردە وردە بەرەو هەڵدێر دەچوون، ئەمانەش هەموو پێشێلکردنێکی زەقی شەریعەت بوو.

خەڵکانی لێهاتوو لەو شوێنە گرنگەکاندا دانەدەمەزران، بەڵکو خەڵکانی ماستاوچی کە هیچ شتێکیان پێشکەش نەدەکرد و ناشتوانن هاوکارییەکی بەسوود پێشکەشی وڵات بکەن، دەوروبەری سوڵتانیان گرتبوو. بە هۆی مەراییکردن و وتنی ئەوەی کە فەرمانڕەواکان پێیان خۆشبووایە، هەموو شتە بەسوودەکانیان بۆ خۆیان وەردەگرت. لە

کۆشکەکاندا پیلانگێڕی و شەڕی زۆر قورسیش لەسەر خیلافەت ڕووی دەدا، سەرەڕای کودەتای سەربازی کە داهاتی میللەتی بەهەدەر دەدا و وزە داهێنەرەکانی لەناو دەبرد و بووە هۆی داڕمانی تەواو. دەستاودەستکردنی دەستەڵاتیش – هەتاوەکو لە ناو یەك خێزانیشدا – بەبێ خۆێنڕشتن تێنەپەڕیوە، وا دیارە سوپاش ڕۆڵێکی یەکلایکەرەوەی لە شوێنگرتنەوە و گواستنەوەدا بینیوە. هەمیشە شەڕی میراتگرییش دەبووە هۆی ناسەقامگیریی ئاسایش وڵات، ئەمەش کاریگەریی خراپی دەکردە سەر بەرهەم و ئابووری، بە تایبەتیش کاتی دیاریکردنی باج کە دەبێت سەرلەنوێ بیدەنەوە بە دەستەڵاتی نوێش، لە کاتێدا پێشتر باج بە دەستەڵاتی پێشوو دراوە بۆ ئەوەی گیروگرفتە داراییەکانیانی پێ چارەسەر بکات. کەواتە هۆدجسۆن (Hodgson) ڕاست دەکات کە دەڵێت: "شارستانییەتی ئیسلام بەو شێوەیەی بینرا، زۆر دوورە لەوەی کە دەربڕی ڕاستەوخۆی ئایینی ئیسلام بێت."(١)

مەبەستمان ڕوونکردنەوەی ئەوە نییە کە بەردەوامی خیلافەت و شوورا لەوانەیە چارەسەری هەموو شتێك بن و بەوان هەموو ناکۆکی و گیرگرفتەکان نامێنن، ئەو بەردەوامییە ئەو ئەنجامەی نەدەبوو، بەڵام لێپرسینەوەی دەستەڵاتی سیاسی، هەروەها ئازادیی گەل لە ڕەخنەگرتن لە سیاسەتی حکومەت و فەرمانبەرانی حکومەت، دەبووە هۆی

---

1 . Hodgson, The Venture of Islam, Volume 1, p. 71.

دروستکردنی حکومەتێکی کاریگەر، حکومەتێك بتوانێت جێبەجێکردنی دادوەری و فەراهەمکردنی یاسا و ڕێنماییەکان و بەکارهێنانێکی کاریگەری داهاتەکان، لە پێناو پێشکەوتنی گشتیدا دابین بکات.(١)

سەرەڕای عەلمانییەت، حکومەتە دیموکراتییەکان لە ڕۆژئاوا کاریان بۆ بڵاوکردنەوەی دادپەروەری و بەدەستهێنانی گەشەپێدان و خۆشگوزەرانیی گشتی کردووە، چونکە تا لێپرسینەوە و ئازادیی ڕادەربڕین زیاتر بێت، دەستەڵاتی سیاسی زیاتر پابەندی بەڵێنەکانی دەبێت، ئەمەش بە هەژانی ویژانییانەوەیە بەرانبەر گەلەکانیان. گفتوگۆی ئازاد سەبارەت بە کێشەکان، ڕێخۆشکەر دەبێت بۆ دەستنیشانکردنی چارەسەری ڕاست و دروست، هەروەها لێپرسینەوە پاڵ بە دەستەڵاتی سیاسییەوە دەنێت کە پشت بە چارەسەری کاریگەری پێشوەخت بۆ چارەسەرکردنیان ببەستێت.

ئەمە ئەوە ناگەیەنێت کە دیموکراتییەت دەتوانێت هەمیشە فەرمانڕەوای دەستپاك و لێهاتوو بەرهەم بهێنێت، فەرمانڕەوا

---

[1]. بانکی نێودەوڵەتی دووپاتیدەکاتەوە کە: "گەشەپێدان پێویستی بە دەوڵەتێکی کاریگەرە، ڕۆڵی هاندەر و کارئاسانکەر ببینێت، هاندەر و تەواوکەری چالاکی و کارەکانی تایبەت و تاکەکان بێت، بێگومان ئەو گەشەپێدانەی دەوڵەت بڕیاری لەسەر دەدات، سەرناکەوێت، بەڵام گەشەپێدانیش بە بێ دەوڵەت سەرکەوتوو نابێت. مێژوو چەندین جار ئەمەی دووبارە کردووەتەوە کە حکومەتی باش (حوکمی لێهاتوو و کارامە) ڕابواردن و خۆشی نییە، بەڵکو پێویستییەکی ژیارییە، بە بێ دەوڵەتێکی کاریگەر، مەحاڵە گەشەپێدانێکی هەمیشەیی هەبێت. بڕوانە:
-World Bank, World Development Report, 1997, p. 111.

ناشەرعییەکانیش ناتوانن حکومەتێکی کاریگەر بەدەست بهێنن، چونکە دیموکراتییەت ڕێگەی بۆ ژمارەیەك فەرمانڕەوای بێ توانا و گەندەڵ لە هەموو ناوچەکانی جیهاندا خۆش کردووە، کە لە کاتێکدا ژمارەیەك فەرمانڕەوای بەتوانا و لێهاتوو، سەرەڕای نەبوونی شەرعییەتی سیاسی تێیاندا، لە مێژووی ئیسلامیدا هەن. هەرچەندە ئەمە ئەنجامی کۆتایی دامەزراوەیی نییە، بەڵکو ئەمە تەنها بە خواستی خۆیان بووە، بە دەگمەن ئەمەش دوای مردنیان بەردەوام بووبێت. ئەگەر خیلافەت بەردەوام بووایە، دەتونرا بگەیەنرێتە میکانیزمێك بۆ گواستنەوەی دەستەڵات بە شێوەیەکی ئاسان و ئاشتییانە، ئەمەش هۆکارێك دەبوو بۆ دوورکەوتنەوە لە شەڕی میراتگری و خوێنڕێژی و وێرانکردن و نائارامی و ئەو شتانەش کە بە دوای خۆیاندا دەیهێنن، دەبووە هۆی دەستەبەرکردنی دەستەڵاتی یاسا و ڕێزگرتن لە ژیان و ماڵ و موڵك بە پێی شەریعەتی ئیسلامی. لەوانەش بوو ببێتە کارئاسانی و بەردەوامییەك بۆ دامەزراندنی کەسانی بەئابڕوو و لێهاتوو لە پۆستە باڵاکاندا، وەك چۆن لە سەدەکانی پێشوودا پەیڕەو دەکرا، بە تایبەتیش لە پۆستی دادوەرەکاندا، کە ئەمە دەبووە یارمەتیدەرێك بۆ کەمکردنەوەی ڕێژەی ستەم و گەندەڵی، فشاری جەماوەریش دەبووە هۆکارێك بۆ زیاتر چەسپاندنی دادپەروەری لە وەرگرتنی باجدا. هەروەها دەتوانرێت ببێتە هۆکارێك بۆ دوورکەوتنەوە لە حاڵەتی کورتهێنانی دارایی درێژخایەن لە ئەنجامی کەمبوونەوەی ڕێژەی گەندەڵی، دەبوو بە داهاتێکی زۆری گشتی و بۆ بەرژەوەندییە گشتییەکان بەکار دەهێنرا، نەك بەکاربهێنرێن بۆ بەرژەوەندییە کەسییە تایبەتییەکان.

لە دوا قۆناغدا ئەو بڕەی ئیسلام دابینی دەکرد لە پێناو گەشەپێداندا، لەناو نەدەچوو.

جیهانی ئیسلامی تا ئێستا نەیتوانیوە ڕێوشوێنێکی وا بگرێتەبەر بۆ جێبەجێکردنی گواستنەوەیەکی ڕێکوپێکی ئاشتیيانەی دامودەزگاکانی دەستەڵات بۆ زۆرینەی ئەو خەڵکە ڕاست و لێهاتووانەی لە بەرچاوی گەلدان، داهاتە گشتییەکان بە شێوەیەکی کاریگەر و دادوەرانە و بە پێی شەریعەت بەکار بهێنرێن، ڕەخنەش بە ئازادی و بە بێ ترس لە حکومەتەکان بگیرێت. تا ئێستاش دەستگرتن بە سەردەستەڵاتەوە بە هۆی کودەتاوە، یان لە ڕێگەی میراتگرییەوە، لە زۆربەی هەرە زۆری وڵاتانی ئیسلامیدا تەنانەت لە کاتی هەڵبژاردنیشدا بەردەوامە. بنیاتی ئابووری – کۆمەڵایەتی ڕێگەی بە سوپا و ژمارەیەك لە دەستوپێوەندی چواردەوری دەستەڵات یان پیاوانی پیشەسازی دەردرێت، بۆ جێگیرکردنی زیاتری دەستەڵاتیان بەسەر کاروباری دەوڵەتدا، بۆیە بەکارهێنانی داهاتی گشتی لە پێناو بەرژەوندیی تایبەتدا هێشتا بەردەوامە، پاڵپشتیشیان فەرمانڕەواکەیە، ئیتر ئەو فەرمانڕەوایە پەیڕەویی سیاسەتی خیلافەت دەکات، یان پاشایەتی، هێشتا لای جەماوەر زەحمەتە ڕەخنە لە سیاسەتی حکومەتەکان بگرێت. بەڵام چاکسازیی پێویست بۆ هێڵی ڕووبەڕووبوونەوەی سیاسی لە مێژووی ئیسلامیدا ـ کە ئەمە یەکێك بووە لە هۆکارە سەرەکییەکانی لەڕێلادان ـ وەك دەردەکەوێت ئێستا وردە وردە بە هۆی بارودۆخەکانەوە دەکرێت، کە لە بەشی نۆیەمدا ڕوونی دەکەینەوە.

## نۆیەم: کاریگەریی بەرگری لە شەریعەت

کۆمەڵگاکان بە خێرایی ماری ژەهراوی ناکەونە شاری یارییەکانـەوە. ئیبن خەلدون ماوەی سێ نـەوە یـان ١٢٠ سـاڵی بـۆ بێهزبـوونی بنەماڵـە فـەرمانڕەواکان دانـاوە. لەبـەر ئـەوەی ئێمـە بـە تایبـەتی بـاس لـە شارستانییەتی ئیسلامی دەکەین، ئەو ماوەیەی ئەو دایناوە، بەسەر ئەم حاڵەتـەدا جێبـەجێ ناکرێـت. ئەگـەر یـەکێك لـە کەرتـەکانی کۆمـەڵگا دووچاری ئیفلیجی هات، ئەوا کەرتەکانی تـر هەنـدێ لـە کارەکـانی ئـەو ڕادەپەڕێنن. کۆتایی خیلافەت نەبووە هۆی کۆتایی تـەواوی کاریگـەریی شەریعەت، بەڵکو بەردەوام بوو لە کاریگەری لە دڵ و دەروونی خەڵکیدا، لە هەموو بوارەکانی ژیاندا، وەك هێزێکی نەیار بۆ زۆرداری و ستەمکاری کاری کرد.[1] بۆیە سەرەڕای ناشەرعییەت "بەڵام ئـەو دەسـتەڵاتەی بـە دەست خەلیفە پێشینەکانەوە بوو، زۆر دوور بـوو لـە زۆرداری، چـونکە پابەندبوو بە ڕەوشتی سیاسیی ئیـسلامەوە، هـەروەها خـوو و نـەریتێك دژی دەستەڵاتخوازی لە وڵاتانی عەرەبیی کۆندا هەبوو".[2] ئەگەر ئەمـە و دووپاتکردنــەوە و دووبارەکردنــەوەی پێــداگری لەســەر کاریگــەریی شەریعەت نەبووایە، ماوە بە مـاوە، ئەگـەر بـە کـەمییش بووبێـت، ئـەوا جیهــانی ئیــسلامی بــە خێرایــی دووچــاری لاوازی و پەراوێزخــستن

---

[1]. Bulliet, Richard W. The Case for Islamo -Christian Civilization. New York Columbia University Press, 2004.

[2]. Lewis, The Middle East: 2000 Years of History. . . , p. 140.

دەبووەوە. توینبی (Toynbee) تێبینیی کردبوو و دەڵێت: "ئەو ئایینەی لە ڕاکێشانی خەڵکی بۆ لای خۆی بە هۆی چاکە و ڕەسانایەتییەکەیەوە سەردەکەوێت، ئەوا خۆڕاگر نابێت، یاخود لەگەڵ ڕژێمە سیاسییەکاندا ڕووخێت، کە یەك لە دوای یەك هەوڵیان دەدا بۆ مەرامە نائایینییەکان بەکاری بهێنن.[١]

کاریگەری شەریعەت بە شێوەیەکی گشتی، بە پلەیەکی بەهێز لە دەروونی خەڵکیدا جێگیر بوو، بە ڕادەیەك ئەو پادشایانەی خاوەن دەستەڵاتی ڕەها بوون، نەیاندەتوانی بە تەواوەتی خۆیانی لێ گێل بکەن و لەژێر هەندێ پێوەندی ڕەوشتی توندابوون بۆ بەردەوامبوون لە جێبەجێکردنی هەندێ ئەرکی ئایینی و بەهای خۆشگوزەرانی، کە پەیوەستبوون بە خیلافەتەوە. ئەو کاتە و ئێستاش هەر وەك ئیبن خەلدون پێی دەڵێت تێکەڵەی (خیلافەت) و (پادشایەتی) هەیە و تا ئەمرۆش پەیڕەو دەکرێت.[٢] پەسەندکردنی ئەمیان یاخود ئەویان، بە گوێرەی کەسایەتیی فەرمانڕەوا و بارودۆخەکەیەتی. لەبەرئەوەی

---

[1]. Toynbee, A Study of History, abridgment by D. C. Somervell, Volume 2, p. 31.

[2]) دوای گفتوگۆکردن سەبارەت گۆڕانی خیلافەت بۆ دەستەڵاتی پادشایەتی، لە بەشێکی تەواودا (المقدمة، ل ٨–٢٠٢ و: ڕۆزنتال، مج١،ل٢٨–٤١٤) ئیبن خەلدون لە کۆتاییدا دەڵێت: "بینیم چۆن کارەکە کەوتە دەست پادشا، مانای خەلیفەش لە چوارچێوەی ئایین و مەزهەب و گەڕان بە دوای ڕاستییەکاندا مایەوە. پاشان مانای خیلافەتیش تەنها ناوەکەی مایەوە، هەموو شتێك بۆ پادشا دەگەڕایەوە، چۆنیەتی سەرکەوتنیش بووە ئامانج و بۆ بەدیهێنانی مەبەستەکانیش چەندان جۆر ئاڵوگۆڕ لە ئارەزووەکانیاندا دەکرا". (ابن خلدون، المقدمە، بەرگ ١ ل٤٢٧).

نازناوی "خەلیفە" تایبەتمەندیی خۆی هەیە، تا ماوەیەکی دوورودرێژ بەکار دەهێنرا، ئەمەش دەبووە پاڵپشتێك بۆ بەهێزکردنی دەستەڵاتی فەرمانڕەواکان، لە ئومەوییەکانەوە تاوەکو عوسمانییەکان، سەرەڕای ناشەرعییەتیان، بەتوانا و دادپەروەر بوون، یارمەتیدەربوون بۆ کەمکردنەوەی ڕێڕەوی داڕمان، بۆیە دارمانەکە زۆر توند نەبوو. بەڵام سیستمی دادوەری بە بێ ترس - تا ڕادەیەکی زۆر - بۆ ماوەی چەند سەدەیەك هەر بە پاکی و ئاستبەرزی مایەوە. ئەمەش بووە هاوکارێك بۆ پاراستنی یاسای دادوەری و ڕێگەگرتن لە کاری هەڕەمەکیی دەوڵەت و دەستەبەرکردنی پابەندبوون بە پەیمانەکان و فەراهەمکردنی دادپەروەری بۆ ستەملێکراوان. فراوانکردنی بەرهەم و ئابووری و خۆشگوزەرانیی گەل بەردەوام بوو. ڕاستگۆیی و ڕێکوپێکی و خۆشەویستییان بۆ کارەکانیان هیچ کاریگەرییەکی پێوە دیار نەبوو، مەگەر وردە وردە. شاتزمیللەر Schatzmiller ڕاست دەکات کە دەڵێت: "کۆمەڵگای ئیسلامی لە سەدەکانی ناوەڕاستدا لە – چەند لایەکەوە– لە ئاستێکی خۆشگوزەرانتر و کامەرانتردا بوون".[1]

هەر وەك نموونەکەی ئیبن خەلدون ئاماژەی بۆ دەکات، بێگومان لاوازیی کاریگەریی شەریعەت لە گۆڕەپانی سیاسیدا، دەبێتە – ئەگەر پێچەوانەی ڕێڕەوەکەی نەبێت – هۆی وردە وردە لاوازبوونی

---

1 . Schweitzer, Alfred. The Philosophy of Civilization. New York: Macmillan, 1949, p. 1.

دەستەڵاتی لە گۆڕەپانەکانی تری ژیاندا. هەروەها سیستمی بازاڕ بە بێ کێبڕکێ و هەبوونی بازاڕی ڕێکخراو، بە شێوەیەکی کاریگەر کار ناکات، هەمیشە پێویستیشی بە دەوڵەت دەبێت بۆ دەستەبەرکردنی، هەر بۆیە سیستمی ئیسلامییش ناتوانێت بە شێوەیەکی کاریگەر کار بکات، ئەگەر چاکسازی لە تاکەکاندا نەکرێت، سەرەڕای ئەو دامەزراوانەی کار دەکەنە سەر ڕەفتاری. ئێستاش کاتی ئەوە هاتووە کە ببینین چۆن هاتنە ناوەوەی ناشەرعییەتی سیاسی لەگەڵ ڕابووردنی کاتدا، لە چواچێوەی کاریگەریی هۆکارە بازنەییەکاندا بووەتە هۆی گەندەڵبوونی دامەزراوەکانی دی و دارمانی ڕەوشتی و ئابووری.

# بەشی چوارەم
# دارمانی ئابووری

**یەکەم: ژیان داهات تێپەڕێنێت: حاڵەتەکانی تێکچوونی هاوسەنگیی دارایی**

یەکەم شت کە لە ئەنجامی نەمانی لێپرسینەوەی سیاسی دروست بوو، نەمانی کۆنترۆڵ بوو بەسەر دارایی گشتیدا، ئەمەش بووە هۆی ئەوەی هیچ پەیڕەو و پرۆگرامێك بۆ بەکارهێنانی داهاتی دارایی نەبێت، لەبری ئەوەی داهاتی دەوڵەت بە ئەمانەت دابنرێت و بەکارهێنانی بە پێی ڕێنماییەکانی شەریعەت بۆ خۆشگوزەرانیی گەل بێت، فەرمانڕەواکان تاوانێکیان ئەنجام دا کە لێبووردنی نییە، بەوەی بە بێ جیاوازی بەکاریان هێنا، لە پێناو ئەوەی کارئاسانی بۆ هێرشە سەربازییەکان بکەن و ژیانێکی پڕ لە ڕابواردن و زیادەڕۆیی بژین، هەروەها دەستوپێوەندێکی زۆری مشەخۆر و ماستاوچی بژیێنن.(١)

---

[1]. بۆ زیاتر شارەزابوون دەربارەی ژیانی زیادەڕۆیی ئاشکرا لە سەردەمی عەباسییەکاندا، بڕوانە: هەموو کتێبەکانی مێژوو، وەك:

ـ الطبري، أبو جعفر محمد بن جرير. تأريخ الأمم والملوك، بيروت، دار الفكر، ١٩٧٩ م.

له کاتێکدا نەدەکرا لەو ڕۆژانەدا ئەو هێرشە سەربازییانە نەکرایە کە دراوسێکانیان وەك هابسۆرگ و سەفەوییەکان بە پەرۆشبوون بۆ فراوانکردنی سنوورەکانیان، فەلسەفەیەکی تەقلیدییش کە هەیە هەر وڵاتێك لە وڵاتەکان حەز دەکات بەسەر دوژمنەکەیدا سەربکەوێت، بەر لەوەی ئەو سەرکەوێت بەسەریدا، لەوانەیە زۆر لەو هێرشانەش پێویست نەبووبن، ئەم بارودۆخەش زیاتر لە هەردوو سەدەی پازدەهەم و شازدەهەم پەرەی سەند، کاتێ یەکێك لە ئەرکە گرنگەکانی سوڵتانەکانی عوسمانی دەستکردن بە فتوحات بوو.[١]

محەمەدی دووەم (١٤٥١ – ١٤٨١ز) دامەزرێنەری شێوازێکی نوێ لە ئیمپراتۆرییەت "حەزی دەکرد ئیستەمبووڵ لە هەموو ڕوویەکەوە ببێتە مەڵبەندی جیهان"، لە سێ ساڵی حوکمڕانیی خۆیدا کاری بۆ ئەم ئامانجە کرد".[٢]

ئەم هێرشانەش پێویستیان بە سوپای گەورە و ئامادەکراو و ژمارەی زۆر دەبێت، ئەمەش داهاتی ئیمپراتۆرییەتی تەواو دەکرد. حاجی خەلیفە دەڵێت (١٠٦٧ك/١٦٥٧ز کۆچی دوایی کردووە): ژمارەی

ـ المسعودی، أبو الحسن علي. مروج الذهب ومعادن الجوهر، تحقيق: محمد محي الدين عبدالحميد، بيروت، المكتبة العصرية، ١٩٨٨م.

- Hitti, History of the Arabs, p. 302-304.

[1]. Faroghi, Suraiya. "Crisis and Change. " In Halil Inalcik and Dovald Quataert (eds. ) ? An Economic and Social History of the Ottoman Empire, 1300-1914. cambridge: Cambridge University Press. 1994, p. 542 -43.

[2]. Inalcik, Halil. "The Rise of the Ottoman Empire. ", Volume 1, p. 296.

سەربازی فـەرمیی مووچـەخۆر لـە سـوپای سـلێمان قـانوونی لـە سـاڵی (٩٧٠ك/ ١٥٦٢ز)دا، گەیشتە (٤١٤٧٩) پیاو، ژمارەی سەربازەکان بـەرز بووەوە بۆ (٤٨٣١٦)، مووچەکانیشیان گەیشتە (١٢٦,٤) ملیۆن هۆقـە، فراوانبوونەکـە بـەردەوام بـوو تـا لـە سـاڵی (١٠١٨ك/ ١٦٠٩ز) ژمـارەی سـەربازەکان گەیـشتە (٩١٢٠٢)، مووچەکانیـشیان گەیـشتە (٣١٠,٨) ملیۆن هۆقـە، ئـەو ساڵەیە کـە یـاخیبوونێکی ڕەگـەزی لـە ئـەنادۆڵ بـە توندوتیژییـەکی زۆر پـاش (١٢) سـاڵ شـەڕی دەوڵـەت بەرانبـەر یـان کپکرایەوە. بەرزبوونەوەی ژمارەی سەربازەکان بە ڕێژەی تـەنیا (٢٪)، وێـڕای خـەرجییان بـۆ مـاوەی ئـەو ٤٧ سـاڵەی بـاس کـرا، لـە (١٥٦٢–١٦٠٩ز)، وا لە مرۆڤ دەکات پشتگوێی بخات، بـە تایبـەتیش کـە نرخـی بەکارهێنـەر لەم ماوەیەدا ساڵانە لە سنووری (٢,٣٪)دا بـوو.[1] نـاتوانین ئەمە پـشتگوێ بخـەین ئەگـەر ڕای لـوتفی پاشـا (٩٧٠ك/١٥٦٣ز کۆچـی دوایـی کـردووە) بـە هەنـد وەربگـرین، کـە یـەکێك بـووە لـە پـسپۆڕە بەویژدانەکان و لە گەورەوەزیرەکاتی پێشوو بوو لای سـوڵتان سـلێمانی قانوونی، کـە دەڵێـت: "سـوپایەك بـە سیـستم ڕێکخرابێـت و لـە (١٥٠٠)

---

[1] . ڕێژەی گەشەکردن لە نرخی بەکارهێنەر بە پێی هێمای نرخی بەکارهێنەر ئـەژمار کـراوە، هـەر وەك بامۆك خەملاندوویەتی. بڕوانە:

- Pamuk, Savket. "The Evolution of Financial Institutions in the Ottoman Empire, 1600-1914. " Financial History Review, Cambridge University Press, Vol. 11 (01), April, 2004, Table 1, p. 455.

سەرباز پێکهاتبێت، تەواوە و هیچ کەموکووڕیی نییە".[1] لە کاتێکدا دەوڵەت دووچاری قەیرانی دارایی هاتبوو، پێویست بوو خەرجیی سەبازی و خەرجیی بێ بەرهەم کەمبکاتەوە، حکومەت نەك هەر ئەمەی نەکرد، بەڵکو بەردەوام بوو ـ لە بری ئەوە ـ سوپای فراوانتر کرد و چارەسەری بارگرانیی دارایی بە زیادکردنی باج و کەمکردنەوەی خەرجیی گەشەپێدان دەکرد. لەوانەیە زۆر کەس هەستی بەو گێروگرفتە ئابوورییانە نەکردبێت کە ڕووبەڕووی خەڵکی دەبوونەوە، کە یەکێك بوو لە هۆکارە سەرەکییەکانی یاخیبوونی (١٥٩٦-١٦٠٩ز)، ئەمە وێڕای بزووتنەوە یاخیبوونەکانی دی لە وڵاتدا، چ لە پێش و چ لە پاش ئەم یاخیبوونە.

[1]. See Extracts from Lutfi Pasha's Asafname, cites by Lewis, " Ottoman Observers of Ottoman Decline. " p. 73.

## خشتەی (١): سەربازەکان و تێچووی مووچەکان[1]

| ساڵ | سوڵتان | هێزەکان | مووچەی ساڵانە (بە ملیۆنان هۆقە) | ناوەندی مووچەی ساڵانە |
|---|---|---|---|---|
| ٩٧٠ک/١٥٦٢ز | سلێمان | ٤١٤٧٩ | ١٢٣,٣ | ٢٩٧٣,٥ |
| ٩٧٤ک/١٥٦٦ز | سلێمان | ٤٨٣١٦ | ١٢٦,٤ | ٢٦١٦,١ |
| ٩٧٧ک/١٥٨٨ز | موڕادی سێیەم | ٦٤٤٢٥ | ١٧٨,٢ | ٢٧٦٦,٠ |
| ١٠٠٤ک/١٥٩٥ز | محەمەدی سێیەم | ٨١٨٧٠ | ٢٥١,٢ | ٣٠٦٨,٣ |
| ١٠١٨ک/١٦٠٩ز | ئەحمەدی یەکەم | ٩١٢٠٢ | ٣١٠,٨ | ٣٤٠٧,٨ |
| ١٠٢٧ک/١٠٣١ز ١٦١٨ک/١٦٢٢ز | عوسمانی دووەم | ١٠٠٠٠٠ | – | – |
| ١٠٣١ک/١٠٣٢ز ١٦٢٢ک/١٦٢٣ز | مستەفای یەکەم | ١٠٠٠٠٠ | – | – |

1 . ژمارەی سەربازەکان و تێچووی مووچەی ساڵانە لە کتێبی (دستور الامل لاصلاح الخلل)ی حاجی خەلیفە (١٠٦٧-١٦٥٧ کۆچی دوایی کردووە) وەرگیراوە، هەروەها برنارد لویسیش وەریگرتووە. بڕوانە:
-Lewis, Bernard. "Ottoman Observers of Ottoman Decline. " p. 80.
تێبینی: هۆقە دراوێکی زیو بووە، عوسمانییەکان بەکاریان دەهێنا، بۆ زانیاریی زیاتر لەسەر ناەڕۆکە گۆڕدراوەکەی لە زیو و نرخی گۆڕینەوەی، بڕوانە:
-Sevket Pamuk>s " Appendix " in Inalcik, and Quataert (eds. ). An Economic and Social History of the Ottoman Empire, 1300-1914, p. 947-80.

چـاوەڕوان نــەدەكرا ئــەم فــەرمانڕەوا زۆردارانــە، كــە لــە گەلــەوە دووربوون و هەسـتیان بـە كێـشەكانیان نـەدەكرد، بـاج و خـەرجیی بـێ بەرهەم كەمبكەنەوە، بۆیە بە تەواوەتی كۆنترۆڵ بەسەر خەرجیدا نـەما و داهاتی ئیمپراتۆرییەت دووچاری كەمبوونەوەیەكی زۆر هـات، حاڵـەتی ناسەقامگیریی دارایی بەرزبووەوە و كورتهێنانی دارایی گەیشتە (٦٧٪) لە كۆی خەرجییەكان (خشتەی دووەم). بێگومان ئەمەش بۆ ئەو جەنگە درێژانە دەگەڕێتەوە لەگەڵ خێزانی هابسبۆرگدا لە (١٥٩٣ – ١٦٠٦ز)دا، كە تێچووی ئەم جەنگانە گەیشتە ئەوپەڕی لەو ماوانەدا. كورتهێنانەكـە كەمكرایەوە بۆ (٢٢,٥٪) لە كۆی خەرجییەكان كە دەگەیشتە (٦٨٧,٢) ملیۆن هۆقە لە (١٠٦٠ك / ١٦٥٠ز)دا.

**خشتەی (٢): داهاتی حکومەتی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی: خەرجی و کورتهێنان (بە ملیۆنان هۆقە)**[1]

| ساڵ | داهات | خەرجی | زیادە یان کورتهێنان(–) | زیادە یان کورتهێنان وەک ڕێژەی سەدی خەرجی |
|---|---|---|---|---|
| ٩٧٢ك / ١٥٦٤ز | ١٨٣,٠ | ١٨٩,٦ | +٦,٦ | +٣,٥ |
| ١٠٠٠ك/١٥٩١ز | ٢٩٣,٤ | ٣٦٣,٤ | –٧٠,٠ | –١٩,٣ |
| ١٠٠٦ك/١٥٩٧ز | ٣٠٠,٠ | ٩٠٠,٠ | –٦٠٠,٠ | –٦٦,٧ |
| ١٠٥٨ك/١٦٤٨ز | ٣٦١,٨ | ٥٠٠,٥ | –١٣٨,٧ | –٢٧,٧ |
| ١٠٦٠ك/١٦٥٠ز | ٥٣٢,٩ | ٦٨٧,٢ | –١٥٤,٣ | –٢٢,٥ |

لەگەڵ ئەوەشدا حاڵەتەکانی کورتهێنان بە بڕی زۆر بەرزبوون، چونکە هەموو زانایانی پێش عوسمانییەکان و کاتی عوسمانییەکانیش، ناڕەزاییان بەرانبەر زیادەڕۆیی دەوڵەت لە خەرجی و حاڵەتەکانی کورتهێنان لە بودجەی دەوڵەتدا دەردەبڕی، مەگەر لە حاڵەتی کتوپڕدا نەبێت. بەڵام ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی یان نیەتی وا بووە، یاخود

[1]. ژمارە و خەرجییەکان لە کتێبی (دستور الأمل لإصلاح الخلل)ی حاجی خەلیفە (١٠٦٧–١٦٥٧ کۆچی دوایی کردووە) وەرگیراوە، هەروەها برنارد لویسیش وەریگرتووە. بڕوانە:
-Lewis, " Ottoman Observers of Ottoman Decline. ", p. 81. CF. Oghli, 1989, p. 625 ; and Inalcik, Halil and Dovald Quataert (eds. ). Am Economic and Social History of the Ottoman Empire, 1300 -1914, p. 99.
تێبینی: ژمارەکان داهاتی (تیمار) ناگرێتەوە (دەربارەی بڕوانە بەشی داهاتوو).

بەپێی بارودۆخەکە، حەزی لەوە بووە هەمیشە لەناو جەنگدا بێت، بۆیە خەرجیی جەنگ گەورەترین پشکی خەرجی لە کۆی خەرجییەکانی بەردەکەوت.[1]

لەگەڵ ئەوەی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی لەم بارەیەوە تەنیا نەبووە، بەڵکو هاوشێوەی لە ئەوروپادا هەبوو، بەڵام ئەو زیادەڕۆییە لەڕادەبەدەرەی لە جەنگدا دەکرا، لە ماوەیەکی دوورودرێژدا، تواناکانی بۆ دابینکردنی داهاتی فێرکردن و دامەزراندنی بنیاتی بنەڕەتی و گەشەپێدان زۆر کەمکردەوە، گەر بهاتبایایە لە سایەی سیستمێکی دیموکراتیدا بووایە، فشاری جەماوەری بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ ڕێگەی پێ نەدەدا. وێڕای ئەمانەش فەرمانڕەواکان پەنایان بۆ ڕێگەچارەی ناپەسەند، بۆ دابینکردنی حاڵەتە خێراکانی کورتهێنان دەبرد، زۆربەی هەرە زۆری ئەم ڕێگەچارانەش، پێچەوانەی دادوەری و خۆشگوزەرانیی کۆمەڵگا بوون، کە شۆڕشی ئیسلامی هەر زوو ئەم دوو شتەی دووپات کردبووەوە.

---

[1]. Faroghi, Crisis and Change. ", p. 542.

## دووەم: بەخشینی پارچە زەویی گەورە و تیمارەکان[١]

یەکێك لەو ڕێگەچارانەی کە دەرکەوت زیانی زیاترە بۆ گەشەپێدان، دوورکەوتنەوەی وردە وردە بوو لە بیروباوەڕی باجی زەویی تایبەت بەو زەوییانەی فەتح کرابوون. لە سەرەتادا ئومەوییەکان پارچە زەویی گەورەیان دەبەخشییە ئەندامانی بنەماڵەی فەرمانڕەوا و لایەنگرانیان، ئەمەش پێشێلکارییەکی زەقی ڕێوشوێنەکەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) و چوار خەلیفەکەی یەکەمە. کاتێ عەباسییەکانیش لە (١٣٢ك/٧٥٠ز) هاتنە سەر دەستەڵات، دوای ئەوەی بەڵێنیان دا کە ستەم و بێڕەوشتی نەهێڵن کە ئەو کاتە باو بوو[٢]، بەڵێنەکەیان تەنیا بۆ ماوەیەکی کەم بەجێهێنا، پاشان چوونە ژیانی خۆشی و ڕابواردنەوە، هەمان سیاسەتی ئومەوییەکانیان پەیڕەو کرد کە پێشتر لەسەری لۆمەیان دەکردن، بە تایبەتیش سیاسەتی بەخشینی پارچە زەوی. بەخشینی زەوی (تیمارات لە سەردەمی عوسمانییەکاندا) بە خێرایی لە

---

[1]. تیمار: وشەیەکی کوردی و فارسییە بە مانای چارەسەر، ئەو پارچە زەوییانە بوون بە سەرباز و سوارە و کەسانی تر دەدران، بەڵام بە موڵکی (بيت المال) دەمانەوە و داهاتی ساڵانەشی لە بیست هەزار قورش زیاتر نەبوو. وەرگێڕی کوردی (بۆ زانیاریی زیاتر بڕوانە (معجم لغة الفقهاء، محمد رواس قلعجي – حامد صادق قنيبي، دار النفائس للطباعة والنشر والتوزيع، ط٢، ١٩٨٨ م، بەش١ ل٥٥، و تاريخ الدولة العلية العثمانية، محمد فريد (بك) ابن أحمد فريد (باشا)، المحقق: إحسان حقي، دار النفائس، بيروت – لبنان،ط١، ١٤٠١ – ١٩٨١ ١ بەش، ل١٣٢).

[2]. بڕوانە ئەو وتەیەی ئەبولعەباس، باوکی دەوڵەتی عەباسی، لە مزگەوتەکەدا پێش بەیعەتپێدانی لەلایەن خەڵکییەوە پێشکەشی کرد، تەبەری هێناویەتیەوە لە:

- الطبري، تأريخ الأمم والملوك، سەرچاوەی پێشوو، بەرگ٩، ل ١٢٥ـ١٢٧.

سـەردەمی فاتمییـەکان (٢٩٧–٥٦٧ك / ٩٠٩–١١٧١ز) و بوەیهییـەکان (٣٣٤–٤٤٧ك/٩٤٥–١٠٥٥ز) و سـەلجوقییەکان (٤٤٧–٥٩٠ك/ ١٠٥٥–١١٩٤ز) و عوسمانییـەکان (٦٩٩– ١٣٤٢ك/ ١٢٩٩= ١٩٢٤ز) بـەڕێوە دەچـوو. تـاوەکو کـار گەیـشتە ئـەوەی لـە سـەدەی شـازدەهەم و حەڤدەیەمـدا وەك سیـستمی دەرەبەگایـەتیی لـێ بێـت، تـەنیا جیاوازییەکەی لەوەدا بوو لـە سیـستمی دەرەبەگایەتیـدا پێویـست بـوو لەسـەر ئاغـای دەرەبـەگ خزمـەتگوزاریی سـەربازی پێـشکەشی پادشـا بکات، بەڵام ئەوانـەی بەخـشینی زەوی (تیمـارات) یـان وەردەگـرت لـە جیهانی ئیسلامیدا، ئەو کارەشیان نەدەکرد.

هـاتنی مـەغۆلیش لـە سـاڵی (٦٥٦ك/ ١٢٥٨ز)، خێرایـی داڕمـانی سیاسی و ئابووریی لەو کاتەدا زۆرتر کـرد.(١) ئـەو ٣٧ سـاڵەی یەکـەمی فەرمانڕەوایەتیی مەغۆلە بتپەرستەکان – پێش هـاتنی غـازان خـان بـۆ سەر دەستەڵات لە (٦٩٤ك / ١٢٩٥ز) – بە توندوتیژییەکی لەڕادەبەدەر و چەوساندنەوە ناسرابوو.(٢) ئەوە بوو هێرش کرایە سـەر ژمارەیـەك لـە شـارەکان، هـەزاران کەسـیش دووچـاری کوشـت و کوشـتار بوونـەوە، ئافرەتـانیش دەسـتدرێژی دەکرایـە سـەریان و کتێبخانـەکان وێـران دەکران. "لە ئەنجامی تاڵانیی بەغدا لە ساڵی (١٢٥٨ز) یـەك کتێـب لـەو

---

[1]. بەغدا لە ١٠ی شوباتی ساڵی ١٢٥٨ز بە دەستی مەغۆلەکان کەوت.

[2] )Morgan, D. O. " Mongols. " The Encyclopedia of Islam, Leiden: Brill, 1993, Volume 7, p. 230-35.

کتێبانەی لە (الفهرست )ی (ابن الندیم)دا تۆمار کابوون، نەمان".[1]

مەغۆلەکان زەوییەکی بەرفراوانی زۆریان لە خاوەنە ڕەسەنە دانیشتووەکانیان دەسەند و دەیاندا بە ئەندامانی گەلەکەیان بۆ تێرکردنی چاوچنۆکییان، باجێکی زۆریان بەسەر خەڵکدا سەپاند، وێڕای ئەو بڕەی بوەیهییەکان و سەلجوقییەکان سەپاندبوویان، ئەمەش بوو بە هۆکاری ئەوەی ژمارەیەکی زۆر لە جووتیارەکان وازیان لە زەوییەکانیان هێنا، کە بوو بە هۆکاری زیادبوونی دەشتەکیی کۆچەری.[2] وێڕای ئەمانەش چاکنەکردنەوەی جۆگە و کارێزەکان بەردەوام بوو و وردە وردە بەرەو خراپبوون دەچوون، کە وای کرد کشتوکاڵ تا ئاستێکی مەترسیدار لە چەقبەستندا بێت، ئابووریی گوندەکانیش لە ڕووخان نزیك دەبووەوە. ئەو ژێرخانە ئابووری و کشتوکاڵییە بەهێزەی کە پێش هاتنی مەغۆل هەبوو، هەرگیز وەك پێشوو نەمایەوە.[3] لای مەغۆلەکان نموونەی هەرە باڵا بریتی بوو لە "جەنگ و شارەزابوون لە هونەرەکانی سەربازیدا، بەڵام نموونەی هەرە باڵا لای ئەو کۆمەڵگایەی کە شوێنیان گرتەوە، ئارامی و ئاشتی بوو".[4]

---

[1]. arton, George. Introduction to the History of Science. Washington, DC: Carnegie Institute, 3 volumes issued between 1927 and 1948, the 2nd and 3rd each in two parts. , Volume 1, p. 662.

[2]. lambton, Ann K. S. State ans Government in medieval Islam. Oxford: Oxford University Press, 1981, p. 298 and 300.

[3]. Hodgson, The Venture of Islam, Volume 2, p. 8.

[4]. Lambton, Ann K. S. State and Government in Medieval Islam, p. 299.

دەستبڵاوی و بەفیڕۆدانی مەغۆلەکان، بووە هـۆی کێـشەی دارایـی، وێـڕای سـەپاندنی بـاج بـە زۆرداری و لـەپێناو سـەرکەوتن بەسـەر ئـەم کێشانەدا، غایخانو (٦٩٠-٦٩٤ك/١٢٩١-١٢٩٥ز) فەرمانڕەوای پێنجەمی بنەماڵەی فەرمانڕەوا، هەوڵی دا پارەی کاغەز بخاتە ناوەوە، کە خەڵکی دوودڵبـوون لـە قبـوڵکردنی. ئـابووریی نـاوەوە و دەرەوە تووشـی شکـستێکی گـەورەی بـەرفراوان هـاتن.[1] لەگـەڵ ئـەوەی غـازان خـان (٦٩٤-٧٠٣ك/ ١٢٩٥-١٣٠٤ز)، فـەرمانڕەوای حەوتـەمی مەغۆلـەکان، موسڵمان بوو و هەندێ چاکسازیی کرد، بەڵام باشبوونێکی ئەوتۆ نەبوو، چـونکە نـەیتوانی ڕەوشـتی خەڵکەکـەی بگۆڕێـت و لـە بەدەسـتهێنانی متمانـەی دانیـشتووانە موسڵمانەکەشـدا سـەرکەوتوو نـەبوو، تـا بـە دادوەریـی فـەرمانڕەوایی مـەغۆل بەدەسـت بهێنێـت. تـەیموور لەنگییـەکانیش (٧٣٧-٨٠٧ك/١٣٢٦-١٤٠٥ز) وێرانکارییـەکانی مەغۆلەکانیان خراپتر کرد. تەیموور لەنگیش لە ساڵی (٨٠٣ك/١٤٠٠ز) و لە ماوەی نزیکەی سی ساڵدا و پێش مردنـی لـە سـاڵی (٨٠٧ك/١٤٠٥ز)، بەغدا و زەویی دیکەی ئیسلامی داگیر کرد، بۆیە گورزێکی کەمەرشـکێن بوو بۆ ئابوورییەك کە نزیکـە دابڕووخێـت و نـەتوانێت هەسـتێتەوە. لـە ئـەنجامی دەستبەسـەراگرتنی عێـراقیش لەلایـەن سـەفەوییەکانەوە لـە

---

[1] . Spuler, Bertold and R. Ettinghausen. "Ilkhans. " The Encyclopedia of Islam, Leiden ; Brill, 1986, Volume 3, p. 1121.

(١٥٠٨–١٥٣٤ز)، هەنـدێ بەخۆیـدا هاتـەوە، هەرچـەندە بـە گـوێرەی پێویست نەبوو، چونکە فەرمانڕەوایەتییەکـەیان – وەك لـە شـوێنەکانی تـریش _ وابـوو، حکومـەتێکی ناوەنـدیی لاوازی ئـابووری وەسـتاویان هەبوو.

دوای داگیرکردنـی مـەغۆل، جیهـانی ئیـسلامی هـەر وەك خـۆی بـە پەرتـەوازەیی مایـەوە و یـەکگرتوو نـەبوو، تـا لەسـەر دەسـتی عوسمانییەکانـدا لـە (٩٢٣ك/١٥١٧ز) بـۆ جـاری دووەم یـەکی گرتـەوە. فاتمییـەکان (٢٩٧– ٥٦٧ك/٩٠٩ – ١١٧١ز) و ئەیوبییـەکان (٥٦٤–٦٤٧ك /١١٦٩ – ١٢٥٠ز) و مەمالیکـەکان (٦٤٨– ٩٢٢ك / ١٢٥٠ – ١٥١٧ز)[1]، وێـڕای عوسمانییـەکان (٦٩٩– ١٣٤٢ك / ١٢٩٩= ١٩٢٤ز)، فەرمانڕەواکانیان تا ڕادەیەك گەر بـەراودریان بکـەیت لەگـەڵ مـەغۆل و تەیمورلەنگییەکان، مرۆڤـایەتییان تێدا بوو، لەگەڵ ئەوەشدا دووربوون لەو نەنگییانەی کـە لـە سـەدەکانی پیـشوودا کەڵەکـە بووبـوون. وێـڕای گەڕانەوەی ژیان بۆ کشتوکاڵ تا ڕادەیەك، بەڵام هێزی پێویست فەراهەم بۆ سـەرلەنوێ بووژاندنەوەکـەی پێـشوو نـەدەبوو، بـە تایبـەتیش دوای ئـەوەی بەخـشینی زەوی (تیمـارات) بـۆ خۆیـان و کارگێڕانیـان و ژەنەراڵەکانیان و سەربازەکانیان بەردەوام بوو.[2] لەگەڵ ئەوەی ئەمانە

---

[1]. فاتمییەکان فەرمانڕەوایەتیی باکووری ئەفەریقیا و میسریان دەرکرد، ئەیوبییـەکان فەرمانڕەوایـەتیی میسر و سووریا و فەڵەستینیان دەکرد، مەمالیکەکانیش فەرمانڕەوایەتیی میسریان دەکرد.

[2] . Hitti, History of the Arabs, p. 329-230.

لە سەرەتادا لەبری مووچە دەدران، بۆ بارسووککردنی ئەرکی گەنجینـە و خەرجییەکانی وەرگرتنی داهاتەکان و پێدانی بە سـەربازەکان، بـەڵام ئەمە بوو بە هۆکارێك بۆ خراپ بەکارهێنانی و زیانگەیاندن بە بەروبوومی کشتوکاڵی.

نزیکەی هەموو ئەو زەوییانەی عوسمانییەکان لە سەدەی چواردەیەم و پازدەیەمدا فەتحیان کردبوون، بە شێوەی (تیمـار) بەسـەر سـەرباز و فەرمانبەرانی حکومەتدا دابەش کران. لە سەرەتادا، ئـەم تیمارانـە وەك ئەمانەتێك دەدرانە ئـەو کەسـانەی وەریـان دەگـرت و گواسـتنەوەی لـە یەکێکەوە بۆ یەکێکی تر پێوە نەدەکرا، بەردەوامییشی پابەنـد بـوو بـە بەردەوامیی ئەو کەسە لە خزمەتـدا، لەوانـەش بـوو هەڵبوەشـێنرێتەوە، یـاخود بگۆڕدرێـت بـە مووچـەی خانەنـشینی.(١) بـەڵام لەگـەڵ لاوازیـی حکومەتی ناوەندیی لە سەردەمی کۆتایی عوسمانییەکانـدا، تیمارەکـان

---

هەروەها بڕوانە:

-Rabie, Hassanein. " The Size and Value of the Iqta " in Egypt, 564-741/1169 - 1341. " In M. A. Cook (ed. ), Studies in the Economic History of the Middle East from the Rise of Islam to the Present Day. London: Oxford Univeristy Press, 1970, p. 129-138.

– مەقریزیش (٨٤٥ك/ ١٤٤٢ز کۆچی دوایی کردووە) دەڵێت: "لە سەردەمی سەلاحەدین (یوسف کـوڕی ئەیوب)ەوە هەتاوەکو ئـەمڕۆ، هـەموو زەوییـەکانی میـسر بـە شـێوەی پارچـە پارچـە دەبەخـشران بـە سوڵتان و خێزانەکەی و سەربازەکانی" بڕوانە: المقریزی. الخطط المفریزیة، سەرچـاوەی پێـشوو مـج١، ل٩٧.

[1] . Cahen, Claude. "Buwayhids or Buhids. " The Encyclopedia of Islam, Leiden: Brill, 1986, Volume 1, p. 1090

وەك موڵكی تایبەتی مامەڵـەی پێـوە دەكـرا، زۆربـەی هـەرە زۆری ئـەم زەوییە فەتحكراوانە كە مـوڵكی دەوڵـەت بـوون، هـەموو باجـەكانی ئـەو كەسانە دەیانبرد كە بەدەستیانەوە بوو و دەوڵەت لێیـان بێبـەش بـوو، وێڕای ئەوەی چـوون بـۆ خزمـەتی سـەربازی مـەرج بـوو بـۆ وەرگرتنـی تیمارەكان. ئەم پرۆسەی پارچە زەوییانە چەند سـەدەیەكی خایانـد تـا تەواو بوو، لـە كۆتاییـشدا تـەواو بـوو، بـە تایبـەتیش دوای داگیركردنـی وڵاتە ئیسلامییەكان لەلایەن هێزەكانی ڕۆژئاواوە، كە ئەمیش ڕووبەرێكی گەورەی زەویی بەخشی بەوانـەی هاوكارییـان كـرد و یارمـەتییان دا بـۆ بەردەوامیی داگیركردن. بەشێكی گەورەی زەویی كشتوكاڵی لە جیهانی ئیسلامیدا، ئێستا بووەتە مـوڵكی خـاوەن زەوییـە بـەهێزەكان و بەشـی هەرە زۆری بەروبوومەكەی بۆ خۆیانە و بەشێكی كـەم بـۆ جووتیارەكـە دەهێڵنەوە. هیچ باجێكیش نادەن و لەگـەڵ ئەوەشـدا پلـە و پایەیـەكی سیاسیی بەهێزیان هەیە.

## سێیەم: باجێكی ستەمكارانە

وا چاوەڕوان دەكرا كە موڵكایـەتیی زەوی، لـە ڕێگـەی خـودی زەوی یاخود تیماراتەوە، نەبێتە زیانێكی گەورە، گەر بە سیستمی موڵكایـەتی و سیستمی باجی مرۆییانە بووایە، چونكە یاسای خیلافەت و میراتگریی ئیسلامی، ڕێگری لە میرات بردن تەنیا لەلایەن كوڕی گەورەوە دەكـات، دەبێت موڵكی كەسی مردوو بەسەر هەموو میراتگرەكاندا بە نێر و مێوە

دابەش بکرێت، هەروەها دابەشکردنی زەویش، دواتریش کەمکردنـەوەی دەسـتەڵاتی خـاوەن موڵکـەکان. هــەتاوەکو هــاتنی ســەردەمی عوسمانییەکان ئەو خێزانە فەرمانڕەوایانە کەمبوون کە بەردەوامبوون و پارێزگارییـان لـە ئۆرسـتوکراتییە بۆماوەکـەیان دەکـرد، چـونکە لـە ئـەنجامی تێکـچوونی بـارودۆخی نـاوخۆ و پـەلاماری بیانیـدا، زۆربـەی خێزانە فەرمانڕەواکان ڕادەماڵێنران، ئەمە بـواری ئۆرسـتوکراتییەکان و دارودەستەی خاوەن دەستەڵاتەکانی بەرتەسك دەکردەوە. وێڕای بوونی پارچـە زەوی یـاخود تیمـارات، بـەڵام ئەمانـە هـەر بـە بـچووکی لـە زەوییەکانی عوسمانیدا مانەوە و نەبوونە موڵکی گەورە و فراوان، تا لـە کۆتایی سـەردەمی عوسمانییەکانـدا نـەبێت و بـە تایبـەتیش لـە ناوچـە عەرەبییەکاندا.[1] ئەم زەوییە بچووکانە، نەوەك موڵکە گەورەکان بوونە هۆکاری زیادەفرۆشی بە درێژایی سەردەمی عوسمانییەکان.[2]

ئەو شتەی وای لە پارچە زەوییەکان، یاخود تیمارەکان کـرد لەگـەڵ بەردەوامبوونی گەشەسەندندا ڕێکنەکەون، بـەردەوامیی زۆربـوونی بـاج بـوو لەسـەر جووتیارەکـان، بـەڵام خێزانـی فـەرمانڕەواکان و یارمەتیدەرانیان، هیچ باجێکیـان نـەدەدا، بۆیـە بەشـی زۆری باجـەکان

---

1. Quataert, Donald. "The Age of Reforms, 1812-1914. " In Halil Inalcik and Dovald. Quataert (eds. ), An Economic and Social History of the Ottoman Empire, 1300 -1914. Cambridge, Uk: Cambridge University Press, 1994, p. 861.

2. Inalcik, Halil and Dovald Quataert (eds. ). An Economic and Social History of the Ottoman Empire, 1300-1914, p. 5.

دەکەوتە ئەستۆی جووتیارەکان، کە ئەمانە لـە سـەدەکانی ناوەڕاسـتدا زۆرینەی کۆمەڵگای ئیسلامییان پێك دەهێنا، چـونکە لـە پێنـاو ژیـان و گوزەرانیاندا پشتیان –بە پلەی یەکەم– بە زەوی بەستبوو. ئەمەش لە مـاوەی بوەیهییـەکان و سـەلجوقییەکاندا دەسـتی پـێ کـرد کـە بـاجی کشتوکاڵ هەبێت، فەرمانڕەوا و ژەنەڕاڵەکان بە هۆی ئەو دەسـتەڵاتەوە کە هەیانبوو، خۆیانیان بە جووتیاری بـاجگر دەستنیـشان کردبـوو، لـە پێناو سەپاندنی ملکەچی و دابینکردنـی پـارەی دیـاریکراوی سـاڵانە بـۆ دەوڵەت. ئەم سیستمەش ناڕەوایی زۆری دەگرتە خۆ، چونکە ئەوان ئەو باجـەی وەریـان دەگـرت، زیـاتربوو لـەوەی دەیاندایـە دەوڵـەت، جیاوازییەکەشـیان بـۆ خۆیـان هەڵـدەگرت.(1) بارودۆخەکـە لـە سـایەی

---

[1]. باجی جووتیاران لە فیقهدا بریتییە لە (القبالە) قەواڵە یاخود بەڵێننامە، زۆربەی زانایـانی (فیقهـە) بـە حەرامی دەزانن (شەرعی نییە و نادروستە) چونکە دەبێتە هۆی ستەم و زیان بە جووتیاران دەگەیەنێت. بڕوانە:

- وزارة الأوقاف والشؤون الاسلامية. الموسوعة الفقهية، سەرچاوەی پێشوو، بەرگ ٣٢، ل٢٤٣.
- ابن ابراهيم، كتاب الخراج، سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٥.
- ابن سلام، كتاب الأموال، سەرچاوەی پێشوو، ل٩٩–١٠٠.
- الماوردي، أبو الحسن علـي. الأحكـام السلطانية والـولايات الدينيـة، القـاهرة، مـصطفى البـابي الحلـبي، ١٩٦٠م، ص١٧٦. ئـیبن عــەباس ئـەو بـڕە جیاوازییـەی لـە نێـوان ئـەوەی جووتیـاری بـاجگر و جووتیارەکانیان وەریان دەگرت و ئەوەی دەیاندایە حکومەت، بـە حـەرامی دادەنێـت، لـە کاتێکدا ئـیبن عومەر بە سووی دادەنێت. ڕوانە:

- ابن سلام، كتاب الأموال، سەرچاوەی پێشوو، ل١٠٠.
- الماوردي، الأحكام السلطانية والولايات الدينية، سەرچاوەی پێشوو، ل١٧٦.

ئیلخانەکانــدا (فــەرمانڕەوەکان) کــە هــەر بــە وەرگرتنــی باجــە دیاریکراوەکەوە نەوەستانەوە لە کاتی داگیرکردنیاندا، بـەڵکو زۆرتریـان خستە سەری.

ئەو چاکسازییانەی ژمارەیەك لە فـەرمانڕەوا ئەیوبییـەکان (٥٦٤–٦٤٧ك/١١٦٩–١٢٥٠ن) و مەمالیکەکان (٦٤٨– ٩٢٢ك/١٢٥٠ –١٥١٧ن) و عوسمانییـەکان (٦٩٩– ١٣٤٢ك/١٢٩٩=١٩٢٤ن) و هەنـدێ لـە خێزانـە فەرمانڕەواکانی دی لـە شـوێنە جۆراوجۆرەکـانی جیهـانی ئیـسلامی لـە هەموو کاتەکاندا، یاسای باجیان وا لێکـرد تـا ڕادەیـەك زیـاتر مرۆییانـە بێت. ئەرکی سووکتر بێت، تاوەکو نیوەی سەدەی نۆی کۆچی/ پازدەی زایینی لە سەردەمی عوسمانییەکاندا، بەڵام زۆربوونی خەرجیی جەنگیی (محەمــەد فــاتیح و ســلێمان قــانوونی) بــۆ خــەرجیی هەڵمەتــە سەربازییەکانیان، یاسای باجی وردە وردە گرانتر کرد، کە لە سەپاندنی باجدا دوور لە بیروباوەڕی دادپەروەری دەکەوتەوە، ئـەو بیروباوەڕەیـە کە زانایانی وەك ئەبو یوسف و ئەلماوەردی و ئـیبن خەلـدون و زۆرێکـی تریش، پێداگریی لەسەر دەکەن لە جۆرێك لـە کتێبـەکان بـە ناونیـشانی

---

- ابن الأثیر، النهایة، ١٩٦٣، بەرگ ٤، ل١٠. هەروەها بڕوانە "قبالة" في: ابن منظور، لسان العرب، بەرگ ١١، ل٥٤٤. هەروەها بڕوانە:

Abu El-Fadl, Khaled. "Tax Farming in Islamic Law (Qabalah and Daman of Kharaj): A Search for a Concept. " Islamic Studies, Islamabad, Spring, 1992, p. 5-32.

"مرایا الأمراء"[(١)] که بارودۆخەکەی کارەساتبارتر کرد، خاوەن پارچە زەوییەکان و تیمارەکان ڕێژەیەکی باشی بەروبوومیان لە جووتیارەکان وەردەگرت و هیچ باجێکیشان بە حکومەت نەدەدا، کە کاتی خۆی حکومەت بڕیاری پارچە زەوی و تیمارەکانی لە پێناو ئەمەدا دەرکردبوو، بۆیە لە کاتێکدا کشتوکاڵ زەرەرمەند بوو، داهاتەکانی حکومەتیش داڕما بوون.

سەرەڕای ئەو باجە ستەمکارانەی بەسەر جووتیاراندا سەپێنرا بوو، لەولاشەوە باجی تر هەبوون کە پشتی پیشەوەرەکان و بازرگانەکانی شکاندبوو و هاوکار بوو بۆ زیاتر داڕمانی ئابووری، ئەم باجانەش پێیان دەوترا مەکوس.[(٢)] ئەبو عوبەید (٢٢٤ك/ ٨٣٩ز کۆچی دوایی کردووە) شەش فەرموودەی هێناوەتەوە دژی مەکوس.[(٣)] زانا ئایینییەکان هەمیشە داوایان کردووە قەدەغە بکرێت و دەستەواژەی وەك

---

[1] . بۆ زیاتر شارەزابوون لە کورتەیەك لە ئەدەبیاتی (مرایا الأمراء) بڕوانە نووسینەکانی ئیبن موقەفەع (١٣٩ك/ ٧٦٦ ز کۆچی دوایی کردووە)، نوعمان (٣٦٣ك/ ٩٧٤ ز کۆچی دوایی کردووە)، ئەلماوەردی (٤٥٠ك/ ١٠٥٨ ز کۆچی دوایی کردووە)، خەتیب (٤٦٣ك/ ١٠٧١ ز کۆچی دوایی کردووە)، کەی کاوس (٤٧٥ك/ ١٠٨٢ ز کۆچی دوایی کردووە)، نیزام ئەلمەلیك (٤٨٥ك/ ١٠٩٢ ز کۆچی دوایی کردووە)، غەزالی (٥٠٥ك/١١١١ ز کۆچی دوایی کردووە)، تەرتوشی (٥٢٠ك/ ١١٢٦ ز کۆچی دوایی کردووە)، بڕوانە:

-Essid, M. Yassine. A Critique of the Origins of Islamic Economic Thought. Leiden: Brill, 1995, p. 19-41.

[2] . مەکوس هەموو جۆرە فرۆشتن و باج و باجێکی کومرگ دەگرێتەوە، بڕوانە تێبینیی نووسەر لە:

- ابن سلام، کتاب الأموال، سەرچاوەی پێشوو، ل٧٠٣. هەروەها بڕوانە مکس لە "لسان العرب"دا.

[3] . ابن سلام، کتاب الأموال، سەرچاوەی پێشوو، ل٧٠٣ ـ ٧٠٤، فەرموودەکانی ژمارە ١٦٢٤– ١٩٢٩.

"هەڵوەشاندنەوەی مەکوس"، "لێبووردەییەکان"، "لابردن"، "خستنە لاوە"، "هەڵگرتنی مەکوس". جەلالەدینی سیوتی (٩١١ك/١٥٠٥ز کۆچی دوایی کردووە) نامەیەکی نووسیوە بە ناونیشانی "نامەیەك لە سەرزەنشتی مەکوسدا". لەگەڵ ئەوەشدا مەکوس هەر مایەوە، لە کاتێکدا لە سەردەمی مەمالیکەکاندا هیچ شتێك نەمابوو باجی لێ بدرێت (٦٤٨– ٩٢٢ك/١٢٥٠ –١٥١٧ز). هەندێ لە فەرمانڕەواکان وەك سەلاحەدینی ئەیوبی (٥٨٩ك/١١٩٣ز کۆچی دوایی کردووە) زۆرێکی قەدەغە کرد، بەم شێوەیە سیستمی باجی چاك کرد.[1] کێشە داراییەکانی حکومەتەکان بەردەوام بوو تا سەرەنجام وای کرد ئەوانەی لە دوای ئەو هاتن، باج دابنێنەوە.[2]

ئەمە هۆکارە کۆمەڵایەتی ـ ئابوورییەکان ڕاڤە دەکات کە لە پشت ناڕەزایی زانایانەوە – بە درێژایی سەدەکان – دژی کۆکردنەوەی باج هەبوون کە حکومەتەکان دەیانسەپاند، چونکە دەترسان ئەگەر

---

١) مەقریزی (٨٤٥ك/١٤٤٢ز کۆچی دوایی کردووە) لیستێکی درێژ دێنێتەوە کە ئەو مەکوسانەی تێدایە سەلاحەدینی ئەیوبی قەدەغەی کردووە، بڕوانە:

المقريزی، الخطط المقريزية،، سەرچاوەی پێشوو، مج ١، ل١٠٤ ـ ١٠٥. لەگەڵ ئەوەشدا کوڕەکەی ئەلعەزیز عوسمان (٥٩٥ك/١١٩٨ز کۆچی دوایی کردووە) هەر بەوەوە نەوەستا کە سەرلەنوێ باجی مەکوسی دانایەوە کە باوکی قەدەغەی کرد بوو، بەڵکو زیادیشی کرد. بڕوانە:

ـ المقريزی، الخطط المقريزية، سەرچاوەی پێشوو، ل ١٠٥.

2 . هەندێ خاڵی ئەم بڕگەیە لەم کتێبە وەرگیراوە:

-Bjorkman, W. " Maks. " In Encyclopedia of Islam. Leiden: Brill, 1991, Volume 6, p. 194-95.

حکومەتـــەکان بــاج بــسەپێنێت، ڕێگــە خۆشــکەر دەبێــت بــۆ لادانــی بەرپرســان لــە ســنوور و بــوون بــە ســتەمکاریان. بۆیــە پێویــستە هــیچ گومانێك لە بـیری هـیچ کەسـێکدا نـەمێنێت کـە ژمارەیـەك هەڵوێـستەی فیقهـی دەرئــەنجامی بــارودۆخی ئــەو کاتــەی زانایــانی ئــایینی بــووە. هەڵوێستیان زۆر توند بووە بەرانبـەر سـەپاندنی بـاج و کاردانەوەشـیان دەربارەی کردارە ناشەرعییەکانی حکومـەت سروشـتی بـووە، کـە هـیچ بەرپرسیارێتییەکی بەرانبەر گەل دەربارەی بەدەستهێنانی داهاتەکانی و بەکارهێنانیان نەبووە، شتێکی ڕەواش نییە خۆببەسترێتەوە بـە خـودی هەڵوێستە فقهییەکانەوە لە بارودۆخێکی سیاسـیی دیموکراتیـدا، کاتێـك بتوانرێــت دەســتەڵاتی حکومــەت لــە ســەپاندنی بــاج و خەرجییــەکان ڕابوەستێنرێت.

لەوانەیە یەکێك ناڕەزایی بەرانبەر ئەم شیکردنەوەیە هەبێت و بڵێـت: لەوانەیە باج لەو ڕۆژانـەدا بـەو جـۆرە بـەرز نـەبووبێت، گـەر بـەراوردی بکەین لەگەڵ ئەو باجانەی ئەمڕۆ لە ژمارەیەك لـە وڵاتـە خۆشـگوزەرانە نوێیەکاندا دەسەپێنرێت. لەوانەیە ئەمە ڕاست بێت، بەڵام ئەم باجانە بە پلەی یەکەم بەسەر جووتیار و پیشەوەر و بازرگانەکاندا دەسەپێنرا، لە کاتێکدا خاوەن دەستەڵاتەکان بە هیچ شێوەیەك باجیان نـەدەدا، بۆیـە بارگرانییەکـەی ئەوانـەی باجیــان دەدا، ئەوەنـدە قـورس بـوو بەرگـەی نــەدەگیرا. خـراپتریش لەمــە، ئــەوەبوو کــە ئەوانــەی باجیــان دەدا لــە بەرانبـــەردا هـــیچ ســـوودێکیان نـــەدەبینی، چـــونکە داهاتـــەکان

بەکارنەدەهێنران بۆ دابینکردنی فێرکردن و چاودێریی پزیشکی و بنیاتی بنـــەڕەتی و گـــەلێك خزمـــەتگوزاریی دیکـــە، وەك لـــە وڵاتـــە خۆشگوزەرانەکاندا هەیە، بەڵکو بۆ خۆشی و ڕابواردنی یارانی کۆشکی پادشـایی خـەرج دەکـرا، هـەروەها بـۆ هێـشتنەوەی ئـامێری جـەنگیی فرەخەرجیش بەبێ وەستان. ئەگەر بهاتبایـە هـەموان باجیـان بدایـە و داهاتەکان بە شێوەیەکی باش و کاریگەر لە پێناو چاککردنی گوزەران و کامەرانیی گەل بەکاربهێنرایە، لەوانە نـاڕەزایی بـاج نەگەیـشتایەتە ئـەو ڕادە بەرز و توندە.

## چوارەم: کەمبوونەوەی بەهای پارە

تێکچوونی باری داراییش بوو بە هۆی دابەزینی نرخی دراو لە ئاستی نرخی کاڵاکانـدا، دینـار (دراوی زێـڕ) و درهـەم (دراوی زیـو) بـوون، کـە پێکهاتەی بنەڕەتیی سیستمی فەرمیی دراوی ئیسلامی بوون. هـەروەها فلسیش (دراوی مس) بە قەبارە و کێشی جیاواز بۆ کاروباری ئـابووریی بچووك لێ دەدرا. بۆ پارێزگـاریکردن لـە پـاکیی دراوەکـە، هـەروەها لـە بەرژەونـدیی گـشتیی خـەڵکی، لـە سـەردەمی هاروونـە ڕەشـیددا (١٩٣ك/٨٠٩ز کۆچـی دوایـی کـردووە) نووسـینگەی "چـاودێریی دراو" دامەزرا و هەموو جۆرە دراوەکان چاودێری دەکران. لەبەر ئەمە لە ڕووی کێش و پـاکی و شـێوەکەیەوە، ئاسـتی دینـاری یەکـەم بـە شـێوەیەکی بەرچاو بەرز بوو، بەڵام ئەم نووسینگەیە لەگەڵ لاوازبـوونی دەسـتەڵاتی

بەڕێوەبردنی عەباسی، ورد وردە دەستەڵاتی نەما[(١)]، لەگەڵ ئەوەشدا پارێزگاری لە ئاستی دینار، لە زۆربەی ناوچەکانی جیهانی ئیسلامی تاوەکو سەدەی چوارەمی کۆچی/دەیەمی زایینی بەردەوام بوو.[(٢)] هەتاکو لە سەردەمی بنەماڵە فەرمانڕەواکانی دواتریش، ئاستەکەی نەگۆڕا، مەگەر زۆر کەم لەو ئاستەی لە سەردەمی ئومەوییەکان و عەباسییەکان تێیدا بوو. ئیبن بەعرا لە نزیکەی ساڵی (٦٢٥ك/ ١٢٢٨ز)دا دەربارەی دینار نووسیویەتی: پادشا کامل (٦٣٥ك/١٢٣٨ز کۆچی دوایی کردووە) برازاکەم (سەلاحەدین) لە سەردەمی ئەیوبییەکاندا دەری دەکرد، "نە لە ڕۆژئاوا و نە لە ڕۆژهەڵات، هیچ دینارێك نەبوو بگاتە ئاستی دیناری ئەمیری کامیلی".[(٣)]

وا دیارە کێشی درهەم لە سەردەمەکانی زوودا هەر وەك خۆی مایەوە، لەبەر کارئاسانی چەند جۆرێکیشی لێ دەرکرا، بەڵام نرخی گۆڕینەوەی دینار و درهەم بە بەردەوامی لە بەرزبوونەوە و دابەزیندا بوو، لە ئەنجامی بەرزبوونەوە و دابەزینی نرخی زیو و نرخی فرۆشتنی دیناری کارپێکراو لە سەردەمی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر)دا یەکسان بوو بە (١٠) درهەم، وا دیارە بە شێوەیەکی گشتی لە سەردەمی چوار خەلیفەکەی یەکەمدا

---

[1] . Ehrenkreutz, A. S. , Halil Inalcik and J. Burton -Page. "Dar al-Darb. " The Encyclopedia of Islam, Leiden: Brill, 1991, Volume 2, p. 117.

[2] . Miles, G. C. "Dinar and Dirham. " The Encyclopedia of Islam, Leiden: Brill, 1992, Volume 2, p. 297.

[3] . Cited by Miles, " Dinar and Driham. ", p. 298. ; Ibn Ba'ra wrote between 615H. /1218G. and 635H. / 1238G.

(١١-٤١ك/ ٦٣٢-٦٦١ن) هەر لەم ئاستەدا بە نەگۆڕی مایەوە.[1] بەڵام ئەم نەگۆڕییە تا سەر بەردەوام نەبوو، چونکە هەردوو کانزاکە ڕووبەڕووی بارودۆخی خستنەڕوو و داخوازی یان خواستن دەبوونەوە، ئەمە وایکردبوو بە ڕێژەیەك نرخەکانیان جێگیریی بەخۆوە نەبینێت. بۆ نموونە لە نیوەی دووەمی سەردەمی ئومەوییەکاندا (٤١-١٣٢ك/٦٦١-٧٥٠ز) نرخی فرۆشتنی دینار یەکسان بوو بە (١٢) درهەم، لە کاتێکدا لە سەردەمی عەباسییەکاندا (١٣٢- ٦٥٦ك/٧٥٠-١٢٥٨ز) گەیشتە (١٥) درهەم یان کەمتر.[2] بەڵام هەندێ جار ڕێژەکە لە گۆڕاندا بوو، بەرزدەبووەوە بۆ (٢٠ و ٣٠) هەتاکو (٥٠) درهەم بۆ دینارێك[3]، ئەمەش بە هۆی دابەزینی نرخی دراوەکەوە نەبوو، بەڵکو بەهۆی دابەزینی نرخی زیووەوە بوو بەرانبەر زێڕ. مەقریزی (٨٤٥ك/١٤٤٢ز کۆچی دوایی کردووە) و ئەسەدی (٨٥٤ك/١٤٥٠ز کۆچی دوایی کردووە) هاوچەرخی وای دەبینن کە ئەو جێگیرنەبوونە وای لە دراوە ساختەکان کردبوو جێگەی دراوە ڕەسەنەکانی

---

1. الريس، محمد ضياء الدين. الخراج والنظم المالية للدولة الإسلامية، القاهرة، المكتبة الانجلو مصرية، ط٢، ١٩٦١م. ل٣٦٩. هەروەها بڕوانە:
- القرضاوي، يوسف. فقه الزكاة، بيروت، دار الارشاد، ١٩٦٩ بەرگ ١، ل٢٦٤.

2. الريس، الخراج والنظم المالية للدولة الإسلامية، سەرچاوەی پێشوو، ل ٣٧٤ . هەروەها بڕوانە:
- القرضاوي، فقه الزكاة، سەرچاوەی پێشوو، بەرگ١، ل ٢٦٤ .
- Miles, G. C. " Dinar and Dirham. ", p. 320.

3. - القرضاوي، فقه الزكاة، سەرچاوەی پێشوو، بەرگ ١، ل ٢٦٤ . هەروەها بڕوانە:
- Miles, G. C. " Dinar and Dirham. ", p. 320

لە مامەڵەدا گرتبووەوە.[1] ئەمەش دیاردەیەك بوو لە سەدەی شازدەیەمدا بە دەستەواژەی یاسای گرشام (Gresham's Law) ئاماژەی پێ دەردێت. بەبێ دوودڵی ئەوەش دووپات بووەوە کە دراوی عەرەبی بە شێوەیەکی بەرفراوان لە مامەڵەی ئابووریی نێوان وڵاتە ئیسلامییەکان و جیهانی تر کە لەو کاتەدا ناسرابوون، قبووڵ کرا، ئەمەش لە ئەنجامی دۆزینەوەی دراوی عەرەبی لە گەنجینەکانی ڕووسیا و ئەورووپا و ڕۆژهەڵاتی دوور.[2]

لەم سەردەمە نوێیەدا، حکومەتەکان ئارەزوویان لێیە پەنا ببەنە بەر زیادەڕۆیی لە دەرکردنی دراوی کاغەزی باوەڕپێکراو، بۆ یارمەتیدانیان لە زاڵبوون بەسەر کێشە داراییەکاندا، مەغۆلەکانیش لە (٦٩٣ك/١٢٩٤ز) هەوڵیان دا دراوێکی کاغەز دەربکەن. ئەم کارەشیان لەلایەن گەلەوە بەرپەرچێکی گەورە درایەوە، بوو بە هۆی دەستبەجێ ڕاوەستانی فراوانبوونی ئابووری و کارەکان[3]، بۆیە ئەم ڕووداوە ناخۆشە وای لە زانایانی ئایینی کرد بەرهەڵستیی دراوی کاغەز بکەن، حکومەتەکانی داهاتووش خۆیان بەدوور دەگرت لە دەرکردنی، بەڵام حکومەتەکان بۆ جێگرەوەی ئەوە وازیان لە پارەلێدان نەهێنا، لە میانەی کەمکردنەوەی کتوپڕی پارەی کانزایی، بە مەبەستی باج وەرگرتن لە لێدانی پارەی زێڕ و

---

1. المصري، رفيق يونس. الإسلام والنقود، جدة، جامعة الملك بن عبدالعزيز، ١٩٩٠م، ل٥٤و٦٦.

2. Miles, G. C. " Dinar and Dirham. ", p. 320. ; and Kramer, J. H. " Geography and Commeree. " In Thomas Arnold and Alfred Guillaume (eds. ), The Legacy of Islam. London: Oxford University Press, 1952 p. 100.

3. Spuler, Ettinghausen. "Ilkhans. ", Volume 3, p. 1122.

زیو بۆ جێگرتنەوەی ئەو بۆشاییەی لە نێوان داهات و خەرجیدا خەریك بوو دروست دەبوو.[1] لە ئەنجامی ئەمە، وردە وردە سەرپێچی لە کێش و پاکیی دراوەکاندا دەردەکەوت، وێڕای نارەزایی زانا ئاینییەکان بۆ ئەم کارە، ئەمەش بە شێوازێکی تایبەت لە ماوەی مەمالیکە شەرکسەکان (٧٨٤–٩٢٢ك/١٣٨٢–١٥١٧ز) و عوسمانییەکاندا (٦٩٩– ١٣٤٢ك/١٢٩٩–١٩٢٤ز) ڕووی دا.

کەمیی زیو لە ئەوروپا، وایکرد لە سەردەمی مەمالیکەکاندا دراوی زیوی بە دراوی مسی بگۆڕن.[2] بەڵام گیروگرفتە داراییەکان کە لە ئەنجامی خراپیی کشتوکاڵ و بە هۆی باجی ستەمکارانەی زۆرەوە کە سەپێنرابوو بەسەر جووتیاراندا وایکرد زیادەڕۆیی لە لێدانی پارەی مسیدا بکرێت. ئەمەش بوو بە هۆی دابەزینی بەهاکەی[3] و هەڵاوسان و ڕووخانی زیاتری

---

1. کەمکردنەوەی پارە، هەڵسوکەوتێك نەبوو تەنیا مەمالیك و عوسمانییەکان پەنایان بۆ بردبێت، بەڵکو ڕەفتارێك بوو لە شوێنانی تریش دەکرا. بۆ ئاگاداربوون لە ڕێژەکانی نزمبوونەوەی هەموو دراوە ئەوروپییەکان لە سەدەی پازدەیەم تا هەژدەیەم. بڕوانە:
- Brandel, Fernand and Frank Spooner. " Prices in Europe from 1450 to 1750. " In E. E. Rich and C. H. Wilson (eds. ), The Cambridge Economic History of Europe Cambridge: Cambridge University Press, 1967, Volume 4, p. 458, figure 4.

2. لەبەر ئەوەی ئیبن خەلدون لە کاتی کێشە داراییەکاندا ژیاوە، بۆیە گرنگییەکی تایبەتی بە کاریگەریی کەمکردنەوەی دراو لەسەر کۆمەڵگا و ئابووری داوە. بڕوانە:
ـ ابن خلدون، المقدمە، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٦١–٢٦٤.

3. المقريزي، تقي الدين أحمد بن علي. كتاب السلوك لمعرفة دول الملوك، تحقيق: سعيد عبدالفتاح عاشور، القاهرة، دار الكتب والوثائق القومية، مركز تحقيق التراث، جمهورية مصر العربية، ١٩٧١م / بەرگی ٣، ل١١٣٠–١١٣٤.
Allouche, Adel. Mamluk Economics: A Study and Translation of Al-Maqrizii's Ighathah. Salt Lake City: University of Utah Press, 1994, p. 16-17.

گەشـەپێدان. هـەروەها لـە سـەردەمی عوسمانییەکانیـشدا، نرخـی دراوی زیوی فەرمی کە بە هۆقە خەملێنرابوو، دابەزییـەوە و نرخەکـەی لـە سـاڵی (١٤٦٩-١٤٧٩ز) لـە (٠,٨٥) گرامـەوە تـا سـاڵی (١٨٣٠-١٨٣٠ز) بـۆ (٠,٠٠٧٣) گرام دابەزی.[1] لەبەر ئەوەی دابەزینی نرخـی زیـو، وێـڕای بـڕی زیـو لـە هۆقەیەکـدا، بەهاکـەی زۆر زۆر نزمبـووەوە، بۆیـە پێویـست بـوو کـارپێکردنی ڕابگیرێـت، لەبەرئـەوەی دراوی بنـەڕەتی بـوو لـە مـاوەی ڕێکخـستنەوەکاندا (١٨٣٩-١٨٧٦ز) لەگـەڵ ئـەوەی بـڕی زیـوی خـەملێنراویش دوای سـاڵی (١٨٥٠ز) لـە ئاسـتی (٠,٠٠٨٣) گرامـدا تۆمـار کرابوو.

لەبەرئـەوەی دابـەزینی دراو پێـشلکارییەکی زەق و دووپاتکردنـەوەی شەریعەتە لەسەر ڕاستگۆیی و ڕاستی لە هـەموو پێوانـەکانی بـەهادا، بۆیـە ساختەکردن لـە دەرکردنـی دراو لـە سـەدەی چـواردەیەم و دوای ئـەویش، بووە هانـدەر بـۆ نووسـینێکی زۆر دەربـارەی سیاسـەتی بـیردۆزی دراوی. بایـك (Baeck) وایـدەبینێت کـە "پێویـستە موسـڵمانەکان بـە پێـشەنگ دابنرێن لە کەسانی تر، ئەوان بەرهـەمهێنی کاریگـەر بـوون بـۆ ئـەدەبیاتی هـەردوو سـەدەی چـواردەیەم و پازدەیـەمی تایبـەت بـە دابـەزینی نرخـی دراو".[2]

---

[1]. بۆ زانینی بری زیو لە دراوی زیوی فەرمی "هۆقە" لە ماوەی ١٤٦٩ – ١٩١٤ز، بڕوانە:
- Pamuk, "The Evolution of Financial Institutions in the Ottoman Empire, 1600-1914. ", Table 1, p. 455.

[2]. Baeck, The Mediterranean Tradition in Economic Thought, p. 114.

## پێنجەم: قەرزی دەرەکی

کاتێ بەکارهێنانی باجی قورس و کەمکردنەوەی دراو نەیانتوانی ئارەزووی فەرمانڕەوا گەندەڵەکان لە زیادەڕۆییدا تێر بکەن، دەستیان کرد بەوەی بە شێوەیەکی لەڕادەبەدەر پشت بە قەرزی دەرەکی ببەستن، لە ماوەی ساڵانی (١٨٥٤–١٨٧٧ز)، ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی ناچار بوو بە کردار هەموو ساڵێك قەرز بکات، تاوەکو قەرزەکەی گەیشتە بڕی (٢٠٠) ملیۆن جونیەی ئیستەرلینی، کە لە ساڵی (٢٠٠٤ز)دا و دوای ڕەچاوکردنی دابەزینی بەهای کڕینی جونیە، ئەوا بەرانبەر بە نزیکەی (٨١٣١) ملیۆن جونیەی ئیستەرلینی.[1] لەبەرئەوەی کاتی خۆی

---

[1] . ژمارەی تەواو نەك ڕێژەکەی کە دەگەیشتە (٢٠٠) ملیۆن جونیەی ئیستەرلینی کە ئەمانە هێناویانەتەوە:

Lewis, Bernard. " Duyun-e- Umumiyye. " The Ecyclopedia of Islam, Leiden: Brill, 1991, Volume 2, p. 677.

- ژمارەی ڕێژەکەش پشتبەستە بە بەیاننامەی بانکی ئینگلتەرا (The Bank of England) و سندووقی دراوی نێودەوڵەتی، بڕوانە:
- International Monetary Fund (IMF). International Financial Statistics CD -Rom and Yearbook, 2004.
- هێمای نرخی بەش بەشکردنی تایبەتی ئینگلتەرا مەزەندەکراوە بە ٨. ٢٠٤ لە ساڵی ١٨٧٤ز نزیکەی٨٣٢٥. ٧ لە ساڵی ٢٠٠٤ز دا (١٦٩٤= ١٠٠). باشتر وابوو سەیری قەرزی ساڵی ١٨٧٧ز بکرێت وەك ڕێژەیەکی سەدی، لە ئەنجامی ناوخۆیی گشتی لەو ساڵەدا. بەڵام ئەو بەیاننامانەی دەربارەی ئەنجامی ناوخۆیی لەبەردەستدا نییە، ئۆزمۆکر (Ozmucur) و پاموك (Pamuk) مەزەندەی هێمایەك دەکەن بۆ کرێی ڕاسەقینە، بەڵام ئەمە خزمەتی باسەکەمان ناکات، بڕوانە:
- -Ozmucur, Seam, and Sevket Pamuk. " Real Wages and Standards of Living in the Ottoman Empire, 1489-1914. " The Journal of Economic History, Volume 62, No. 2, June, 2002, p. 301.

وا سەیری تورکیا دەکرا کە لەو کاتەدا مەترسیی گەورەی هەیە بە هۆی کێشە داراییەکانیەوە، بۆیە تا ڕادەیەك بە مەرجی توند و گران قەرزەکانی پیٚ دەدرا، لە بەدبەختییشدا ئەو پارانەی قەرز دەکران، بۆ گەشەپێدان بەکارنەدەهێنران، بەڵکو بۆ سەرفکردنی خەرجیی دیکە کە پەیوەندییان بە گەشەپێدانەوە نەبوو، هەر ئەو کارەیە کە ئێستاش لە ژمارەیەك وڵاتی ئیسلامی پەیڕەو دەکرێت، ئەمە وای لە حکومەت کرد لە (٦)ی ئوکتۆبەری (١٨٧٥ز)دا نەتوانێت قازانجەکەی بدات و قەرزەکەش بداتەوە.

بەم پێیە خاوەن قەرزەکان ئەنجومەنێکیان بۆ قەرزەکانیان دروست کرد، لە پێناو وەرگرتنەوەی قەرزەکان لەگەڵ قازانجەکەی، ژمارەی ئەندامانی ئەم ئەنجومەنە گەیشتە (٨٩٣) ئەندام، کە لە ژمارەی کارمەندانی وەزارەتی دارایی عوسمانی زیاتر بوون، ئەنجومەنەکە بووە دامەزراوەیەکی خاوەن دەستەڵاتی بەهێز و کاریگەریی درێژخایەنی لەسەر ژیانی دارایی و ئابووری و سیاسەتی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی هەبوو. ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت خەرجیی لەڕادەبەدەر و بیٚ بەرهەم، بە تایبەتی لەلایەن حکومەتەکانەوە، دەبێتە هۆی پشتبەستن بە قەرزی دەرەکی، لە ئەنجامیشدا دەبێتە هۆی لەدەستدانی سەربەخۆیی، ئەو کاتە حکومەت و دامەزراوە بیانییەکان دەتوانن کاریگەریی بەهێزیان لەسەر هەموو بەهاکانی وڵات هەبێت، وا لە حکومەتیش دەکات ئەوندە لاواز بێت نەتوانێت بڕیاری سەربەخۆ بدات. ئینالسیک (Inalcik)

ڕاست دەکات کە دەڵێت: "لەوانەیە فەرماندەکان نەیانتوانی بێت درك بەوە بکەن کە خۆبەدەستەوەدانی دارایی بۆ هێزە بیانییەکان، مەترسییەکی گەورەی بۆ سەربەخۆیی سیاسی هەیە، کە مەترسییەکەی لە بەزین لە بەرەکانی جەنگ کەمتر نییە".[١]

## شەشەم: گەندەڵی و فرۆشتنی پۆستە سیاسییەکان

لوتفی پاشا (٩٧٠ك/١٥٦٣ز کۆچی دوایی کردووە) دەڵێت: "گەندەڵیی فەرمانبەرانی دەوڵەت، دەردێکە چارەسەری نییە... خۆتان لە گەندەڵی بپارێزن... خوایە ڕزگارمان بکە لێی".[٢]

بەڕێوبردنی شارستانی و سەربازیی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی، بە چالاکترین بەڕێوبردن لە ئەوروپادا دادەنرێت.[٣] گەورەی وەزیرەکان بە پێی لێهاتوویی دادەمەزرێت، دوای دامەزراندنیشی نەك پۆستەکەی هەتا هەتایی نییە، بەڵکو بەدوور دەبێت لە هەموو کاریگەری و پاڵپەستۆیەکی ناشەرعی، ئەگەر کەمترخەمییەکی زۆریشی لێ دەرنەکەوتایە، لە پۆستەکەی دوورنەدەخرایەوە.[٤] بەلام لێهاتوویی و کارامەیی لە

---

[1]. Inalcik, Halil. " The Heyday and Decline of the Ottoman Empire. ", p. 369.

[2]. لطفي باشا، "استفنامة" برنارد لویس هێناویەتیەوە لە:

- Lewis, " Ottoman Observers of Ottoman Decline. ", p. 72.

[3]. Saunders, John J, (ed. ). The Muslim World on the Eve of Europe's Ecpansion, p. 15.

[4]. برنارد لویس لە نامەکەی "کوشو بیە"ی وەرگرتووە. بڕوانە:

سەدەی شـازدەیەمدا بـەرەو ڕووخـان دەچـوو، کاتـێ سـوڵتانەکان ئـەو کەسانەیان دادەمەزراند لە لای خۆیان پەسـەند بـوون بـۆ ئـەو پۆسـتە، بۆیـە لـە ئـەنجامی ئەمـەوە گـەورەی وەزیرەکـان دووچـاری هـەموو شێوەیەکی دەستخستنە ناو کاروباری و کودەتـا دەبـووەوە کـە کەسـە نزیکەکانی ناو کۆشك دەیانچنی، هەروەها وایلێهات دووچاری دەرکردنی کتوپڕ ببێتەوە لە هەر ساتێکدا بێت، دەسـت بەسـەر موڵـك و ماڵیـشیدا بگیرێـت، لەوانەیـە جاروبـار کـار گەیـشتبێتە لەسێدارەدانیـشی. ئەمـە کاریگەریی نەرێنیی لەسەر ڕۆحـی مەعنـەوی و لێهـاتوویی بـەڕێوەبردنی شارستانی و سەربازی هەبوو.

ئەگەر چۆنیەتی حکومەت خراپ بوو، هیچ کۆمەڵگایەك نییە بتوانێت بـە بـەردەوامی پارێزگـاری لـە هێـزی گەشـەپێدانی بکـات، بۆیـە ئـیبن خەلـدون لـە دووپاتکردنـەوەی زۆری لـە نموونەکـەی، لەسـەر سـیفەتی ڕەوشتی و فیکری بۆ هەڵبژێراوی دەستەڵات، ڕاستی کرد. بـەڵام ڕژێمـە زۆردارەکان لەوانەیە لێهاتوویی و ترسی ویژدانی تێدا نەبێت، گەر هاتوو سـەرۆکی دەوڵـەت ئـەم سـیفەتانەی تێـدا نـەبوو و هـەوڵی نـەدا بەڕێوەبردنێکی خـەمخۆر و دڵسۆز و دەسـتپاك دابـین بکـات. سـوڵتانە عوسمانییەکان لە ماوەی یەکەمدا گرنگییەکی زۆریـان بـە بەرژەوەنـدیی دەوڵـەت دەدا و پێـشوازییان لـەو کەسـانە دەکـرد کـە بـۆ داواکـاری و

- Lewis, " Ottoman Observers of Ottoman Decline. ", p. 7٥.

پێداوستییەکانیان هانایـان بـۆ دەهێنـان، بـەڵام لـە سـەردەمی سـلێمان قانوونییەوە، سوڵتانەکان زیاتر خەریکی فتوحـات و بـەرگریکردن بـوون لێیان، هیچ کاتیان نەمابوو بـۆ گرنگیـدان بـە کاروبـاری دەوڵـەت، بۆیـە چاریان نەبوو زیـاتر لـەوەی گـەل و داواکارییـەکانیان پـشتگوێ بخـەن، هاوکاریکردنی یەکتر زیانێکی گەورەی پێگەیشت، کـە پێـشتر لـە نێـوان دەستەڵات و گەلدا هەبوو، بەڵکو سوڵتانەکان ماوەیان نەبوو گرنگـی بـە فێرکردن و پەروەردەکردنی منداڵەکانیان بدەن، دوای مردنی سلێمان لە (١٥٦٦ز)دا، سـیازدە سـوڵتانی ناکارامـەی تـر هاتنـە سـەر حـوکم، کـە توانای بەڕێوەبردنی ڕاستەقینەی دەسـتەڵاتیان نـەبوو، هـەتاوەکو گـەر ئارەزووشیان لێبووایە.

بەم شێوەیە زۆربەی هەرە زۆری چالاکییەکانی بنیـاتی دەوڵـەت بـۆ گەورەی وەزیرەکان هێڵرایەوە، لەوانەیە ئەمـەش هەڵەیـەك نـەبێت گـەر وەزیرەکـان خۆیـان دەسـتپاك و لێهـاتوو و بــەرپرس بونایــە بەرانبــەر دەستەڵاتدارەکان (هەروەك چۆن لە بنەماڵەی دەستەڵاتەکانی پێشوودا دەگـوزەرا)، کاروباریـشیان بـە پێـی ئامـانج و ڕێنمـایی دیـاریکراو بـوو. دەکرا ئەمە هاوکارێك بێت بۆ دابینکردنـی بـەڕێوەبردنێکی تـا ڕادەیـەك پاك و کاریگەر لەژێر فـەرمانی ئەوانـدا، بـەڵام کێـشە دووبارەبووەکـانی دارایــی و پێویــستیی بــەردەوام بــۆ داهــات لــە ســەدەی شــازدەیەم و سەدەکانی دوایی، بوونە هۆکارێك کە دامەزراندنی وەزیرەکـان بـە پێـی ململانێـی سیاسـی و پـارەدانێکی زۆر لـەبری لێهـاتوویی بـوو. وایلێهـات

فرۆشتنی پۆستەکان لە دوای سەدەی حەڤدەیەم کارێکی ئاشکرا بوو، هەتاوەکو پشت بەوە دەبەسترا کێ پارەی زیاتر دەدات.[1] دوای ئەوەی وەزیر پۆستەکەی وەردەگرت، دەستەڵاتەکەی لە پێناو دەستکەوتی تایبەتی خۆی و گەڕاندنەوەی ئەو بڕە پارەیەی داویەتی لە میانەی فرۆشتنی پۆستی باڵای تر، خراپ بەکاردەهێنا.[2] دامەزراندنی زانایان و دادوەر و بەرزکردنەوەی پلەکانیان بە بێ گوێدانە لێهاتوویی و خزمەت دەستی پێ کرد، ئەمە وایکرد متمانەی گەل بدۆڕێنن. ئەمەش بووە هۆی نەمانی چالاکی و لێهاتوویی و دەزگای حکومەت وەك دووچاری ئیفلیجی هاتبێت وا بوو، هەر ئەم هۆیە بوو وای لە ئیبن خەلدون کرد لە ژیاننامەکەیدا نارەزایی دەربارەی بڵاوبوونەوەی بەرتیل و نەبوونی سیستم لە کارە دادوەرییەکاندا و گەلێکی تر لە کارە گەندەڵییەکان، لە سەردەمی خۆی و سەردەمی مەمالیکە شەرکسەکاندا دەرببڕێت (٧٨٤-٩٢٢ك/ ١٣٨٢-١٥١٧ز).[3]

گەندەڵیی کرداو زیانی بە هەموو لایەنەکانی ژیانی ئیمپراتۆرییەت (شارستانی و سەربازی و ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی و ئایینی)

---

1 . Inalcik, Halil and Dovald Quataert (eds. ). An Economic and Social History of the Ottoman Empire, 1300-1914, p. 74.

2 . Ibid.

3 . ابن خلدون، التعریف بابن خلدون ورحلته غربا وشرقا، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٥٧ -٢٥٨. هەروەها بڕوانە:

- Khadduri, Majid. The Islamic Conception of Justice. Baltimore: Johns Hopkins University Press, 1984, p. 189.

گەیاند. گەڕان بە دوای سەرچاوەی داهاتیشدا، کە ئەویش پەیوەست بوو بە گەندەڵییەوە، بواری دەستەڵاتێکی فراوانی بۆ باجگرەکان ڕەخساند، کە بژێویی جووتیارەکانیان دەڕووتاندەوە و پەنایان بۆ دەستبەسەراگرتنی تەواوی موڵك و ماڵەکانیان دەبرد. نەمانی پاراستنی حکومەتی ناوەندییش لە ئەنجامی گەندەڵیدا، وای لە جووتیارەکان کرد زەوییەکانیان بەجێبهێڵن و هەندێکیان بەرەو ناوچە شارستانییەکان هەڵدەهاتن، لە کاتێکدا ئەوانی تر بووبوونە ڕێگر.[1] هیچ ئارامی و ئاسایشێك بۆ ژیان و موڵك و ماڵ نەمابوو، دەستەڵاتی یاسا و دادوەرییش کە لە سەدەکانی پێشووی ئیسلامدا ناوبانگی دەرکردبوو، نەما بوو. چارەنووسی گەشەپێدانی ڕەوشتی و ئابووری وا بوو کە لەو بارودۆخەدا دووچاری گەندەڵیی کرپیار ببێتەوە.

ئەوروپاییەکان لە سەدەی هەژدەیەمدا، وای دەبینن کە نەبوونی لێهاتویی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی و گەندەڵییەکانی ڕوون و ئاشکرا بوو و "وا دیار بوو هەر کەسێك پۆستێکی هەبوویێت لە دەوڵەتدا، داینابوو بۆ فرۆشتن". شتێکی سروشتیشە کە هێزە ڕۆژئاواییەکان ئەم لاوازییە بقۆزنەوە بۆ کڕینی لایەنگیریی خاوەن پۆستە باڵاکان و یارمەتییان لێ وەربگرن بۆ پشتگیریکردنی بزووتنەوە جوداییخوازەکان، دواتریش لاوازکردنی زیاتری ئیمپراتۆرییەت.

---

1 . Inalcik, Halil. " The Heyday and Decline of the Ottoman Empire. , " p. 324.

ژمـارەی ئـەو زانایانــەی نـاڕازیبوون لـەو بارودۆخــە بـەردەوام لـە زۆربووندا بوو. نامەی دوورودرێژیان دەنووسی و تێیدا نـاڕەزایی خۆیـان دەردەبڕی و ئامۆژگاریی بەسـوودیان پێـشکەش دەکـرد. هـەر بۆیـە لـە تورکیا چەند نووسینێك سەری هەڵدا دەربارەی "مرایـا الامـراء" ـ واتـە ئاوێنەی شازادەکان ـ کە پێشتر ئاماژەی پێدرا لـە نووسـینی ژمارەیـەك لە بیرمەندان، لەو کاتەوەی ئیمپراتۆرییەت لەوپـەڕی دەسـتەڵاتدا بـوو. لەبـەر گـۆڕانی ڕەفتـاری کەسـانی سـەر بـە دەسـتەڵاتیش، بیرمەنـدان پێشوەخت چاوەڕوانی گرانی و ناڕەحەتییەکانیان دەکرد کە لە ئایندەدا ڕوو دەدات. لەو بیرمەندانەش لوتفی پاشا (٩٧٠ك/١٥٦٣ز کۆچی دوایـی کـردووە)، مـستەفا عـەلی ئەخیـساری (١٠٢٥ك/١٦١٦ز کۆچـی دوایـی کردووە)، کوشو بیـە (١٠٥٨ك/١٦٤٨ز کۆچـی دوایـی کـردووە)، حـاجی خەلیفـە (١٠٦٧ك/١٦٥٧ز کۆچـی دوایـی کـردووە)، حـسێن حـەزارفین (١٠٨٩ك/١٦٧٩ز کۆچـــی دوایـــی کـــردووە)، ســـاری محەمـــەد پاشـــا (١١٧٩ك/١٧٦٧ز کۆچی دوایی کردووە).[(١)] هەموویان ئەوەیان دووپـات دەکردەوە لەسەر ڕاگرتنی چاوچـنۆکیی پادشـا و دارودەسـتەکەی، بـۆ

---

[1] . بۆ زانینی بۆچوونەکانی ئەخیساری، بڕوانە:

- Meyer, M. S. "Economic Thought in the Ottoman Empire in the 14th-Early 19th Centuries. Archiv Orientali, 4:57, 1989, p. 313.

- بۆ بۆچوونەکانی ئەوانی دی، بڕوانە:

- Lewis, "Ottoman Observers of Ottoman Decline. "

دوورکەوتنەوە لەو ئەنجامە خراپانەی کە بەم هۆیانەوە ڕوو دەدەن. هەروەها دووپاتی پێوستی بە دادپەروەری و ڕێزگرتن لە مافی موڵکایەتی و دامەزراندن و پلە بەرزکردنەوە تەنیا لەسەر بنەڕەتی توانا و لێهاتوویی بێت، لە سەپاندنی باجیشدا مامناوەندی بن و لە ڕێگەی کەمکردنەوەی سوپا و بیرۆکراتییەتەوە خەرجی کەمبکەنەوە. بەڵام خوی وەدووکەوتنی بەرپرسان و خۆدروستکردن لەو کاتەدا، وای لێهاتبوو ڕەگی داکوتابوو لە ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیدا، کارێکی زەحمەت بوو بتونرایت هیچ گۆڕانکارییەك بکرێت.

## حەوتەم: دارمانی ئابووری

لەوانەبوو کارێکی سەخت بووایە ئامانجی برایەتیی موسڵمانان و دەستەبەری کۆمەڵایەتی بەدیبهاتایە، ئەگەر لە هەردوو بەهای ڕەوشت و دادوەرییەوە سەرچاوەی نەگرتبایە، وێڕای چاکبوونی هەندێك لە باری کۆمەڵایەتی و ئابووریی گەل، بە تایبەتی چینی هەژار و ڕەشوڕووت، حکومەتەکان لە سەردەمی پێشوودا ڕۆڵێکی گەورەیان لەم بوارەدا دەگێڕا، لە ڕێگەی دەستەبەرکردنی سەروەریی یاسا و کەمکردنەوەی باج و هاندان بۆ فێرکردن و توێژینەوە و بەدەستهێنانی ژێرخانی ئابووری و گەلێ خزمەتگوزاریی تر.

وەك دەردەکەوێت، هەمووان ئاسوودە بوون بەوەی بەری گەشەسەندن دەخۆن، بەم پێیە گەشەکردنێکی نائاساییی لە بەرهەمە

کـشتوکاڵییەکان و پیـــشەییەکاندا ڕووی دا، کـــە پەیوســـت بـــوو بـــە گەشەکردنێکی خێرا لە ئابووری و کارەکانیدا و بنیاتنانی بنەمای بازاڕی فراوانـی هاوبـەش، ئـابووریی جیهـانی ئیـسلامییش لـە سـەردەمەکانی ناوەڕاستدا، هەر وەك لویس (Lewes) دانی پێدا دەنێـت "لـە هـەموو ڕوویەکەوە لە ئابووریی ئەوروپا پیشکەوتووتر بوو، چونکە دەوڵەمەنـدتر و گەورەتر و باشترین ڕێکخستنی هەبوو، کە زۆرتـرین کـاڵا بـۆ فرۆشـتن نیـشان دەدرا، زۆرتـرین پـارەش هـەبوو بـۆ کـڕین و کۆڕبەنـدێکی زۆری پێشکەوتوو لە پەیوەندییە ئابوورییەکان دروست کرابوو".[1]

بەڵام ئەم بارودۆخە لـە سـەدەی دوازدەیـەمی کۆچـی / هەژدەیـەمی زاینی، پاشەکشەی بەخۆوە بینی، هۆکارەکانیـشی تێگەیـشتنیان گـران نییـــە، وەك زیـــادەڕۆیی لـــە هەڵمەتـــە ســـەربازییەکان و ڕابـــواردنی باڵادەسـتەکان، لـە پـاڵ بیرۆکراتییـەکی هەڵاوسـاو و گەنـدەڵ، ئەمانـە هەمووی دەکـرا، بەشـێکی کـەم لـە داهـات بـۆ بنیاتنانـەوەی میللـەت و خۆشگوزەرانیی گشتی دەهێڵرایەوە. ئەمە بوو بە هۆی وێـڕای بـاجێکی زۆر و هەستنەکردن بە ئارامی و ئاسایشی ژیان و ماڵ و موڵك، هەروەها جیهانی ئیسلامی نـەتوانێت – لەگـەڵ ئـەو هـەموو توانـا زەبەلاحـەی – شۆڕشـی کـشتوکاڵی و فیکرییـــە دەستپێـشخەرییەکەی وەك شۆڕشـــە پیشەسازییەکەی ئەورورپا و وڵاتەیەکگرتووەکان و دواتریش ژاپـۆن لـێ

---

1 . Lewis, The Middle East: 2000 years of History. . . , p. 177.

بکـات. ئـەو لێهـاتوویی و تواناییانـەی هـەبوون، لـە ئـەنجامی نـەبوونی لێپرسـینەوەی سیاسـی ونکـران، ئەمـەش وایکـرد حکومـەت ئـەو ڕۆڵـە نەبینێت کە لە سـەدەکانی پێـشوودا هـەیبوو. فـشاری جـەماوەری، بـۆ ئەوەی زۆر لە حکومەتە دیموکراتەکان بکات کە کـارابن، بـوونی نـەبوو، ئەمەش ئەنجامی خراپی لێکەوتەوە و ئێستاش جیهانی ئیسلامی پێوەی دەناڵێنێت، لەوانەیە بۆ ماوەیەکی درێژیش لە ئایندەدا بەردەوام بێت.

فێرکردن، کە یەکێکە لەو هێزە جووڵێنەرانەی پشتگیریی گەشەپێدان دەکات، لە سایەی ئیمپراتۆرییەتی عوسمانیدا بایەخێکی زۆر کەمی پـێ درا، بۆیە ڕێژەی خوێندنەوە و نووسـین لـەناو جـەماوەری تورکیـادا لـە سـاڵی (١٨٦٨ز) نزیکـەی تـەنیا (٢٪) بـوو.[1] هـەتاوەکو بنیـاتی سەرەکیش – کە هێزێکی بنەڕەتییە بۆ بزوتنی گەشەپێدان – پشتگوێ خرابوو. لە ساڵی (١٨٥٠ز)دا یەك هێڵی ئاسنین لە تورکیا و ئەو وڵاتانەی لـەژێر دەسـتەڵاتی عوسمانیـدا بـوون، نـەبوو.[2] تـا سـاڵی (١٨٦٠ز) و ماوەیەکی زیاتریش، هیچ پرۆژەیەکی هێڵی ئاسنین جێبەجێ نـەکرا، لـە ساڵی (١٨٧٠ز)دا درێژیی هێڵە ئاسنینەکان گەیشتە (١٨٠کم) و لە ساڵی

---

[1]. ضیاء پاشا بە نموونـە هێناویەتییـەوە لـە وتـارێکی لـە "التنظیمـات" (اسـتانبول ١٩٤٠م)، ل٨٤١، و ئینالیسکیش لەوی وەرگرتووە لە:

-Inalcik, Halil. " The Rise of the Ottoman Empire. ", p. 369.

[2]. See Table III. 21, In Rostow, W. W. The World Economy: History and Prospects. London: Macmillan, 1978, p. 152 ; See also Quataert, "The Age of Reforms, 1812-1914. ", p. 804.

(١٩١٣ن)دا گەیشتە (٥٤٣٨کم)، (خشتەی ژمارە ٣). بەڵام ئەمە ئەگەر بەراورد بکرێت لەگەڵ (٢١٥٠٠) و (٣٢٦٢٣) لەو دوو ساڵدا لەگەڵ (٨٥١٧٠کم) لە شانشینی یەکگرتوو و (٤٠١٩٧٧کم) لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمەریکا، زۆر کەمە.

نەبوونی بنیاتی بنەڕەتی تەواو لە لایەنی ئابووری و کۆمەڵایەتییەوە، وێڕای سیستمێکی باجی ماندوو و نەبوونی مافی موڵکایەتی، وایان لە میکانیزمی ئابووری ئیمپراتۆرییەت کرد لە بارودۆخێکی ئیفلیجدا بێت، بەرهەمهێنانیش لە ئاستێکی زۆر نزمدا بێت. خۆشی و ڕابواردنی ئورستوکراتییەکان وایکردبوو، وێڕای دابەزینی داهاتی جووتیاران و پیشەوەرەکان، پاشەکەوت کەمبێتەوە. هەتاوەکو ئەو پاشەکەوتەشی بەدیهاتبوو، لە ترسی هەمیشەیی جووتیارەکان لە بیانووگرتنی بەردەوامی باجگرەکان شاردرابووەوە. بۆیە نەدەتوانرا بە شێوەیەکی کاریگەر بۆ چاککردنی ئامێرەکانی بەرهەمهێنان و تەکنیکەکانی بەکاربهێنرێت.[1] هەروەها هەژاریی کەرتی جووتیاران زیانی بە کەرتی پیشەسازیی شارستانی گەیاندبوو، نەبوونی داخوازیی تەواو بۆ کاڵاکان، لە پاڵیشیدا کەشە سیاسییە چەوسێنەرەکە، یارمەتیدەر نەبوون بۆ دامەزراندنی پیشەسازی بە شێوەیەکی بەرفراوان، یان دامەزراندنی کۆمپانیا گەورەکان. کۆمپانیا بچووکەکان مانەوە و تەکنیکێکیان

---

[1]. Faroghi, " Crisis and Change. ", p. 207.

بەرکاردەهێنا کە کرێکاری زۆری پێویست بوو، ئەمەش تەکنیکێکە کە سەرمایەیەکی کەمی نەگۆڕی دەوێت. بەو شێوەیە بناغەی کشتوکاڵ و پیشەسازیی سەرکەوتوو لە فراوانکردندا نەبوو، کە هاوشان بێت لەگەڵ پێداویستییەکانی ئیمپراتۆرییەتدا، بۆیە نەدەتوانرا بنیاتی پیشەسازی و ئابوورییەکی بەهێز و خۆڕاگر دروست بکرێت، بتوانێت لە بازاڕە نێودەوڵەتییەکاندا کێبڕکێ بکات و یارمەتیی زیادبوونی بەشی ئیمپراتۆرییەت لە فراوانکردن و ئابووری و هەروەها زۆرکردنی داهاتی حکومەتدا بدات.[1]

---

[1] . Inalcik, Halil and Dovald Quataert (eds. ). An Economic and Social History of the Ottoman Empire, 1300 -1914, p. 51-52.

**(خشتەی ژمارە ٣) درێژیی هێڵە ئاسنینەکان لە هەندێ وڵاتانی پەیوەندیدار (بە کیلۆمەتر)[1]**

| وڵات | ساڵی ١٨٧٠ ز | ساڵی ١٩١٣ ز |
|---|---|---|
| فەرەنسا | ١٥٥٥٤ | ٤٠٧٧٠ |
| ئەڵمانیا | ١٨٨٧٦ | ٦٣٣٧٨ |
| یۆنان | – | – |
| هیندستان | ٧٦٧٨ | ٦٦٨٢٢ |
| ئیتاڵیا | ٦٤٢٩ | ١٨٨٧٣ |
| ڕووسیا | ١٠٧٣١ | ٧٠١٥٦ |
| تورکیا | ١٨٠ | ٥٤٣٨ |
| شانشینی یەکگرتوو | ٢١٥٠٠ | ٣٢٦٢٣ |
| ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا | ٨٥١٧٠ | ٤٠١٩٧٧ |

لە نەبوونی بڵاوکراوەی تایبەت بە ئابووریی گشتی، ناچار پەنا دەبرێتە بەر هەر بڵاوکراوەیەکی بەردەست، ئەمەش بەڵگەی ڕوونی بارودۆخی لاوازی ئابووریی ئەو وڵاتەیە. بۆ نموونە: بەرهەمی گەنم لە تورکیا لە ساڵی (١٨٨٨ز)دا (٥٠) ملیۆن بوشل بووە (خشتەی ژمارە ٤)، بەڵام یەک لەدوای

---

1. سەرچاوەکەی:
- Maddison, Angus. Monitoring the World Economy 1820-1992. Paris: OECD, Development Centre Studies, 1995, Table 3. 4, p. 54.

یەك لە شانشینی یەکگرتوو و فەرەنسا گەیشتە (٢٧٦,٧٦) ملیـۆن بوشـل و لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا و هیندستان (٤٧٨,٤١٥) ملیـۆن بوشـل بوو.[١] لە کەرتی پیشەسازیی گۆڕینەوەدا، تا سـاڵی (١٩١٣ز)، تـەنیا (٢٦٩) دامەزراوە هەبوو کە بە ئامێر ئیـشیان دەکـرد، نزیکـەی (١٧٠٠٠) کرێکـار لـە هەموو تورکیادا کاریان دەکرد.[٢] هاوبەشـی پیـشەسازی لـە کـۆی بەرهـەمی نەتـــەوەیی لـــە ســـاڵی (١٩٣٩ز)دا تـــەنیا (١٣٪) بـــوو.[٣] لـــە کاتێکـــدا ئیمپراتۆرییـەتی عوسمـانی لـەم بارودۆخـە شکـستخواردووەدا بـوو، هێـزە ڕۆژئاواییـــەکان بەرهـــەمیان زیـــاد دەکـــرد و خـــەرجیی بەرهـــەمهێنانیان کەمدەکردەوە، بە گرنگیدان بە چاککردنی چۆنیەتی بنیاتە بنەڕەتییەکانی کۆمەڵایـەتی و مـادی، لـە پـاڵ بـەئامێرکردن و ڕێنمـاییکردنی کـشتوکاڵ و پیشەسازی وەك یەك.[٤]

---

[1] . لەوانەیـە دابـەزینی بەرهـەمهێنانی گـەنم لـە شانـشینی یـەکگرتوو، لـە ئـەنجامی هـاوردەوە بێـت لـە هیندستانەوە، دوای کوژاندنەوەی جەنگی سەربەخۆیی کە لە ساڵی ١٨٥٧زدا ڕووی دا، ئینگلتەرا لەگـەڵ هاتنی ساڵی ١٨٨٨زدا، سەرکەوتوو بوو لە قەدەغەکردنی پیـشەسازی لـە هیندسـتان و کردیـە وڵاتێکـی داگیرکراو و کەرەستەی خاو بنێرێتـە دەرەوە لەسـەر حیـسابی پیـشەسازییەکەی، لەگـەڵ هـاتنی سـاڵی ١٨٩٠ز دا، هێنانی قوماشی لۆکە لەلایەن هیندستانەوە بۆ ٢٠٥٠ ملیۆن یـاردە بـەرزبووەوە، دوای ئـەوەی لە ساڵی ١٨١٤زدا تەنیا یەك ملیۆن یاردە بوو. بڕوانە:

-Desai, M. "Demand for Cotton Textiles in Nineteenth Century India. " The Indian Economic and Social History Review, December, 1971. P. 337-361. ; see also Bairoch, Paul. " International Industrialization Levels from 1750 to 1989. " The Journal of European Economic History, Rome, Italy, 1982, p. 269-333.

[2] . Rostow, W. W. The World Economy: History and Prospects, p. 475.

[3] . Ibid. , p. 476.

[4] . Inalcik, Halil and Dovald Quataert (eds. ). An Economic and Social History of the Ottoman Empire. 1300-1914, p. 888.

**(خشتەی ژمارە ٤) بەرهەمهێنانی گەنم لە هەندێ وڵاتانی پەیوەندیدار (بە ملیۆن بوشل/ گشتی)[1]**

| وڵات | ١٨٣١ –١٨٤٠ز | ١٨٥١ –١٨٦٠ز | ١٨٧١ –١٨٨٠ز | ١٨٨١ –١٨٨٧ز | ١٨٨٨ز |
|---|---|---|---|---|---|
| فەرەنسا | ١٩٠ | ٢٢٣ | ٢٧٥ | ٢٩٠ | ٢٧٥ |
| ئەڵمانیا | ٥٠ | ٧٠ | ٩٤ | ٩٨ | ١٠٣ |
| یۆنان | ٢ | ٢ | ٣ | ٤ | ٦ |
| هیندستان..هتد | ١٠٨ | ١٨٧ | ٢٨٢ | ٣٧٥ | ٤٧٨ |
| ئیتاڵیا | ٦٠ | ٧٥ | ١١٥ | ١٠٥ | ١٤١ |
| ڕووسیا | ١١٠ | ١٣٠ | ٢٢٤ | ٢٥٠ | ٢٥٨ |
| تورکیا | ٢٠ | ٣٠ | ٤٠ | ٤٧ | ٥٠ |
| شانشینی یەکگرتوو | ١٢٠ | ١٢١ | ٨٥ | ٧٨ | ٧٦ |
| ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا | ٧٨ | ١٣٧ | ٣٣٨ | ٤٤٠ | ٤١٥ |

وەك یەكێك بەنزین بە ئاگردا بكات، هاتنی مەكینەی هەڵم بوو بە هۆی زیادبوونی خێرایی هاتووچۆی وشكانی و ئاوی، ڕۆژئاواش بۆ ئەوەی خەرجیی گواستنەوە كەمبكاتەوە و زیان بە كشتوكاڵ و پیشەسازیی عوسمانییەكان بگەیەنێت، هەرزانی كرد. دابەزینی نرخی بەرهەمی هاوردە و كاڵای دروستكراو، بوو بە هۆی زیانگەیاندن بە بەرهەمهێنەرە

1 . سەرچاوەكەی:

-Rostow, W. W. The World Economy: History and Prospects. London: Macmillan, 1978, Table III. 19, p. 47 and Table III. 24. P. 164-65.

عوسمانییەکان، لە بازاڕی ناردنە دەرەوە و لە بـازاڕە ناوخۆییەکانیـشدا وەك یەك. عوسمانییەکان وردە وردە کەرەستەی خاویان هەناردە دەکرد و کـاڵای دروستکراویشیان هاوردە دەکرد، هەر وەك وڵاتانی تری ڕوو لـە گەشـەکردن. هـەروەها پێوانـەی ئـابووری بـەرەو بەرژەوەنـدیی وڵاتـە پیـشەسازییەکان دەڕۆیشت.[1] بەهای هەناردەی کاڵای تورکیا لە ساڵی (١٨٧٠ن)دا تەنیا (٤٩) ملیۆن دۆلار بوو، بەراورد لەگەڵ هەناردەی فەرەنـسا و ئـەڵمانیا و شانـشینی یەکگرتوو، یەك لـەدوای یـەك بـەم شـێوەیە بـوو (٥٤١) ملیـۆن دۆلار، (٤٢٤) ملیـۆن دۆلار، (٩٧١) ملیـۆن دۆلار، ویلایەتـە یـەکگرتووەکانی ئەمـەریکاش (٤٠٣) ملیۆن دۆلار بوو (خشتەی ژمارە ٥). ڕێژەی گەشەسـەندنی سـاڵانەش گەیشتبووە (١,٥٪)ی هەناردەکراو، لـە مـاوەی چـل و سـێ سـاڵدا، واتـە لـە (١٨٧٠-١٩١٣ن)، کـە ئەمـە بـەراورد بـە ڕکابـەرە سـەرەکییەکانی تورکیـا، ئاستێکی زۆر نزم بوو. (بڕوانە خـشتەی ژمـارە ٥). لەبـەر دابـەزینی ڕێـژەی گەشەکردنی هەناردەکراو، تورکیا بـەردەوام دووچـاری حاڵـەتی کورتهێنـانی ئابووری دەبووەوە [2]، بۆیە بۆ چارەسەکردنی پشت بـە قـەرز دەبەسـترا.[3] ئیمپراتۆرییـەتی عوسمـانی لـە ڕووی ڕیزبەنـدیی ئـابووریی جیهانییـەوە، لـە هەردوو سەدەی هەژدەیەم و نۆزدەیەم دابەزی.

---

[1] . Pamuk, Sevket. The Ottoman Empire and European Capitalism, 1820-1913: Trade Investment and Production. Cambridge: Cambridge University Press, 1987, p. 48. ; and Quataert, "The Age of Reforma, 1812-1914. ", p. 830.

[2] . See Pamuk, The Ottoman Empire and European Capitalism, p. 149. ; See also Quataert, "The Age of Reforms, 1812-1914. ", p. 829.

[3] . See McGowan in Inalcik, 1994, p. 724-29. See also Quataert, " The Age of Reforms, 1812-1914. ", p. 762. : and Faroghi, "Crisis and Change. ", p. 467.

**(خشتەی ژمارە ٥) هەناردەی کاڵا (بەهای بە ملیۆنان دۆلار بە گوێرەی نرخی فرۆشتنی ئەو ڕۆژە)**[1]

| وڵات | ساڵی ١٨٧٠ ز | ساڵی ١٩١٣ ز | ڕێژەی سەدی |
|---|---|---|---|
| فەرەنسا | ٥٤١ | ٣١٢٨ | ٢,١ |
| ئەڵمانیا | ٤٢٤ | ٢٤٥٤ | ٤,٢ |
| یۆنان | ٧ | ٢٣ | ٢,٨ |
| هیندستان..هتد | ٢٥٥ | ٧٨٥ | ٢,٧ |
| ئیتاڵیا | ٢٠٨ | ٤٨٥ | ٢,٠ |
| ڕووسیا | ٢٠٦ | ٧٨٣ | ٣,٠ |
| تورکیا..هتد | ٤٩ | ٩٤ | ١,٥ |
| شانشینی یەکگرتوو | ٩٧١ | ٢٥٥٥ | ٢,٣ |
| ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا | ٤٠٣ | ٢٣٨٠ | ٤,٢ |

---

[1]. سەرچاوەکەی:

- Maddison, Angus. Monitoring the World Economy 1820-1992, Table 1. 1, p. 234-235.

– باشتر وابوو پیشاندانی نرخی هەناردەکان نەگۆڕ بووایە، ئەم نرخە نەگۆڕانەش لە خشتەی مادیسۆن ١–٢ هەیە. بەڵام لەبەرئەوەی تورکیا لەو خشتەیەدا باس نەکراوە، بۆیە نرخی هەناردەکان لێرەدا بە نرخی نەگۆڕ دانەنراوە.

لەبەرئــەوەی بڵاوکــراوەی ڕاســتەقینە دەربــارەی کــۆی بەرهــەمی ناوخۆیی پێش ساڵی (١٩١٣ز) لەبەردەستدا نییە، بۆیە ئەو بڵاوکراوانەی دەربـارەی کرێـی ڕاسـتەقینەن، لەوانەیـە هێمـای مەزەنـدەکراو بـن بـۆ ئاسـتی بـژێویی گــەل و گەشەســەندنی ئــابووریی ڕاســتەقینە. کرێــی ڕاستەقینەی ڕۆژانەی کرێکارانی شارەزا و ناشارەزا لە بواری بیناسازیدا لە ئەستەنبووڵ _ لەگەڵ گۆڕانکارییە زۆرەکانیشدا – لە سـاڵی (١٤٨٩/ ١٤٩٠ز)دا لە ١٠٠وە بەرزبووەوە بۆ ١٣٠ و ١٤٠ یەك لەدوای یەك، لەگـەڵ دەستپێکردنی جەنگی جیهانیی یەکەمدا، ئەمەش بەرزبوونەوەی ڕێژەی تــەنیا (٣٠ ٪) و (٥١٪) لــە ماوەیــەکی درێــژدا دەردەخــات کــە دەگاتــە (٤٢٣) ساڵ، بە گوێرەی ڕێژەیەکی کەمی ئاوێتەبوو کە لە (٠,١٪) کەمتر بــوو لــە ســاڵێکدا.(١) بــەو پێیــەی لەوانەیــە کــۆی بەرهــەمی نــاوخۆیی ڕاستەقینە بە جۆرێك لە جۆرەکان بە ڕێژەیەکی بەرزتر بەرزبووبێتــەوە، بەڵام ئەمە نەبووە هاوکار بۆ بەرزکردنەوەی کرێی کرێکـار و چـاککردنی بارودۆخیــان. لــە ئــەنجامی گەشەســەندنێکی لەســەرخۆی ســنوورداری

---

[1]. پاڵپشت بە هێمای ئاماژە پێکراوی کرێی ڕاستەقینەی کرێکاری شارەزا و ناشارەزا کە لێرەدا هاتووە:

- Ozmucur and Pamuk, "Real Wages and Standards of Living in the Ottoman Empire. . . ", Table 1, p. 301.

- ڕێــژەی گەشەســەندنی ئاوێتــەبوو، ســاڵانە ٠.٠٦ و ٠.٠١ ٪ یــەك بــە دوای یەکـدا بـوو، سـەبارەت بـە کرێکاری ناشارەزا و کرێکاری شارەزا لە ماوەی ئـەو ٤٢٣ سـاڵەدا. خـشتەکەش گۆڕانکـاری لـە کرێـی ڕاستەقینەدا لە نێوان ئەو ساڵانەدا دەخاتە ڕوو، لە ڕێژەی کەمەوە کە دەگاتـە ٥١٪ و ٥٠٪ لـە سـاڵی ١٥٩٠– ١٥٩٩ و ٥٢٪ و ٥١٪ لـە سـاڵانی ١٧٧٠ –١٧٧٩ یـەك بـە دوای یەکـدا بـۆ ڕێژەیـەکی بـەرز دەگەیشتە ١٣٠ و ١٥٠ لە ساڵانی ١٩١٠–١٩١٥.

بچووکدا، داهـاتی هـەر تاکێـك لـە کۆی بەرهـەمی نـاوخۆیی بـە دۆلاری نێودەوڵەتی، لە ساڵی (١٩٩٠ز)دا بڕی (٩٧٩) دۆلار بووە، لە تورکیا لـە ساڵی (١٩١٣ز)دا کـە کۆنترین سـاڵە بڵاوکـراوەی تورکیـای تێـدا بێـت، بەرانبەر بە (٣٤٥٢) دۆلار بووە، لە فەرەنسا (١٤٥٢) دۆلار و شانـشینی یەکگرتوو (٥٠٣٢) دۆلار و لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئـەمریکا (٥٣٠٧) دۆلار بووە (خشتەی ژمارە ٦). ژمارەکان وا دەردەدەخەن کە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا لەو کاتەدا ئابوورییەکی گەشەسەندووی خێرای هـەبووە، بەشیـشی لـە کۆی جیهـانیی بەرهـەمی نـاوخۆیی بـە ڕێـژەی (١,٨٪) لـــە ســـاڵی (١٨٢٠ز)دا بـــەرزبووەوە بـــۆ (٨,٩٪) لـــە ســـاڵی (١٨٧٠ز)دا و (١٩٪) لە ساڵی (١٩١٣ز)دا.[1] شتێکی ڕوون و ئاشکرا بوو کـە تورکیـا ڕێگـای گرتبـووە بـەر ببێتـە هێزێکـی گـەورە لـە سـەدەی بیستەمدا. ناشتوانین نکووڵی لەو ڕۆڵە بکەین کـە حکومـەت لـە میانـەی پـــشتگیریکردنی گەشەســـەندنی فێرکـــردن و تـــەکنۆلۆژیا و ژێرخـــانی بنەڕەتی و دامەزراوەکان بینی.

گەندەڵی و بەرزبوونەوەی ڕێژەی باج تەنیا زیان بە ئابووری و توانـای حکومەت بۆ دەستەبەرکردنی گەشەپێدان ناگەیەنن، بەڵکو کاریگەرییشیان

---

1 (Maddison, Monitoring the Wlrld Economy 1820-1920, Table B. 20, p. 263.

– بەشی ویلایەتە یەکگرتووەکان بە ڕێژەی ٢٧. ٣ ٪ لە ساڵی ١٩٥٠ بەرزبووەوە، بەڵام ئەمە دابەزی لەو کاتەوە.

لەسەر هاوکاریکردن لە نێوان حکومەت و گەلدا دەبێت. ئەو هەموو داهاتەی لەلایەن جووتیاران و پیشەوەران و بازرگانەکانەوە ڕژانە دەست کەمینەیەکی خاوەن دەستەڵات لە ناوچە شارستانییەکاندا، درزێکی لە سەرمایە و پلەی کۆمەڵایەتی و فەرمانبەری دروست کرد، کە هێز و توانای دانیشتووانەکانی تر و ڕەوشتیانی لاواز کرد، بۆیە پێویست بوو بە خواستی سروشتی گەل ڕێگای تر بدۆزرێتەوە بۆ فێڵکردن لە خاوەن زەوییەکان و باجگرەکان و ئەوانی تر، بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو ستەمەی کە لێیان دەکرێت. بێگومان ئەمە کاریگەریی زۆری هەبوو لەسەر ڕووخانی وزەی ڕەوشتییان، هەر وەك ئەلماوەردی تێبینیی کردووە و دەڵێت: "هیچ شتێك وەك ستەم نییە، بە خێرایی خەڵکی بەرەو گەندەڵی و ڕووخانی ویژادنی دەبات".[1] هەروەها هاوکاریی کۆمەڵایەتیش کەم بووەوە و حاڵەتی لێکترازان و کەرت کەرتبوونی ناوخۆیی پەرەی سەند، کە بە درێژایی کات تا ڕادەیەك هەر هەبوو، ڕێگەخۆشکەرێك بوو بۆ پەرتبوونی دەستەڵاتی سوڵتان، هەر ئەمە بووە هۆی بێهێزی و لاوازیی ئیمپراتۆرییەت. ماوەی ئەوەش نەمابوو چاکسازیی ماوەی ڕێکخستنەکان (١٨٣٩-١٨٧٦ز) ڕێگری لەمە بکات، لەبەر نەبوونی لێپرسینەوەی سیاسی – کە هۆکاری سەرەکی بوو بۆ دارمان – کە بە هێزەوە بالادەستبوو.

---

[1] . الماوردي، أبو الحسن علي. أدب الدنيا والدين، تحقيق: مصطفى السقا، القاهرة، ١٩٥٥، ل١٢٥.

**(خشتەی ژمارە ٦) ناوەندی پشکی تاك لە کۆی بەرهەمی ناوخۆیی لە هەندێ وڵاتانی پەیوەندیدار**

**(بە دۆلاری نێودەوڵەتی ساڵی ١٩٩٠ز)**[1]

| وڵات | ساڵی ١٨٧٠ ز | ساڵی ١٩١٣ ز | رێژەی سەدی |
|---|---|---|---|
| فەرەنسا | ١٨٥٨ | ١٤٥٢ | ١,٤٥ |
| ئەڵمانیا | ١٩١٣ | ٣٨٣٣ | ١,٤٥ |
| یۆنان | – | ١٦٢١ | – |
| هیندستان | ٥٥٨ | ٦٦٣ | ٠,٤٠ |
| ئیتاڵیا | ١٤٦٧ | ٢٢٠٧ | ١,٢٥ |
| ڕووسیا | ١٠٢٣ | ١٤٨٨ | ٠,٨٨ |
| تورکیا | – | ٩٧٩ | – |
| شانشینی یەکگرتوو | ٣٢٦٣ | ٥٠٣٢ | ١,٠١ |
| ویلایەتـــــــــــە یـــــــەکگرتووەکانی ئەمریکا | ٢٤٥٧ | ٥٣٠٧ | ١,٨١ |

1. سەرچاوەکە: بڵاوکراوەکانی هەردوو ساڵی ١٨٧٠ ز و ١٩١٣ ز، لەم سەرچاوەیە وەرگرتووە:

- Maddison, Monitoring the World Economy 1820-1992, p. 23 and 194-206.

چـینی ناوەنـدی چـالاك و داهێنــەر کــە لــە ئــەنجامی ئــەو شۆڕشــەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) بەرپای کرد، دروست بـوون، بـە هـۆی گـرژی و تەنگـژەی بـەردەوام لـە بـواری دەسـتپێخەری و پێـشکەوتندا، خەریکبوو وردە وردە دەپووکانـەوە.[1] ڕزینـی ئـابووریی نیـشتمانییش بـوو بـە هـۆی وەسـتاندنی پێـشکەوتنی فیکـری و خنکانـدنی چـالاکیی داهێنەرانــە. هــەتاوەکو فیقهــیش _ لــەو کاتــەدا _ کــە پێداویــستییە یاسـاییەکانی بـۆ کۆمەڵگایـەك کـە بـەرەو گەشەسـەندن بـڕوات، دابـین دەکـــرد، تووشـــی وەســـتان هـــات و نەیـــدەتوانی پێداویـــستیی ڕووبەڕووبوونەوە نوێیەکان دابین بکات، لەگەڵ ئەوەی ئەم وەستانە، کە پێشتر باسمان کرد، لەوانەیە _ بۆ ماوەیـەکی دوورودرێـژ ـ لـە زۆرداری سوڵتانەکان و دەرەبەگەکان ڕزگاری کردبێت، لەبەرئەوەی هۆکارێك بوو بۆ بەرژەوەندییە تایبەتییەکانیان. بەم شێوەیە ئـەو بەرەوپێشـچوونەی پێشتر ڕووی دا، تووشی لەباربردن هات و بە بـێ بـوونی دەسـتەڵاتێکی سیاسیی بەتوانا کـە بتوانێـت دادوەری و مـافی موڵکایـەتی و فـەرمانی

---

[1]. بڕوانە:

-Issawi, Charles. "The Decline of Middle Eastern Trade, 1100-1850. ", p. 409.

-Cook, M. A. , (ed. ). Studies in the Economic History of the Middle East from the Rise of Islam to the Present Day. London: Oxford University Press, 1970, p. 308-12.

یاسا بەو شێوەیەی شەریعەت داوای دەکات، بچەسپێنێت، گەشـەپێدان زیـانی لێکـەوت، گـەلیش ناتوانێـت هـیچ دەستپێـشخەری و پرۆژەیـەك ئەنجام بدات.

جیهـانی ئیـسلامی ئــەو توانــای پێــشکەوتنەی لەدەســت دا کــە ئیمپراتۆرییەتی عوسمانی لە سەردەمی محەمەد فاتیحی دووەم (١٤٥١–١٤٨١ز) و سـلێمان قـانوونی (١٥٢٠–١٥٦٦ز) گەیاندیـە ئەوپەڕەکـەی. دیـارە کـە فتوحـات و کەشـخەیی ئـەو فەرمانڕەوایانـە لەسـەر حیـسابی گەشــەپێدان و پێــشکەوتن بــوو لــە ئاینــدەدا. ئــەو خوێنگــەرمی و سووربوونە، بوونە هۆی فتوحات و فراوانبوون و وایکرد کـە ژمارەیـەکی زۆری سـوپا لـە حاڵـەتی ئامادەباشـیدا بـن لـە ئـەوروپای ناوەڕاسـت و باکووری ئەفەریقیا و دەریای ئیجـە و قـوبرس و دەریـای سـوور و قـرم، لەگەڵ هێشتنەوەی هێزێکی دەریایی لە دەریای ناوەڕاست.

ئەوەی زیاتر قوڕەکەی خەستر کردەوە، ئەو دابەشبوونە بوو کـە لـە جیهــانی ئیــسلامیدا ڕووی دا، ســەفەوییەکان لایــەنگریی دوژمنــەکانی عوسمانییەکانیان دەکرد، شتێکی سروشتییـشە لـەم بارودۆخـەدا هێـزە ئەرێنەییــەکانی پەیوەســت بــە گەشــەپێدان دووچــاری بایــەخ پێنــەدان ببنەوە. بەم شێوەیە هێـزە نەرێنییـەکان زیـاتر بـەهێز دەبـوون، تـا لـە سەدەی نۆزدەیەمدا گەیشتنە ترۆپك، دوای گەمارۆیـەکی سـەرنەکەوتوو بۆ شاری ڤیەننا لـە سـاڵی (١٦٨٣ز) لـە سـەردەمی محەمـەدی چـوارەم (١٦٤٨–١٦٨٧ز). دوای ئــەوە ئــابووریی گونــد، بارگرانییــەکی زۆری

لەسەر بوو، نەیدەتوانی یارمەتیی سەرکەوتنە سەربازییەکان بدات، وێڕای پێشکەوتنی ئابووری و تەکنۆلۆژیی پێویست بۆ ڕووبەڕووبوونەوەی ئەو بەرهەڵستییەی لە ڕۆژئاواوە دەهات. عوسمانییەکان داهاتی تەواویان بۆ چاکترکردنی تەکنۆلۆژیای هێزە چەکدارەکانیان و کارە تەکنیکییەکانیان نەبوو، لە کاتێکدا ڕۆژئاوا لەم بوارەدا بە خێرایی دەڕۆیشت. بۆیە باجی ئەم پشتگوێخستنە، ڕوودانی چەند تێکشانێك بوو کە سەرەتا لە ڕووسیا و لەسەر ڕووباری دانوبەوە لە (١٧٧٠ز) دەستی پێکرد.

لە ئەنجامی ئەوەدا، ئیمپراتۆرییەت حاڵەتی خۆی وردە وردە گواستەوە بۆ حاڵەتی بەرگریکردن، بەرەکانی جەنگی لەبەردەم هەڕەشەی هێزە سەربازییە وشکانی و دەریاییە پێشکەوتووەکاندا بوون، بەرهەمە پیشەییەکانی دووچاری کێبڕکێیەکی توندی ڕۆژئاوا دەبوونەوە. وێڕای ئەمانەش، ئیمپراتۆرییەت زۆربەی هەرە زۆری دەستکەوتە هەرێمییەکانی لەدەست دەدا. بەم شێوەیە، هەموو داهاتە مرۆیی و مادییەکان کە بۆ فتوحات خەرجکرابوون، ئەو قوربانیدانانەی پێشکەش کران لەسەر حیسابی فێرکردنی گەل و خۆشگوزەرانیی هەموو بە فیڕۆ چوون. ئەم زیانە هەرێمییە تەنیا تیاچوونی سەرچاوەی داهات و دابەزینی توانای خەرجیی حکومەت بەبێ ئەژمار نەبوو، بەڵکو بوو بە هۆی وێرانکردنی تۆڕە ئابوورییەکان، کە کاریگەریی گەورەی کردە سەر

چالاکییە کشتوکاڵی و پیشەسازییەکان.[1] وێڕای هەوڵی جۆراوجۆر بۆ چاکسازی و چاککردنی بارودۆخەکە، بەڵام بارودۆخەکە ئەو باشییەی بەخۆوە نەبینی کە باشییەکی ئەوتۆ بێت، تورکیا لە دۆخی "شکۆمەندی"ییەوە بۆ دۆخی "پیاوە نەخۆشەکەی ئەوروپا" دابەزی. لەگەڵ دەستپێکردنی جەنگی جیهانیی یەکەم، تورکیا لە هەردوو لایەنی ئابووری و سەربازییەوە ماندوو و شەکەت بوو. ئەو بڕیارەشی کە لە نۆڤەمبەری ساڵی (١٩١٤ز) سەبارەت بە بەشداریکردنی لە جەنگ لەگەڵ هێزە سەرەکییەکاندا دای، تاجەگوڵینەی خستە سەر کارەساتەکە و ئەو دۆڕانەی تورکیا بوو بەهۆی دابەشکردنی ئیمپراتۆرییەت بۆ چەند پارچەیەك، وڵاتە سەرکەوتووەکانیش وەك دەستکەوتی جەنگ لەناو خۆیاندا دابەشیان کرد، ڕەنگە ئەمە لاوازترین خاڵ بێت لە مێژووی ئیسلامیدا. بەم شێوەیە ڕاستیی نموونەکەی ئیبن خەلدون بە شێوەیەکی بنەبڕ سەلما.

---

1 . Inalcik and Quataert (eds. ). An Economic and Social History of the Ottman Empire, P. 7.

# بەشی پێنجەم

## دارمان لە فێرکردن و زانست و تەکنۆلۆژیا

### یەکەم: گەشەسەندنی فێرکردن و زانست و تەکنۆلۆژیا

یەکێك لە هۆیە سەرەکییەکانی سەرکەوتنی ئیسلام لە سەدەکانی یەکەمدا، بۆ بەرزیی بەهای ڕەوشتی و کۆمەڵایەتی و ئابووریی مرۆڤەکان دەگەڕێتەوە، فێرکردنیش بە گرنگییەکی یەکلاکەرەوە دادەنرا بۆ بەدەستهێنانی ئەو مەبەستە. جێگەی سەرسوڕمانیش نییە کە یەکەم جار قورئان بە وەحی هاتە خوارەوە بۆ سەر پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) فەرمانی پێ کرد کە بخوێنێت: ﴿اقْرَأْ بِاسْمِ رَبِّكَ الَّذِي خَلَقَ (١) خَلَقَ الْإِنْسَانَ مِنْ عَلَقٍ (٢) اقْرَأْ وَرَبُّكَ الأَكْرَمُ (٣) الَّذِي عَلَّمَ بِالْقَلَمِ (٤) عَلَّمَ الْإِنْسَانَ مَا لَمْ يَعْلَمْ (٥)﴾ العلق/ ١–٥. ئەمە پێگەیەکی بەرز و بەنرخی بە خوێندنەوە و نوسین دا، لە پێناو ئەوەی مرۆڤ ئەگەر نازانێت، فێر ببێت. بۆیە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) پێگەیەکی بەرزی بە زانست لە تێڕوانینی بنیاتی ئیسلامییەوە بەخشیوە، کە زانستی لەسەر هەموو پیاو و ژنێکی موسڵمان فەرز کردووە، سەرکەوتنی هەر مرۆڤێکی

زاناشی بەسەر خواپەرستێکدا بە سەرکەوتنی ئەستێرەی مانگە بەسەر هەموو ئەستێرەکانی تردا شوبهاندووە.[1] لە ڕاستیدا ئەمەش کارێکی ئاساییە، لەبەر ئەوەی تەنیا لە ڕێگەی فێرکردنەوە دەتوانرێت بناغەیەکی گونجاو سەبارەت بە بەهای کۆمەڵگاکەیان بۆ خەڵکی دابنرێت و تواناکانیان پێش بخرێت، بۆ ئەوەی بتوانن بە ڕێگەی حەڵاڵ بژێویی خۆیان دەستبکەوێت و هاوکاریی تەواو لە جێبەجێکردنی مەبەستەکان (المقاصد)دا بکەن. ئەدەبیاتی فیقهی، گرنگییەکی زۆری بە فێرکردن داوە. محەمەد ئەبو زەهرە – یەکێکە لە زانا ئایینییە بەرزەکان – دەڵێت: "پێویستە کەسێك فێر بکرێت بە مەرجێك سەرچاوەی سوودلێوەرگرتن بێت، نەك سەرچاوەی ئازار بێت بۆ کۆمەڵگاکەی".[2]

پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) هەرچی لە توانایدا بوو بۆ بڵاوکردنەوەی فێرکردن دەیکرد، هەر هەلێکی بۆ ڕەخسابێت بە فیرۆی

---

[1]. دەقی هەردوو فەرموودەکە: "طلب العلم فريضة على كل مسلم ومسلمة" و "فضل العالم على العابد كفضل القمر على سائر النجوم" هەردووکیان ئیبن ماجە گێڕاونیەتییەوە، یەکەمیان لە ئەنەس کوڕی مالیکەوە و دووەمیشیان لە ئەبو دەرداوە وەرگیراون. بڕوانە:

– القزويني، سنن ابن ماجه، سەرچاوەی پێشوو، بەش١، ل٨١، فەرموودەی ژمارە ٢٢٣و٢٢٤.

ـ القرطبي، الحافظ أبوعمر عبد البر النميری. جامع بيان العلم وفضله، المدينة المنورة، المكتبة العلمية، (د. ت). بەش١، ل٣–٦٣.

– الغزالي، إحياء علوم الدين، سەرچاوەی پێشوو، بەش ١، ل٤–٨٤،

2. أبو زهرة، محمد. أصول الفقه، القاهرة، دار الفكر العربي، ١٩٥٧. ل٣٥٠

نەدەدا بۆ ئەم مەبەستە، لەناو ئەوانەشدا ئـازادکردنی دیلـەکانی جـەنگ بوو بەرانبـەر فێرکردنـی موسـڵمانان. خەلیفـەکانی ڕاشـیدینیش لەسـەر بەرنامەکەی پێغەمبەری خۆشەویست (درودی خوای لەسەر) دەڕۆیشتن، بۆیە پاڵپـشتێکی بـەرفراوانی کۆمەڵایـەتی و ڕۆشـنبیریی[1] لـە کۆمـەڵگا ئیـسلامییەکاندا هـەبوو. خێزانـە فـەرمانڕەواکان لـە سـەدەی یەکەمـدا کێبڕکێیـان لەسـەر پتـەوکردنی پلـە و شـوێنی فێرکـردن و لێکۆڵینـەوە دەکرد، چاودێریکردنی هەوڵەکانی کەرتی تایبەت کە ئاراستەکرابوون بۆ ئەم مەبەستە. هیچ بڵاوکراوەیەك لەبەردەستدا نییە بۆ دەرکەوتنی ئـەم پشتگیرییە بۆ فێرکردن لە پێناو بڵاوکردنەوەی خوێندنەوە و نووسیندا، بێجگە لە حاڵـەتی ئیـسپانیا نـەبێت، لـە سـەردەمی حەکـەمی دووەمـی (٣٦٦ك/٩٧٦ز کۆچی دوایـی کـردووە) خەلیفـەی دووەمـی ئومـەوی لـە ئیسپانیا و کوڕی عەبدولڕەحمانی سێیەم، کـە نزیکـەی هـەموو خـەڵکی خوێندنەوە و نووسینیان دەزانی، لە کاتێکدا لە بەشەکەی تری ئەوروپا کەمینەیەکی کەمی خوێندەوار هەبوون، ئەوانیش بە پلەی یەکەم پیاوە قەشەکان بوون.[2] هۆکارێکیش نییە وامان لێ بکات کـە بـاوەڕ نەکـەین ئــەم حاڵەتــە جیاکارییــەی فێرکــردن لــە ڕۆژهــەڵاتی ناوەڕاستیــشدا

---

1. Berkey, Jonathan. The Transmission of Knowledge in Medieval Cairo: A Social History of Islamic Education. Princeton, NJ: Princeton Univeristy Press, 1992, p. 3.

2. Nicholson, R. A. A Literary History of the Arabs. London: Cambridge Univeristy Press, 1st ed. , 1907, 1956, p. 419.

**نەبووبێت، چونکە فێربوون بە خۆڕایی بوو، هەمووانیش هاندەرێکیان هەبوو کە حەزیان لێ بێت بۆ ئەوەی بەلای کەمەوە فێری قورئان خوێندن ببن، بەڵام زانینی خوێندنەوە و نووسین و فێربوون بەس نییە، بەڵکو پێویستە بەدواداچوون بکرێت تاوەکو پێشکەوتن لە زانست و تەکنۆلۆژیاشدا ڕوو بدات، بۆیە ژمارەیەك ئەکادیمیای زانستی بە ناوی (دارالعلوم) و (دارالحکمة) و (بیت الحکمة) دامەزرێنران.[1] لەم ئەکادیمیایانە فێرکردنی هەموو (زانستە عەقڵییەکان) بە خۆڕایی بوو، وەك کشتوکاڵ و گەردووناسی و زانستی ڕووەك و کیمیا و لۆژیك و بیرکاری و پزیشکی و فەلسەفە و فیزیا و زیندەوەرزانی، لەگەڵ هەر یەکێك لەم ئەکادیمیایانەدا ڕوانگە (مرصد) و کتێبخانەیەکی دەوڵەمەند هەبوو، هۆڵێکی خوێندنەوە و نووسینگەیەك بۆ وەرگێڕان و شوێنێکیش بۆ کۆپیکردنی دەستنووسەکان هەبوو، هەروەها کۆڕیش لەبارەی هەموو بابەتە جۆراوجۆرەکانەوە دەگێڕدرا. پێشکەشکردنی کاغەز و مەرەکەب و پێنووسیش بە خۆڕایی بوو، سەرەڕای دابینکردنی مووچە و شوێنی حەوانەوە بۆ ئەوانەی تەنیا خەریکی خوێندن بوون و خەڵاتی ماددیی**

---

[1]. "بیت الحکمة": مەئمون (١٩٨– ٢١٨ك/ ٨١٣–٨٣٣ز) لە بەغدا دایمەزراند، بەڵام "دار الحکمة" سوڵتانی سەلجووقی عەزد ئەلدەولە (٣٦٧– ٣٧٢ك/ ٩٧٧–٩٨٣ز) لە بەغدا دایمەزراند. لە هەندێ شاری سەرەکیی ئیسپانیاش هەبوون، دەتوانین پێیان بڵێین وەك زانکۆکانی ئێستا وابوون، گرنگترینیشان لە قورتوبە و ئیشبیلیا و مالقا و غەرناتە بوون. هەروەها هەر لەو کاتانەدا لەو جۆرە دامەزراوانە لە شارەکانی تری جیهانی ئیسلامیدا بنیاتنران.

باشیش دەکران، خانووش بۆ زانایان دابین دەکرا. ئەم نەریتە لە سەدەکانی یەکەم لە جیهانی ئیسلامیدا سەبارەت بە خوێندنی بالاّ و چالاکیی فیکری، جێگەی سەرسوڕمانە.(١)

بەشێکی هاوکاری و یارمەتیی موسڵمانان لە زانیاری و لێکۆڵینەوە و تەکنۆلۆژیا، بەرهەمی ئەم ئەکادیمیایانە بوو، کە چ هاوکارییەك دەکرا و ئەو پشتگیرییەی دەستەبەری بۆ تێڕوانینی بنیاتی خودی ئیسلامی بۆ تێبینیکردن و تاقیکردنەوە و لێکۆڵینەوە کردبوو. بەم شێوەیە موسڵمانان توانییان سوود لەو هاوکارییە فیکرییەکانە وەربگرن کە شارستانیەتییەکانی: بێزەنتی و ساسانی و هیندی و چینی پێشکەشیان کردبوو، هەر خۆیان هاوکارییەکی دەوڵەمەند و داهێنەرانەیان لە بوارەکانی زانست وەك بیرکاری و فیزیا و کیمیا و گەردوون و زانستی ژیان و پزیشکی پێشکەش کرد. بەم شێوەیە ماوەیەکی درێژ کە نزیکەی چوار سەدەی خایاند پێشەنگ بوون لەو بوارانەدا، لە ناوەڕاستی سەدەی هەشتەمەوە تاوەکو نیوەی سەدەی دوازدەیەمی زایینی.

---

[1]. بڕوانە:

-Zurayk, C. K. " Jami ' a. The Encyclopedia of Islam, Leiden: Brill, 1992, Volume 2, p. 422-27.

-Berkey, The Transmission of Knowledge in Mediveval Cairo. . . , -Makdisi, The Rise of Colleges: Institutions of Learning in Islam and the West. . .

-Tibawi, A. L. " Muslim Education in the Golden Age of the Caliphate. " Islamic Culture, Hyderabad, 1954, p. 418-38.

هەتاوەكو دواى ئـەوەى دەستەڵاتیـشیان لەدەسـت دا، بـەلاى كەمـەوە ماوەى دوو سەدە بەردەوام هاوكاریی گەورەیان پێشكەش دەكرد.[1]

فێركـردن و گەشـەپێدان، لــە جیهـانى ئیـسلامیدا هاوشـانى یــەك دەڕۆیـشتن، هــەر وەك چـۆن لــە شـوێنەكانى تـریش پــەیڕەو دەكـرا. باشــتربوونى توانــا و لێهــاتوویی مرۆڤــەكان ســەرەڕاى پێــشكەوتنى تەكنۆلۆژیا، پاڵپشتبوون بۆ خێراكردنى گەشەپێدان، ئەمەش داهـاتێكى زۆرى بۆ حكومـەت و كۆمەڵـە خێرخوازییـەكان دەگەڕانـدەوە لـە پێنـاو دابینكردنى تێچوونى فێركردندا. لە ئەنجامى ئەمـەدا جیهـانى ئیـسلامى زیاتر لە ئابووریدا پێشكەوت، چونكە ئەو پێشەنگى پێشكەوتنى زانستى و تەكنۆلۆژى بوو.

## دووەم: وەستان و هۆیەكانى

ئەمە پرسیارێك سەبارەت بە هۆى كزبوونى چراى ڕۆحى عەقڵانییەت لـە ئیـسلامدا دێنێتـە كایـەوە، كـە بـوو بـە هـۆى وەسـتانى زانـست و تــەكنۆلۆژیا. لەوانەیــە وەڵامــى ئــەم پرســیارە ئاســان نــەبێت، ئەگــەر نەگەڕێینەوە بۆ مێژوو و شیكاریى هەموو جـۆرە بنیاتـە سـەرەكییەكان نـەكرێت كـە بوونـە هـۆى ئـەم كارەساتە. دیـارە سـێ هۆكـارى گـرنگ

---

1. e Sarton, Introduction to the History of Science, Volume I and Book I of volume 2. ; and Sezgin. 1983.

هەبوون کە ڕۆڵی سەرەکیی هاوبەشیان لەم داڕمانەدا هەبووە، ئەوانیش: کەمبوونەوەی پشتگیریی دارایی دەوڵەت، لاوازیی کەرتی تایبەت کە نەیتوانی هەموو بارگرانییەکە بگرێتە ئەستۆ و هێزی بیرمەندە عەقڵانییەکان بەکاربهێنێت بۆ سەپاندنی ئەو ڕایانەی لای خەڵکی پەسەند نین، سەرەڕای کاردانەوە نەرێنییەکانیش، کە بوونە هۆی دوورخستنەوەی بابەتە زانستییەکان لە قوتابخانە ئایینییەکاندا.

**أ ـ کەمبوونەوەی ئەو پشتگیرییە داراییەی دەوڵەت پێشکەشی دەکرد**

نەبوونی لێپرسینەوەی سیاسی، لەوانەیە هۆیەکی گرنگ بێت لە پاشەگەزبوونەوەی پشتگیریی دارایی دەوڵەت کە پێشتر بە دەستکراوەیی دەدرا، ئارەزووی کۆشکە پادشاییەکان لە ژیانی ڕابواردن و شادی کە پەیوەستە بە گەندەڵییەوە، زیادەڕۆیی لە خەرجیی هەڵمەتە سەربازییەکان، بوونە هۆی نەمانی داهاتی دەوڵەت و کەمبوونەوەی توانای دەستەبەرکردنی فێرکردن و زانست و تەکنۆلۆژیا و دامەزراندنی بنیاتێکی بنەڕەتی و گەشەپێدانی ئابووری. عوسمانییەکان بە شێوەیەکی گشتی پێیان وابوو گرنگییەکی کەم و پلە دوو بە فێرکردن و ئەو چالاکییانەی بنیاتی ئومەتی پێ دادەنرا، بدەن.[1] بۆیە بلێسەی داهێنانی ئیسلامی، بە هاتنی عوسمانییەکان بۆ

---

1 . roghi, " Crisis and Change. ", p. 542.

دەسـتەڵات لـە سـەرەتای سـەدەی هەشـتـەمی کۆچـی / چـواردەیەمی زایینی، لاوازبوو، لە سەدەکانی داهاتووشدا خامۆش بوو. لەوانەیە ئەمە یەکێك بێت لە هۆیە سەرەکییەکان کە بووە ڕێگر لەبەردەم ئەو جۆش و خرۆشەی پێشتر هەبوو لە پێناو گەشەپێدان بۆ شۆڕشێکی پیشەسازی.

**ب ـ لاوازیی کەرتی تایبەت و هەڵنەستانی بە ڕۆڵێکی کاریگەر**

"کەمبوونـەوەی" ڕۆڵـی دەوڵـەت، بـارگرانیی سـەرەکیی تایبـەت بـە فێرکردنـی خـستە ئەسـتۆی کـەرتی تایبەتـەوە. لـە سـەرەتادا کـەرتی تایبـەت ئـەم کـارە گرانـەیان لـە ڕێگـەی ئەوقافـەوە ئـەنجام دەدا، کـە دامەزرانـدنی بـۆ پـشتگیریکردنی قوتابخانـە و دامـەزراوەکانی تـری خوێندنی باڵا بوو، هەر چۆن تایبەت بوو بە دابینکردنـی خزمـەتگوزاریی گشتیی هەمەجۆر، لەناویاندا دروستکردنی مزگـەوت و چـاککردنەوەی و دابینکردنـی شـوێنی نیـشتەجێبوون بـۆ خوێنـدکار و گەشـتیار و دروسـتکردنی پـرد و بیرهەڵکەنـدن و ڕێگەلێـدان و دروسـتکردنی نەخۆشـخانە.[1] لـە سـەرەتای عوسمانییەکانـدا ئـەوقاف پـشتگیرییەکی گەورەی لێ دەکرا و سەرپەرشتیکردن و ڕێکخستنی لەژێر چاودێرییەکی فـەرمیی ورددا بـوو.[2] هـەروەها ئـەوقاف، حـانووت و بـازاڕی دروسـت

---

[1] . ee, for example, Makdisi, The Rise of Colleges: Institutions of Learning in Islam and the West, p. 35-74 ; and Hodgson, The Venture of Islam, Volume 2, p. 124.

[2] . Inalcik, Halil. " The Rise of the Ottomon Empire", p. 307.

دەكرد بۆ ئـەوەی ببێتـە سەرچـاوەیەك بـۆ داهـات، لـە پێنـاو چـالاكیی ئایینی و فێركردن و چالاكییە خێرخوازییەكانی تردا.[1]

لەگـەڵ ئەوەشـدا ئـەو هێـزەی خـاوەن مەزهەبـە عەقڵانییـەكان بـە یارمەتیی دەسـتەڵاتی سیاسـی، بـۆ سـەپاندنی بیروبـاوەڕە فەلـسەفییە ناپەسەندەكانیان بەسەر خەڵكیدا بەكاریان هێنا، كاردانەوەیەكی توندی دژی فەلسەفە دروست كرد. لەبەرئەوەی هەموو زانستە پراكتیكییـەكان لـەو ڕۆژەدا بـە فەلـسەفەوە بەسـترابوونەوە، نـەك تـەنیا لـە جیهـانی ئیسلامیدا، بەڵكو لە وڵاتانی تریش، دامەزراوە ئایینییەكانیش وازیان لە وتنەوەی وانەی فەلسەفە هێنا. ئەم كردارە – كـە هـیچ چـارەیەكی تـر نەبوو – گورزێكی كوشندە بوو بـۆ هـەموو زانـستە پراكتیكییـەكان كـە فەلسەفەیان دەگرتەخۆ. بۆیە ئەو فێركردنەی لە جیهانی ئیـسلامیدا لـە ڕێگـەی ئەوقافـەوە پـشتی بـە كـەرتی تایبـەت دەبەسـت و هاوكارییـە خێرخوازییـــەكانی تـــریش، تـــەنیا چـــالاكی ئایینییـــان ئـــەنجام دەدا، پشتبەست بەو بۆچوونە هەڵەیەی كە دەوترا فێربوونی زانست لـە ڕووی

---

1. Inalcik and Quataert (eds. ). An Economic and Social History of the Ottoman Empire, p. 79; Hodgson, The Venture of Islam ; Cizakca, Murat. A History of Philanthropic Faundations: The Islamic World from the seventh Century to the Present. Istanbul: Bogazici Univeristy Press, 2000; Behrens-Abouseif, Doris. " Waqf" In Encyclopedia of Islam. Leiden: Brill, 2002, Volume 11, p. 59-109 ; Kahf, Shari'ah and Historical Aspects of Zakah and Awqaf. ; and Ahmed, Role of Zakah and Awqaf in Poverty Alleviation.

پاداشت وەرگرتنەوە لای خوا، گرنگیی لە فێربوونی ئایینی کەمترە.(١)
ئەم بۆچوونەش هیچ بنەمایەکی ڕاستی نییە، پشتبەست بە مانای ئەو وتەیەی لە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر)ەوە هاتووە، کە هەر کارێکی مرۆیی یارمەتیی خەڵکانی تر بۆ بەدەستهێنانی پێویستییەك لە پێداویستییەکانی بدات، ئەو کارە چاکەیە و لە دوارۆژدا پاداشتی هەیە، بەبێ ڕەچاوکردنی ئەوەی ئەو پێویستییە ماددی یان ڕۆحی بێت.(٢)
بۆیە هاوبەشییەکان، هەتاوەکو لە بواری فێرکردن و لێکۆڵینەوەشدا، لە سەدەکانی یەکەمدا بە هۆکارێك بۆ پاداشت وەرگرتن لە دوارۆژدا دادەنرا. سەرەڕای ئەمەش، ئەم بۆچوونە هەڵەیە هەر بەردەوام بوو و زیاتریش چەسپا. هەروەها لە ئەنجامی دوورکەوتنەوەی زانا خواناسەکان لە کاروباری دەوڵەت و بارودۆخی کۆمەڵگا، پێویستی بەوە نەما خەڵکی بۆ فێربوونی زانست لە قوتابخانە ئایینییەکان هۆشیار بکرێتەوە و بنیاتی توانای شیکاری لای خوێندکاران دروست بکرێت. ئەم پرۆگرامە نارێکە تا ئەمڕۆش لە زۆربەی هەرە زۆری قوتابخانە ئایینییەکاندا هەر ماوە.

---

1 . Hofmann, Murad Wilfried. " Backwardness and the Rationality of the Muslim World. " Encounters, UK, March, 1996, p. 85.

2. پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) دەفەرموێت: "لا يغرسُ مسلمٌ غرساً ولا يزرعُ زرعاً فيأكُلُ مِنه إنسانٌ ولا دابة ولا طيرٌ إلا كانَت له صدقةً" (البخاري) كتاب الحرث والزراعة (باب فضل الزراعة والحرث)، مەبەست لەم فەرموودەیە ئەوەیە هەر کارێك مرۆڤ پێی هەستێت و پێویستیی نەك مرۆڤ، بەڵکو باڵندە و گیاندارەکانیش دابین بکات، ئەوە کاری چاکەیە و لە دوارۆژدا پاداشتی هەیە.

بڕی هاوبەشیکردنی کەرتی تایبەت ئەوەندە زۆر نەبوو، هەتاوەکو لە فێرکردنـی ئایینیـشدا لەگـەڵ پێداویـستییەکاندا هاوتـا بێـت. پاشـان زۆربوونی بەردەوامی ژمارەی موسڵمانان، وا دەگەیەنێت کە پێویـستیی بە هەڵمەتێکی بەرفراوانی زیاتر بۆ هۆشـیارکردنەوەی خـەڵکی لـەبارەی بەها کۆمەڵایەتییەکانەوە دەبێت. لەگەڵ ئەوەی ئەو کێشە ئابوورییانەی ڕووبـەڕووی کـەرتی تایبـەت دەبوونـەوە، هـەروەها نـەبوونی هاوکـاریی دەوڵەت و خراپ بەکارهێنانی چاودێریی داهاتی ئەوقاف کە بەرژوەنـدی خەڵکی تێدایە[1]، نەیدەهێشت داهاتەکـە بـۆ ئـەم مەبەسـتە زۆر ببێـت، کەرتی تایبەتیش نەیدەتوانی دارایی تەواو بۆ بڵاوکردنەوەی خوێندنەوە و نووسین لەناو خەڵکیدا دابین بکات، بێجگـە لـەوەی کـە دروسـتکردنی زانکۆ و مەڵبەندی لێکۆڵینەوەکان، کە بۆ جیهانی ئیسلامی پێویستیەکی هەنووکـەیی بـوون. بۆیـە پـەروەردەی ڕەوشـت و فێرکردنـی زانـستی قەتیس ما، مەشخەڵی ڕەوشتیش کە پێغەمبـەر (درودی خـوای لەسـەر) دایگیرساندبوو، بێ هێز بوو. هەروەها نوێبوونەوەی تەکنۆلۆژیاش کە بۆ پارێزگاریکردن لە سەرکەوتنی موسڵمانان پێویست بوو، لاواز بوو. بۆیـە

---

1 . McGowan, Bruce. "The Age of the Ayans. " In Halil Inalcik and Dovald Quataert (eds. ), An Economic and Social History of the Ottoman Empire, 1300-1914. Cambridge, Uk: Cambridge University Press, 1994, p. 712; and Cizakca, A History of Philanthropic Foundations. . .

جیهـانی ئیـسلامی لـه بوارەکـانی ڕەوشـت و تـەکنۆلۆژیادا وەك یـەك دووچاری داڕمان بوو.

لـەو ماوەیـەدا جیهـانی ڕۆژئـاوا پرۆسـەی بـەکاراکردنی دیمـوکراتی وەبـەردەهێنا، بـۆ فەراهـەمکردنی داهـاتی گـشتی لـە پێنـاو خـودی گەشـەپێداندا. گەشـەپێدانیش لـە میانـەی خۆیـەوە بـوو بـە هانـدرەێك داخوازیی فێرکردن زۆر بێت. لە کاتێکدا ژمارەی دانیـشتووانی ویلایەتـە یەکگرتووەکان لە نێوان سـاڵانی ١٨٤٠–١٩٧٠ز دوازدە ئەوەنـدە زیـادی کرد، ژمارەی ئەو کەسانەی پەیوەندییان بە زانکۆکانەوە کرد ٤١٧ جـار زیادی کرد.[1] هاوکارییەکانی حکومەت، سەرەڕای دەستپێشخەرییەکانی کەرتی تایبەت، بوونە هۆی پێـشکەوتنێك کـە پێـشتر وێنـەی لـە بـواری زانـست و تـەکنۆلۆژیادا نـەبوو، ئەمـەش هانـدەرێکی زیـاتر بـوو بـۆ گەشـەپێدان و درزێکـی گـەورەی لـە نێـوان هـەردوو جیهـانی ڕۆژئـاوا و ئیـسلامیدا دروسـت کـرد. بـەم شـێوەیە دیموکراتییـەت و فێرکـردن و گەشەپێدان، لە جیهانی ڕۆژئاوادا پشتگیریی یەکتریان دەکرد. کاتێکیش ڕووبەڕووبوونەوە لە نێوان هەردوو جیهانەکەدا دروسـت بـوو: ڕۆژئـاوا و ئیسلامی، موسڵمانەکان هیچ هەلێکی پێـشکەوتنیان نـەبوو کـە شـایانی باسکردن بێت، بە هۆی نـەبوونی فێرکـردن و تـەکنۆلۆژیای سـەربازی و پیشەسازی، کە لای موسڵمانەکان کاتیان بەسەرچووبوو.

---

1 . conomist, The. The Know ledge Factory: A Surveyof Universities. 4 October, 1977, p. 4.

## سێیەم: بەکارهێنانی هێز لەلایەن بیرمەندە عەقڵانییەکانەوە

### أ ـ ململانێ لە نێوان عەقڵانییەکان و تەقلیدییەکاندا

ئەو هۆکارەی زۆرترین زیانی بە گەشەسەندنی زانست و تـەکنۆلۆژیا لە جیهانی ئیسلامیدا گەیاند، ئەو ململانێیە بوو لە نێـوان عەقڵانییـەکان و تەقلیدییەکاندا سـەری هەڵـدا، لـە ئـەنجامی بـەکارهێنانی دەسـتەڵاتە زۆردارەکەی دەوڵـەت لەلایـەن عەقڵانییەکانـەوە بـۆ سـەپاندنی هەنـدێ بیروڕا کە لە لای خەڵکی قبوڵ نەدەکران. بزووتنـەوەی عەقڵانییـەت لـە جیهانی ئیسلامیدا، لە سەدەی دووەمی کۆچی / هەشـتەمی زایینییـەوە دروست بوو، پێش چەند سەدەیەك لە دروستبوونی لە ڕۆژئاوا. ئەمە بوو بـە واقیعێکـی ناچـاری، لـە ئـەنجامی خێـرا بڵاوبوونـەوەی ئیـسلام لـەو وڵاتانەدا کە پێشتر لەژێر دەستەڵاتی ساسانی و بێزەنتینییەکاندا بوون، کە دوو شارستانییەت بوون، لە ڕووی مادییەوە زۆر پێشکەوتوو بـوون، هەروەها لە ڕووی فیکرییەوە زۆر گەشەیان سەندبوو. بەبێ ئەوەی پشت بـە نزیکخـستنەوەیەکی عـەقڵانی ببەسـترێت، کـارێکی گرانـە ئەوانـەی باوەڕیان بە ئیسلام هێناوە لە ڕێ لابدرێن، کە لە لایەنی فیکرییەوە زۆر پێشکەوتوون، هـەتاوەکو خـەڵکیان لـە کاریگـەریی نـەرێنیی گومڕاکـان (زندیق) ڕزگار کردووە.

لەگـەڵ ئەوەشـدا عەقڵانییـەکان لـەوە زیاتریـان کـرد، هـەوڵیان دا پەیوەندیی نێوان ئەنجام و هۆ لە نێوان هەموو جۆرە دیاردەکانی ژیانی

مرۆیی و چواردەورەکەیاندا دیاری بکەن، مەبەستیشان ئەوەبوو ئەوە ڕوونبکەنەوە کە هەڵسوکەوتی خوا هەر لەخۆوە نییە، بەڵکو ڕێکخراو و بەرنامەداڕێژە، هەڵسوکەوتیشی پاڵپشتە بە هەندێ بیروباوەڕ کە مرۆڤ ناتوانێت پەییان پێ بەرێت. بۆیە هەوڵیان دەدا بنەمایەکی نەگۆڕ بۆ زانست لە چوارچێوەیەکی ئایینیدا دابنێن، ئەم دوو مەبەستەش هەردووکیان بۆ (دەستەبەرکردنی بەرگرییەکی عەقڵانی لە ڕێنماییەکانی ئیسلام و هەوڵدان بۆ تێگەیشتن لە چۆنیەتی هەڵسوکەوتی خوا لە سروشتدا بوو) کە هەردووکیان بە تەواوەتی لەگەڵ ڕۆحی ئیسلامدا بگونجێن، کە داوا لە مرۆڤەکان دەکات بیریان بۆ تێگەیشتن لە نهێنیەکانی گەردوون بەکاربهێنن ﴿إِنَّ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ وَاخْتِلَافِ اللَّيْلِ وَالنَّهَارِ لَآيَاتٍ لِأُولِي الأَلْبَابِ (١٩٠) الَّذِينَ يَذْكُرُونَ اللَّهَ قِيَامًا وَقُعُودًا وَعَلَى جُنُوبِهِمْ وَيَتَفَكَّرُونَ فِي خَلْقِ السَّمَاوَاتِ وَالأَرْضِ رَبَّنَا مَا خَلَقْتَ هَذَا بَاطِلًا سُبْحَانَكَ فَقِنَا عَذَابَ النَّارِ (١٩١)﴾ آل عمران / ١٩٠–١٩١.

ئایا ئەو عەقڵانییانە کێن؟ ئەو زانایانەن کە لە هەموو جۆرە پێشینە فیکرییەکانن و دەتوانرێت بکرێن بە دوو گروپ: پیاوانی موعتەزیلە (المعتزلة) و فەیلەسوفەکان، هیچ بەڵگەیەکی مێژوویش نییە کە دژی ئیسلام بوو بن.

موعتەزیلەکان[1] لە بنەڕەتدا زانای ئایینین نەك فەیلەسوف، ویستیان بەڵگەی عەقڵانی بۆ بیروباوەڕە ئایینییەکان پێشکەش بکەن، ئەمەش لە پێناو چاندن و چەسپاندنی ئیمان لای لە خەڵکی، کارێکی پێویست بوو،

---

[1]. وشەی (اعتزال) واتە گەڕانەوە یاخود جیابوونەوە یان جیاکردنەوە، وشەی (معتزلة) بۆ ئەو بزووتنەوەیە بەکاردێت کە لایەنگرانی لە بیروباوەڕە پەرگیرییەکانی خەواریجەکان و مورجیئەکان سەبارەت موسڵمانی گومرا و لەڕێ لادەر خۆیان جیاکردەوە. بڕوانە:

- أبو زهرة، محمد، تاريخ المذاهب الأسلامية، القاهرة، دار الفكر العربي، ١٩٥٧د. ت،بەرگ١. ل١٥٦-١٥٧.

-Valiuddin, Mir. "Mu'tazilism. " In M. M. Sharif (ed. ), A History of Muslim Philosophy. Wiesbaden, Otto: Harrasowitz, 1963, Volume 1, p. 199-200. .

بزووتنەوەکە بە سەرۆکایەتیی واصلی کوڕی عطا (١٣١ك/ ٧٤٦ز کۆچی دوایی کردووە) دەستی پێ کرد، پاشان ژمارەیەکی تێگەیشتوو لە لێکۆڵینەوەدا چوونە ڕیزیەوە، بۆ نموونە أبو الهذیل (٢٢٦ك/ ٨٤١ز کۆچی دوایی کردووە) و جەعفەری کوڕی بیشر (٢٢٦ك/ ٨٤١ز کۆچی دوایی کردووە) والنظام (٢٣١ك/ ٨٤٥ز کۆچی دوایی کردووە) و الجاحظ (٢٥٥ك/ ٨٦٩ز کۆچی دوایی کردووە) و الجبّاعی (٢٩٥ك/ ٩٠٨ز کۆچی دوایی کردووە) و عبد الجبار(٤١٥ك/ ١٠٢٤ز کۆچی دوایی کردووە). لەگەڵ ئەوەی بزووتنەوەکە بۆ ماوەی پێنج سەدە بەردەوام بوو، ماوە کلاسیکییەکەی دوو سەدەی خایاند، لە چارەکی کۆتایی سەدەی سێی کۆچی/ نۆی زایینی، تاوەکو ناوەڕاستی سەدەی پێنجەمی کۆچی/ یازدەی زایینی. بۆ زانینی زیاتر دەربارەی هەندێ لە بیروڕاکانیان، بڕوانە:

- الشهرستاني، أبو الفتح محمد بن عبدالكريم. الملل والنحل، تحقيق: محمد سيد كيلاني، القاهرة، مصطفى البابي الحلبي، ١٩٦١. بەرگ١. ل٤٣-٩١.

البغدادی، عبدالقاهر بن طاهر. الفرق بين الفرق، بيروت، دار الكتب العلمية، د. ت، ل ٧٨ -١٥٠. هەروەها بڕوانە:

Valiuddin, "Mu'tazila", 204-218.
-Gimaret, D. "Mu'tazila" In The Encyclopedia of Islam, Leiden: Brill, new ed. , 1993, Volume 7, p. 783-793.
-Gardet, L. "IIm al-kalam. " The Encyclopedia of Islam, Leiden: Brill, new ed. , 1971, Volume 3, p. 1141-50.

**تاوەکو ئیمان بەهێزتر بێت ئەو کەسە لـە بیروباوەڕیدا نـەگۆڕ دەبێـت، هاندەرێکیشی دەبێت بۆ ڕەفتـاری بـە پێـی ڕێنماییـەکانی ئیـسلام. بـە پێچەوانەی ئەمەشەوە، تەقلیدییە پەڕگیرەکان (متطرف) باوەڕیان بەوە نـەبوو کـە بەڵگـەی عـەقڵانی بهێننـەوە، بـەڵکو دەیانویـست خـەڵکی بیروباوەڕەکان لەسەر بنەمای ئیمانی کوێرانە قبووڵ بکەن.**

**بۆ ئەوەی موعتەزیلەکان بە ئەرکەکانیان هەستن، ڕاهێنانیان لەسـەر فەلسەفە و لۆژیك و زانست و پرۆگرامی زانستی دەکرد، بەرنامەیـەکیان داهێنـا بـۆ بیرکردنـەوەی لـۆژیکی، ناویـان نـا "زانـستی ئاخـاوتن"[(١)]، ئەوانەشی ئەم ڕێبازەیان جێبـەجێ کـرد، پێیـان دەوتـن "ئـاخێوەران" مانای پیشەییشیان "بیرمەندان و عەقڵانییەکان" بـوو. ئـەم ڕێبـازە لای موسـڵمانەکان شـتێکی نـوێ بـوو، هــەر وەك گاردێــت (Gardet) لەوبارەیەوە دەڵێت: "بێگومان ئەمە گونجاندێکی عەرەبی نییـە لەگـەڵ**

---

[1]. فارابی لە کتێبەکەیدا "احصاء العلوم" پێناسەی "زانستی ئاخاوتن" دەکات و دەڵێت: " زانستێکە وا لـە کەسـێك بکـات سـەرکەوتنی بیروباوەڕەکـان و ئـەو کـار و فرمانانـەی شـەریعەت داینـاوە، یـاخود سەرچاوەکەی خواییە، دابین بکات. لۆژیکییانە هەموو ئەو بیروباوەڕانـە پووچـەڵ بکاتـەوە کـە دژیانـە". ئەیـجییش لە کتێبی "کتاب المواقف فى علم الکلام" پێناسەی دەکـات و دەڵێـت: "زانـستێکە گرنگـی بـە پتـەوکردنی بیروباوەڕەکـان دەدات، لـە میانـەی پێـشکەشکردنی بەڵگـە و ولابردنـی گومـان". (هـەردوو پێناسـەکە لەگـەڵ کـەمێك گۆڕانکـاری لـە وەرگێڕانەکەیانـدا لـە Gardet, "Ilm al-Kalam. ", ١١٤٢p وەرگیراوە). لە نێوان ئەم دووانەدا، غەزالی مەبەست لە "زانستی ئاخاوتن"ی دیـاری کـردووە کە دەڵێت: "بۆ پاریزگاریکردنە لە ئایینی ئیسلام و بەرگرتن لە گومانی بێ باوەڕان" بڕوانە:

– الغزالي، ابوحامد. المنقذ من الضلال، (وبذيله ثلاثة كتب للغزالي: كيمياء الـسعادة، والقواعـد العـشرة، والأدب في الدين)، تحقيق: محمد جابر، بيروت، مكتبة الثقافة، ١٩٥٣ م. ل ١٤.

لاهوتی مازوکی یان مەسیحی".[1] لە لایەنی کرۆکەوە، هیچ جیاوازییەکی ئەوتۆ لە نێوان ئاخێوەران و لایەنگرانی موعتەزیلەدا نەبوو، هەردوو زاراوەکەش زۆر جار لەبری یەکتر وەك یەك بەکار دەهێنران، سەرنجی زانایانی لە هەموو جۆرە ڕەنگەکانی ئیسلامی بۆ خۆی ڕاکێشابوو. لە کاتێکدا هەندێکیان وەك جەعفەری کوڕی بیشر (٢٢٦ك/ ٨٤١ز کۆچی دوایی کردووە)، ئەبو موسا موردار (٢٢٦ك/ ٨٤١ز کۆچی دوایی کردووە)، ناوبانگیان بە خواپەرستی دەرکردبوو، ئەوانی تریش بە ئاسانکار لە جێبەجێکردنی ڕێنماییە ئایینییەکاندا ناسرابوون.[2]

فەیلەسوفەکان، ئەوانەی کاریگەریی فەلسەفەی یۆنانییان بەسەرەوە بوو، بە پلەی یەکەم بیرمەندەکان بوون نەك زانایانی ئایینی.[3] لەبەر ئەوەی فەلسەفە و زانست دوو لقن لە لقەکانی زانیاری و پەیوەندییەکی بەهێز لە نێوانیاندا هەبوو، زۆربەی هەرە زۆری فەیلەسوفەکان ناسراو و جێی باوەڕ بوون، لە زانستی وەك: بیرکاری و فیزیا و کیمیا و گەردووناسی و پزیشکی. هەروەها لەو ڕۆژانەدا بە گوێرەی خۆیان

1. Gardet, "Ilm al-Kalam. ", p. 1142.

2. أبو زهرة، تاريخ المذاهب الاسلامية، بەرگ١، ل ١٦٢–١٦٣. هەروەها بڕوانە:

– الغزالي، ابوحامد. تهافت الفلاسفة، تحقيق: جرار جهامي، بيروت، دار الفكر اللبناني، ١٩٩٣ م، ل٢٦.

3. ديارة الكندي (٢٥٢ك/٨٦٦ز کۆچی دوایی کردووە) یەکەم فەیلەسوفی ئیسلامە، دوای ئەویش ژمارەیەك ناوی درەوشاوەی تر دێن وەك (ابوبكر الرازی) (٣١٣ك/٩٢٥ز کۆچی دوایی کردووە)، الفارابی (٣٣٩ك/٩٥٠ز کۆچی دوایی کردووە)، ابن سينا (٤٢٨ك/١٠٣٧ز کۆچی دوایی کردووە)، ابن باجە (٥٣٣ك/١١٣٩ز کۆچی دوایی کردووە)، ابن الطفيل (٥٨١ك/١١٨٥ز کۆچی دوایی کردووە)، ابن رشد (٥٩٥ك/١١٩٨ز کۆچی دوایی کردووە). . .

هاوشانی زانا موسڵمانەکان تاقیکردنەوەیان ئەنجام دەدا. بە شێوەیەکی گشتی لەلایەن حکومەتەوە هاوکاری دەکران و هاوبەشیی گەورەیان لە پێشخستنی ئەو زانستانەدا کردووە. سەرەڕای ئەوەش — لەبەرئەوەی زانیاری لەو ڕۆژانەدا بۆ چەند لقێکی جیاواز دابەش نەبووبوو — کارامەش بوون لە زانستە ئایینییەکاندا، هەندێکیشیان، وەك ئیبن ڕوشد، لەو ڕووەوە بە سەرچاوە دادەنران. لە کاتێکدا لەو پەڕگیرانەی لەناویاندا بوون، وەك ئیبن ڕاوەندی (٢٥٠ك/ ٨٦٤ز کۆچی دوایی کردووە) و ئەبوبەکری ڕازی (٣١٣ك/ ٩٢٥ز کۆچی دوایی کردووە)، هەندێ بیروباوەڕی وایان هەبوو پێچەوانەبوون لەگەڵ هەندێ بیروباوەڕی بنەڕەتی ئیسلامدا. لەوانیش: کیندی (٢٥٢ك/ ٨٦٦ز کۆچی دوایی کردووە)، فارابی (٣٣٩ك/٩٥٠ز کۆچی دوایی کردووە)، ئیبن سینا(٤٢٨ك/١٠٣٧ز کۆچی دوایی کردووە)، ئیبن ڕوشد (٥٩٥ك/١١٩٨ز کۆچی دوایی کردووە) تاوەکو ڕادەیەك مامناوەند بوون. هیچ جیاوازییەکیان لە نێوان عەقڵ و وەحییدا نەدەبینی، بەڵکو هەوڵیان دەدا گونجاندن لە نێوان هەردووکیاندا دەربخەن و گفتوگۆیەکی عەقڵانییان بۆ پشتگیریکردن لە وەحی و پێغەمبەرایەتی و ژیان دوای مردن و ئەو جۆرە بیروباوەڕ و ڕاهێنانە ئایینییانە دەکرد. بۆ پشتگیریی بیر و بۆچوونەکانیان بە زۆری قورئان و سوننەتیان بە بەڵگە دەهێنایەوە.

## ب ـ سروشتی گفتوگۆ

گفتوگـۆی ئـازاد و عـەقلانی بـۆ بیروبـاوەڕ و کاروبـارە ئایینییـەکان، مشتومڕێکی قـوولْ و زۆری لـە ژمارەیـەك پرسـی زانیاریـدا لێکەوتـەوە، لەوانـە: سروشـتی خـوا چـۆنە؟ ئایـا جەسـتە و چـاو و گـوێ و هـەردوو دەست و قاچی هەیە؟ ئەگەر وا نییە، ئەی چۆن دەبینێ و دەبیـستێ و شت دەگرێ و دەجوولێت؟ ئایا مرۆڤـ دەتوانـێ ببیبنێـت؟ سـیفاتەکانی چییە؟ ئایا ئەو سیفاتانە بەشێکن لە ئەو و لێی جیا نابنەوە، یاخود بـە دەرە لـــەو؟ ئایـــا عـــەقلْ دەتوانـــێ سیفاتەکانیـــشی بزانێـــت، یـــاخود زانیارییەکە هەمووی پشت بە وەحی دەبەستێت؟ ئایا هەموو شتێك کـە لە ئاینـدەدا ڕوو دەدات دەزانێـت، هـەتاوەکو ئـەو شـتانەی خـەڵکی لـە داهاتووشدا دەیانکەن؟ ئەگەر خوا نەمرە، ئایا دروستبوونیشی نـەمرە؟ ئەگەر دروستبوونی نەمر نییە، ئایا کاتێك هەبووە کە دروسـتکەر نـەبوو بێت؟ ئایا ئەمانە عەقلْ دەیانبڕێت؟

تا چ ئاستێك مرۆڤـ خۆکردە (مخير) یان بەڕێوەبراوە (مسير)؟ ئەگەر ژیانیان پێشوەخت دیاریکراوە، ئایا دادپەروەرییە خـوا لێپرسـینەوەیان لەسەر کارەکانیان لێ بکات و پاداشتیان بداتەوە یاخود سزایان بدات؟

ئایا تەنیا باوەڕهێنان کۆتایە بۆ خاوەن ئیمان؟ یان پێویستی بە کار و کردەوە بۆ بەهێزکردنی نییە؟ ئایا موسڵمانی تاوانبـار خـاوەن ئیمانـە یاخود کافرە یان لەڕێلادەرە؟

**ئایا زیندووکردنەوەی مرۆڤەکان لە دواڕۆژدا تەنیا بە ڕۆحە یان بە جەستەشە؟ ئەگەر زیندووبوونەوە هەبێت لە جەستەدا، ئایا جەستەکە هەر وەك خۆیەتی، وەك ئەم دونیایە یاخود جیاوازە؟ ئەگەر قورئان بەشێکە لە ئاخاوتنی خوا، ئایا بە دروستکراو دادەنرێت و دەگوزەرێت هەر وەك جیهان، یان دروستکراو نییە و هەمیشەییە وەك سیفاتە خواوەندییەکانی دی؟**

**تا چەند مرۆڤ دەتوانێت بە هۆی عەقڵەوە ڕاست و درۆ جیابکاتەوە، تا چ ئاستێك وەحی بۆ ئەم مەبەستە پێویستە؟ ئایا دەشێت خوایەکی دادپەروەر مرۆڤەکان بە بەرپرس دابنێت بەرانبەر کردارەکانیان، بێ ئەوەی توانایەکی ئەوتۆیان تێدا دروست بکرێت ڕاست و درۆ جیابکەنەوە؟**

**دیارە هیچ کام لەم پرسیارانە، پەیوەندییان بە زانستەوە نییە، وەڵامەکانیش بێگومان بە مەزەندەیە و ورد نییە، بۆیە ناتوانرێت یەك وەڵام بدرێتەوە، چونکە بیروبۆچوونەکان جیاوازن، نە عەقڵانییەکان و نە تەقلیدییەکانیش هاوڕاییەك پێکناهێنن.(1) تەوەری گفتوگۆکە ئەوەیە، تا چەند عەقڵ و لۆژیك دەتوانن یارمەتیدەر بن بۆ وەڵامدانەوەی ئەم پرسیارە مەعریفییانە. بەڵام میانڕەوەکان لە نێوان عەقڵانییەکان و تەقلیدییەکان، کە زۆرینەیان پێکدەهێنا، هەستیان**

---

[1]. بۆ زانیاریی زیاتر سەبارەت جیاوازیی بیروڕاکان لە نێوان عەقڵانییەکاندا، بڕوانە:

ـ الشهرستاني، الملل والنحل، بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو، بەرگ١. ل٤٠-١١٣و١٩٨-٢٠٧.

بەوە کردبوو بە پلەی جیاواز پێوستی بە عەقڵ و وەحی وەکو یەك هەیە، بەڵام پەڕگیرەکان لە هەردوو لا سەرکەوتووتر بوون لە سەرنج ڕاکێشانی زیاتر، هەر ئەوانیش دیارگەی گفتوگۆیان دیاری کرد.

عەقڵانییە میانڕەوەکان کە زیاتر پێداگرییان لەسەر ئەوە دەکرد پشت بە عەقڵ ببەسترێت، کۆمەڵەیەك لە "پێنج بنەماکەیان" دانا بۆ یارمەتیدانیان لە گفتوگۆدا سەبارەت بە هەڵوێستیان بە شێوەیەکی کاریگەرتر. دووان لەو بنەمایانە بریتین لە یەکتاپەرستی و دادپەروەریی خوایی، کە هەردووکیان هەموو موسڵمانان بێ دوودڵی قبووڵیان کردوون.[1] پشتبەستن بە بیروباوەڕە بەڵگەنەویستەکان، ئەگەر کۆدەنگیی لەسەر نەبێت سوودی نییە، لەگەڵ ئەوەشدا بۆچوونی جیاواز لەو هەڵێنجانانەی لە بەڵگەنەویستەکانەوە دەرهێنرابوون، دروست بوو.

سەبارەت بە یەکتاپەرستی – کە باوەڕی سەرەکیی یەکەمە لەناو هەموو پەرستشەکاندا و ئاماژە بە یەك خوایی ڕەها و تاکیشی دەکاتەوە بە ڕەهایی – دەبینین کە هەڵوێستی گشتیی موسڵمانان ئەوەیە کە مرۆڤ ناتوانێت بە تەواوەتی هەستی پێ بکات، بەهۆی

---

[1]. سێ بەڵگە نەویستەکەی تر بریتین لە:

- بەڵێن و ئاگادارکردنەوە، هەردووکیان پێویستن؟
- تاوانبار نە خاوەن ئیمانە و نە کافرە، بەڵکو لە پلەیەکدایە لە نێوان ئەو دوو پلەیەدا کە ئەویش گومڕاییە (فاسق).
- فەرمانکردن بە چاکە و ڕێگرتن لە خراپە ئەرکی هەموو موسڵمانێکە. بڕوانە:

ـ الشهرستاني، الملل والنحل، بڕوانە: سەرچاوەی پێشوو بەرگ١، ل٤١.

سـنووردارییی توانـا و درکپێکردنــی. قورئـان خـۆی ئەمـە بـە ئاشـکرا ڕووندەکاتـەوە و دەفـەرموێت: ﴿لَـيْسَ كَمِثْلِـهِ شَـيْءٌ﴾ الـشوری/١١ [١].
هەروەها ﴿لَا تُدْرِكُـهُ الأَبْـصَارُ﴾ الانعـام/١٠٣، بۆيـە هەڵوێـستی گـشتیی موسڵمانان و پابەندبوونیش بەم کارە، قایل بوونیـان بـوو بـەو ڕاسـتییە میتافیزیکییانــە کــە ســنووری عــەقڵ و دەرکپێکردنــی هەســتەکان تێدەپـەڕێنن. سـەرەڕای ئەمـەش ئـەوان هـەوڵیان نـەداوە بـچنە بـنج و بناوانی زیاد لە پێویست، چونکە کارەکە سـوودی نییـە، خـوای گـەورە دەفەرموێت: ﴿هُوَ الَّذِي أَنْـزَلَ عَلَيْـكَ الْكِتَـابَ مِنْـهُ آيَـاتٌ مُحْكَمَـاتٌ هُـنَّ أُمُّ الْكِتَابِ وَأُخَرُ مُتَشَابِهَاتٌ فَأَمَّا الَّذِينَ فِي قُلُوبِهِمْ زَيْغٌ فَيَتَّبِعُونَ مَا تَشَابَهَ مِنْهُ ابْتِغَاءَ الْفِتْنَةِ وَابْتِغَاءَ تَأْوِيلِهِ وَمَا يَعْلَمُ تَأْوِيلَهُ إِلَّا اللَّهُ وَالرَّاسِـخُونَ فِـي الْعِلْـمِ يَقُولُونَ آمَنَّا بِهِ كُلٌّ مِنْ عِنْدِ رَبِّنَا وَمَا يَذَّكَّرُ إِلَّا أُولُو الأَلْبَابِ﴾ ال عمران/ ٧، لەگەڵ ئەوەشدا دەتوانرێت بوونی خوا لە ڕێگەی تێبینی و بیرکردنەوەی لۆژیکییانەوە بسەلمێنرێت، لێتێگەیشتنی تەواوەتی بـۆ چـۆنیەتییەکەی نییـە، مەگـەر لـە ڕێگـەی سـیفاتەکانییەوە کـە لـە قورئـان و سـوننەتدا باسکراون. بەڵام عەقڵانییە پەڕگیرەکان پێداگرییان لەسەر ئەوە دەکـرد کە عەقڵ تەنیا خۆی دەتوانێت وا لـە مرۆڤــ بکـات زانیـاری دەربـارەی سروشتەکەی هەبێت. ئەو شێوازەیان وای لێکردن کە بچنە نـاو چـەندان

---

[1]. هەتاوەکو پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) لە فەرموودەیەکی بەناوبانگ و بڵاودا دانی بەوەدا ناوە کە دەڵێت: "لا أحصي ثناء عليك، أنت كما أثنيت على نفسك". ـ القشيري، صحيح مـسلم، سەرچـاوەی پێشوو بەرگ١. ، ل٣٥٢ فەرموودەی ژمارە ٤٨٦.

گفتوگۆی نەزۆکەوە، کە دەبێتە هۆی دابەشبوون لـە ژمارەیـەك بابـەتی میتـافیزیکیی وەك: سـیفاتە خواییـەکان، زیندووبوونـەوە و ژیـانی دوای مردن، فریـشتەکان و وەحـی و پێغەمبەرایـەتی، هەمیـشەیی گـەردوون، دروستکردنی قورئان، ناسینی خوا بە دووروودرێژی، توانای مرۆڤەکان بۆ بینینی خوا لە دوارۆژدا. ئەم عەقڵانییـە پەڕگیرانـە چـەند هەڵوێـستێکی توندیان وەرگرت، کە بە ڕوونی لەگەڵ قورئان و سوننەتدا نەدەگونجان، تا ڕادەیەك کە هەتاوەکو عەقڵانییـە میانڕەوەکـانیش قبـووڵکردنی ئـەم بیروڕایانەیان بە شوورەیی دادەنا.

ئەوەشی کـە پەیوەنـدیی بـە دادپەروەرییـەوە هـەبوو، گفتوگۆکـان زیاتر شێوەیەکی پراکتیکییانە بوون، زیاتریش پەیوەندیی بە بارودۆخی مرۆڤەکانەوە هەبوو، سەرەڕای ئـەوەی هەنـدێ مـشتومڕی لێکەوتـەوە، ئەمــەی خــوارەوەش گەیــشتنە بــە هەنــدێ ئــەنجامی عــەقڵانی لای میانڕەوەکان:

- خوا بیروباوەڕی ڕەوشتیی لەسەر خودی خـۆی فـەرز کـردووە، کە لەسەر مرۆڤەکانیشی فەرز کردووە، ئەو شتێك ناکات دادپەروەری و مـافی ڕەوشـتیی تێـدا نـەبێت، جێـی بـاوەڕیش نییـە کـە شـتێك بکـات لەلایەنی ڕەوشتەوە نادادپەروەرانە و ناڕەوا بێت.

- خێـر و شـەڕ، بـەهۆی خـودی سروشـتی شـتەکانەوە دوو شـتی ڕەسەنن، چونکە خوا دەفـەرموێت ئـەو شـتە خێـرە یـان شـەڕە، بۆیـە دەکرێـت مرۆڤــ بزانێـت چـی هەقــە و چـی ناهەقـە، لـە چوارچـێوەی

بیرکردنەوەیانــدا (عــەقڵ بــەکارهێنان)، ســەرەڕای ئــەوەی کــە بــۆ ئاراستەکردنیان و دووپاتکردنەوەی ئەنجامەکانیان پێویستیان بە وەحی هەیە.

- لەبەر ئەوەی خوا دادپەروەرە و ئەوەش بڕاوەتەوە کە باوەڕیان هەبێت قەزا و قەدەر هەیە و مرۆڤەکان خۆیان کارەکان ئەنجام دەدەن، بۆیە سزادانیان دەربڕی دادپەروەریی خوایە.

لەوانەیە بیرمەندێکی عەقڵانیی هاوچەرخ ژمارەیەك لەم بیروباوەڕانــە قبووڵ بکات، یان جێی سەرنجی بێت، هــەتاوەکو ئــەم جێ ســەرنج و قبووڵانــەش لــەو ڕۆژانــەدا هــەبوون، مەبەسـتێك و ڕێگایــەك و چــمکێك نەبووە کە دوودڵی لای ئەو موسڵمانە تەقلیدییانــە (ئــەو ڕێبازانــەی ئــەو کاتە باو بوون) دروست کردبێت کــە پێویــستیان بــە قــایلبوون بووبێـت، تەسلیم نەبوون بەوەی پێویستیان بە ڕوونکردنەوەی عەقڵانی هەبێت بۆ بیروباوەڕ و کردارە ئایینییەکان. دەتوانرا جیاوازیی بیروڕاکــان کــە ئــەو کات هەبوو — تا ئاستێکی بەرز، لەگەڵ کاتدا — لە ڕووانگــەی قورئــان و ســوننەتەوە چارەســەر بکــرێن، لەبــەر ڕۆشـنایی گفتوگـۆی عەقڵانیـدا. پرسیارەکەش ئەوەیە: ئەی ئەمە بۆ ڕووی نەدا؟

## ج - پەڕگیرەکان لە هەردوولا

پەڕگیرەکان لە هـەردوولا، تەقلیـدی و عـەقڵانی، بوونـە هـۆی هاتنـە کایـەی تونـدی و مایـەی ئـەوەی شـێوەی گفتوگۆکـانیش بگۆڕێـت، بـارودۆخی ڕووبەڕووبوونـەوەیان لەلایـەن تەقلیدییەکانـەوە بـۆ دروسـت بوو؟ پەڕگیرەکان وەك "الحشوية"ەکان پێداگیرییان دەکرد کە ئیمان بە تەواوەتی پشت بە قورئان و سوننەت دەبەستێت، بـە هـیچ شـێوەیەك بواریان بە عەقڵ نەدەدا، بە پێچەوانەیەکی زۆری ئەمەشەوە، عەقڵانییە پەڕگیرەکان وەك ئیبن ڕاوەندی و ئەبوبەکری ڕازی[1]، پێداگیرییان لەوە دەکـرد کـە ناتوانرێـت عـەقڵ و وەحـی بـە یەکـەوە بگـونجێن، هـەموو بابەتەکانیش – لەگەڵیشیاندا هەق و ناهەق – پێویستە پشت بە عـەقڵ ببەسترێت، لە گرنگیی گونجاندنی فەلسەفە و ئایینیـان کەمـدەکردەوە. پێداگیرییان لەسەر دانانی بیردۆزێکی ئایینی دەکردەوە پشت بە عـەقڵ ببەستێت، بەدەر لە وەحی، هەروەها نزیکبوونەوە لەو شتەی کە دواتـر لە ڕۆژئاوا پێی دەوترا لاهووتی سروشتی.[2] هەروەها ئارەزوویان لێبوو،

---

[1] . بۆ زانینی هەندی زانیاریی زیاتر دەربارەی عەقڵانییە پەڕگیرەکان و بیروبۆچوونەکانیان، بڕوانە:

- Badawi, Abdulrrahman. ”Muhammad ibn Zakariyya al –Razi. ” In M. M. Sharif (ed), A History of Muslim Philosophy. Wiesbaden, Otto ; Harrasowitz, 1963, Volme 1, p. 439-440.

[2] . بڕوانە:

- Huxley, Julian. Religion without Revelation. London;Harper, 1 st ed. , 1947;2nd ed. ,
1957.

دواتــر وەك بزووتنــەوەی ڕووناکبیریی ڕۆژئــاوا بــە تــەواوەتی هــەموو ڕاستییە میتافیزیکییەکان ڕەتبکەنەوە، کە ناتوانرێت بـە هـۆی عـەقڵ و تاقیکردنەوەوە بسەلمێندرێن، قبـوولکردنی ئـەم بیروڕایانـەش دەبـووە هـۆی ئـەوەی وەحـی وەلا بنرێـت و عـەقڵ بخرێتـە یەکـەم وەك تاکـە ئاراسـتەکەری ئیمـان، لـەبری ئـەوەی ببێتـە هۆکارێـك بـۆ ڕاڤـە و بەرگریلێکردنی، هەر وەك چۆن ئامانجی موعتەزیلەکانیش بوو.

مـەرج نییـە ڕووبـەرێکی بـەرفراوان بـۆ بـیروڕای پـەڕگیرەکان لـە کۆمەڵگای مرۆییـدا نـەبێت، چـونکە هەنـدێ بـیروڕا وا سـەیر دەکـرا کـە پەڕگیرە و مایەی قبوولکردن نییە، بەڵام لە دواییـدا بـووە هۆکارێـك بـۆ پێشکەوتنی مرۆڤایەتی. جگە لەوەش، لەوانەیە ئاشتیی کۆمەڵایەتی، لە هەندێ بارودۆخدا، بە شێوەیەکی باشتر بەدەست بێـت، ئەگـەر خـۆ بـە دوور گیرا لە هەندێ حاڵەتی پەڕگیری، بە لای کەمەوە لە بابەتە ئـایینی و کۆمەڵایەتییەکاندا. لەگەڵ ئەوەشدا ئەگەر ئەم بیروڕایانـە خرانـە ڕوو، هــەموو کەســێك چــاوەڕوان دەکــات کــە خــەڵکی بــە هێمنــی و لەخۆبووردوویـیـەوە گـوێی لـێ بگرێـت، خـۆ ئەگـەر هـاتوو ئـەم بـیروڕا پەڕگیرانـە نـەیانتوانی خۆیـان بـسەلمێنن و قـایلبوونی تـەواوی خـەڵك

---

-Hepburn, Ronald. Christianity and Paradox. London; C. A. Watts, 1958.

- -Hicks, John. “Revelation” The Encyclopedia of Philosophy, New York; macmillan and The Free press, 1967, Volme7, p. 91-189.

بەدەست نەهێنن، ئەوکات بە مردنێکی سروشتی دەمرن. بۆ، چونکە، ئەم بیروڕا پەڕگیرانە بوونە هۆی گێروگرفت بۆ کۆمەڵگای ئیسلامی؟ ئایا لێبووردن ونبوو بوو؟

هیچ بەڵگەیەك نییە لەسەر نەبوونی لێبووردن لە کۆمەڵگای یەکەمی ئیسلامیدا، لێبووردنیش بە شێوەیەکی گشتی هەبووە و گفتوگۆش لە نێوان تەقلیدییەکان و عەقڵانییەکاندا تا ڕادەیەك بە شێوەیەکی ئازاد و نەرمی بەڕێوە دەچوو، هەتاوەکو کافرێکی وەك ئیبن ڕاوەندی، بە هێمنی و گرنگیپێدانەوە گوێی لە ڕەخنەلێگرانی دەگرت، بیروڕاکانیشی بە شێوەیەکی لۆژیکی لەلایەن چەند نەوەیەك لە زانایانی بەناوبانگی ئیسلامەوە پووچەڵ دەکرانەوە.[1] بە لەبەرچاوگرتنی گیانی لەخۆبووردەیی ئەو سەردەمە، دەتونرا بیروڕا ناکۆکەکان لە چوارچێوەی گفتوگۆی ئازاددا چارەسەر بکرێن، بە تایبەتیش بیروڕا ناکۆکەکانی نێوان عەقڵانییەکان و تەقلیدییەکان، کە زۆرینەی ڕووناکبیرەکانیان پێکدەهێنا، کارێکی ئەوندە گران نەبوو کە سەرنەکەوێت. ئەی چی وای لە کۆمەڵگای ئیسلامی کرد دابەش ببێت بەسەر دوو کۆمەڵەی شەڕەنگێزدا، لە کاتێکدا خودی خوێندنگە ئایینییەکان لە کۆمەڵگەدا لەناو یەکدا لێبووردە بوون و بە ئاشتی دەژیان، سەرەڕای جیاوازییەکی زۆر لە بیروڕاکانیاندا؟

---

1 . Kraus, P. "Ibn al-Rawandi. " The Encyclopedia of Islam, Leiden: Brill, revised edition, 1971, Volume 3, p. 905.

**د ـ کارەساتەکە**

ڕەنگە وەڵامەکەی لە بەکارهێنانی هێزدا خۆی ببینێتەوە، لە پەنابردنی دەستەڵاتی سیاسیی ناشەرعی بۆ هێز، کە متمانەی گەلی بەدەست نەهێنابوو. ئاراستەی گشتیی کۆمەڵگای مرۆییش وایە، ئەگەر کۆمەڵەیەك هێزی بۆ سەپاندنی بیروباوەڕی خۆی بەسەر کۆمەڵەیەکی تردا بەکارهێنا، ئەوا کاردانەوەی کاری کۆمەڵەیەکی چەوسێنراوەیە کە بەرەو توندی مل دەنێت. بە تایبەتیش ئەو کۆمەڵەیەی دوایی کە زۆرینەی گەل پێکدەهێنن. موعەتەزیلەکان ئەو پشتگیرییە سیاسییەی لەلایەن حکومەتەوە لێیان دەکرا لە ماوەیەکی دوورودرێژی سەردەمی عەباسی (١٣٢ك / ٧٥٠ز ـ ٦٥٦ ك/ ١٢٥٨ز) قۆستیانەوە، بە تایبەتی لە سەردەمی دەستەڵاتی مەئموندا (٢١٨ك/٨٣٣ز کۆچی دوایی کردووە)، بۆ سەپاندنی بیروباوەڕە پەڕگیرییەکانیان بە هێز بەسەر هەمووانـدا. بووبوونە شەڕخواز و دەمارگیر، بە ئاشکرا لە هەموو ڕێنماییە ئیسلامییەکان لایان دا، بوونە هۆکاری کارەسات لە جیهانی ئیسلامیدا. بەناو خەڵکیدا دەگەڕان و لە بیروباوەڕیانیان دەپرسی، ئەگەر پێچەوانەی بیروباوەڕی ئەوان بوونایە هەڕەشەیان لێ دەکردن. زانای ئاییني و وتاربێژ و بانگدەر و مامۆستایەکیان نەهێشت تاقییان

نەکردبێتەوە.[١] خەریکبوو ئازادیی ڕادەربڕین بە تەواوەتی نەمێنێت، کە یەکێکە لە تایبەتمەندییە گرنگەکانی کۆمەڵگای ئیسلامی.[٢]

سەرەڕای ئەمانەش، نەیارەکانیان بەند دەکرد و لە پێناو سەپاندنی بیروباوەڕە قبوولنەکراوەکانیان ئەشکەنجەیان دەدان: "بەندیخانەکان پڕبووبوون لەوانەی کارەساتەکەیان ڕەتکردبووەوە".[٣] هەندێ لە بەندکراوەکان وەك محەمەد کوڕی نوح (٢١٨ك/٨٣٣ز کۆچی دوایی کردووە) و نەعیم کوڕی حەماد (٢٢٨ك/٨٤٢ز کۆچی دوایی کردووە) و یوسف بویتی (٢٣١ك/٨٤٥ز کۆچی دوایی کردووە) و ئەحمەد خوزاعی (٢٣١ك/٨٤٥ز کۆچی دوایی کردووە)، لە ئەنجامی ئەشکەنجەدان لە بەندیخانەدا مردن.[٤] سەری ئەحمەد خوزاعییان "لە شوێنێکی گشتیی بەغدا دانا، بۆ چاوترساندنی ئەوانەی گوێڕایەڵی ناکەن، لە کاتێکدا لاشەکەشی لە سامەڕا نمایش کرابوو".[٥] هەتاوەکو زانا گەورەکانیش سەلامەت دەرنەچوون، وەك: ئەحمەدی کوڕی حەنبەل (٢٤١ك/٨٥٥ز

---

[1]. لە کتێبی کندی (حکام مصر وقضاتها) وەرگیراوە، بڕوانە:

-Hinds, M. "Mihna. " The Encyclopedia of Islam, Leiden: Brill, 1993, p. 4. (29) -Hinds, "Mihna. ", p. 4. (31) -Hinds, "Mihna. ", p. 4.

[2]. أبو زهرة، محمد. تاريخ المذاهب الإسلامية، بەرگ١، ل١٧٨.

[3]. لە کتێبی کندی (حکام مصر وقضاتها) وەرگیراوە. بڕوانە :

-Hinds, "Mihna. ", p. 4. .

[4]. أبو زهرة، محمد. تاريخ المذاهب الإسلامية،، بەرگ١ ل١٨٣. .

[5]. بڕوانە وەرگرتنی هیند لە (الطبري واليعقوبي) لە:

-Hinds, "Mihna. ", p. 4.

کۆچی دوایی کردووە) کە پلە و پایەیەکی بەرزی لەناو کۆمەڵدا لە خواپەرستی و کارەکانیاندا هەبوو. بە بڕیاری موعتەسیم، ئەوەندە جەڵدەی لێ درا تا لە هۆش خۆی چوو [1]، چونکە بیروباوەڕی (قورئان خەڵقکراوە)ی موعتەزیلەکانی ڕەتکردبووەوە. پەڕگیرەکان گەیشتنە ئەو ئاستەی کە دەستەواژەی "لا إلە إلا الله، رب القرآن المخلوق" لە مزگەوتەکانی فوستاتدا بنەخشێنن".[2] وا پیشان بدەن کە چەمکی "خلق القرآن" بەشێکە لە بیروباوەڕی ئیسلامی و هیچ گومانێکی تێدا نییە.

ئەو پرسیارەی دێتە پێشەوە، ئەوەیە: بۆچی زانا موسڵمانەکان دەربارەی بابەتێك کە لە ئێستادا ئەو گرنگییە گەورەیەی لای زۆربەی خەڵکی نییە، تا ئەو ئاستە ناڕەحەت و بێزار بوون؟ بەکارهێنانی هێز و چەوساندنەوە، خەڵکی زۆر بێزار کردبوو، لەبری ئەوەی ـ بە پێچەوانەی ئەوەوە – گفتوگۆیەکی فیکری بێت. زاناکان گومانیان لە مەرامی حکومەت هەبوو، ئەمە وای لێکردن هەست بەوە بکەن، بە هەق یان بە ناهەق، دەوڵەت دەیەوێت کرۆکی ئیسلام دیاری بکات.[3] ئەمە وای

---

1. المسعودي، مروج الذهب ومعادن الجوهر، سەرچاوەی پێشوو، بەرگ٤ ل ٥٢. هەروەها بڕوانە:
–أبو زهرة، محمد. تاريخ المذاهب الاسلامية، بەرگ١، ل٢٩٧–٣٠٢.
-W. P. Patten, Ahmad ibn Hanbal and the Mihnah, Leiden, 1897, edited by Arberry, 1957, p. 19 and Hinds, "Mihna. ", p. 3.

2. لە کتێبی کندی (حکام مصر وقضاتها) وەرگیراوە. بڕوانە :
-Hinds, "Mihna. ", p. 4.

3. Hinds, "Mihna. ", p. 6.

لێکردن کە چەمکی "خلق القرآن" قبووڵ نەکەن و دەترسان لەوەی کە قبووڵکردنی ئەمە، خۆی لە خۆیدا دانپێدانانە بەوەی قورئان هەمیشەیی نییە و دەتوانرێت لەلایەن دەستەڵاتی ناشەرعی و گەندەڵەوە بگۆڕدرێت و دەستکاری بکرێت. هەر بەوهۆیەوە ئەوەیان قبووڵ نەکرد، بە پێویستیشیان زانی لەسەر خۆیان بەرگری لە هەڵوێستەکانیان بکەن، بێ ئەوەی بەندیخانە و جەڵدەلێدانی بێ بەزەییانە بیانترسێنێت.

کارەساتەکە و نیگەرانیی لای زانایان بەرانبەر حکومەت، گەیشتە ئەوەی تێکچوون و ناڕەزایی لای گەل، بە تایبەتی لە بەغدا، پەرەبسێنێت. ئەمە وای لە سەرکردە سیاسییە ناشەرعییەکانی ئەو کاتە کرد هەست بکەن — هەرچەندە دوای کار لەکار ترازان و ڕوودانی زیانەکان — کارەساتەکە لای خەڵکی قبووڵ نییە و سەرکەوتووش نابێت. بۆیە متەوەکیل (٢٤٧ك/٨٦١ز کۆچی دوایی کردووە) لە ٢٣٤ك/٨٤٩ز دا کۆتایی پێهێنا و ئەحمەد کوڕی ئەبی داودی دادوەری دادوەرەکانی (قاضي قضاة)ی دەرکرد، کە ئەو بەرپرسیاربوو لە جێبەجێکردنی بە توندووتیژی، تووشی ئیفلیجی بوو و لە ٢٤٠ك/٨٥٤ز کۆچی دوایی کرد.

لەگەڵ ئەوەی کارەساتەکە تەواو بووبوو، بەڵام شوێنەواری لەسەر کۆمەڵگای ئیسلامی بەجێهێشتبوو: تەندروست و ناتەندروست، تەندروستەکەیان لەوەدا خۆی دەبینییەوە کە دەوڵەتی دوورخستەوە لەوەی کە هیچ ڕۆڵێکی لە ناساندنی کرۆکی ئیسلام هەبێت، چونکە

ئیسلام بەپێی قورئان و سوننەت پێناسە دەکرێت، بەڵام ناتەندروستەکەشیان بریتی بوو لە دوورکەوتنەوەی زانایان لە فەلسەفە و زانست، ئەمە وای لێکردن زیاتر ڕوو لە خۆپارێزی بکەن.

**غەزالی (٥٠٥ك / ١١١١ز کۆچی دوایی کردووە)**

لەگەڵ ئەوەی هێز بەکاردەهێنرا، بەڵام مشتومڕ دەربارەی "خلق القرآن" لە نێوان عەقڵانی و تەقلیدییەکاندا بەردەوام بوو. عەقڵانییە پەڕگیرەکان لە ئەنجامی ئەمەدا دەستیان بە پاشەکشێ کرد و بیروباوەڕە گوماناوییەکانیان نەیانتوانی بەرانبەر بە هێرشی قوتابخانە نوێیەکە بوەستێتەوە، کە ئێستا پێی دەوترێت ئەلئەشعەرییە (الاشعرية)، بەرگرییەکی لۆژیکیی دڵنیایی خستەڕوو لە بیروباوەڕ و کردارە ئیسلامییەکان. سەرکردەی ئەم قوتابخانەیەش ئەبولحسەن ئەلئەشعەرییە (٣٣٢ك/٩٤٣ز کۆچی دوایی کردووە) لە عێراق و ئەبومەنسور ئەلماتوریدی لە ئاسیای ناوەڕاست، بە دوای ئەویشدا ژمارەیەك لە تێگەیشتووان لە ئیمان هاتن، وەك باقلانی (٤٠٣ك/١٠١٢ز کۆچی دوایی کردووە)، جوەینی (٤٧٨ك/١٠٨٥ز کۆچی دوایی کردووە)، قوشەیری (٤٦٥ك/١٠٧٢ز کۆچی دوایی کردووە)، کە هەموویان لە زانستە ئایینییەکان و زانستی ئاخاوتن و فەلسەفەشدا قاڵبووبوون، جگە لەوەی ئەمانە پارێزگاری (تەقلیدی) بوون، ئەگەر بە پلەی جیاوازیش بوو بێت. هەر وەك ئەلماتوریدی بە شێوەیەکی گشتی کەمتر لە

ئەشعەری پارێزگار بوو.(١) هەرچەندە غەزالی (٥٠٥ك/١١١١ز کۆچی دوایی کردووە) خودی خۆی گورزێکی برووسکەئاسای بەهێزی لە عەقڵانییە پەڕگیرەکان وەشاند، لە کتێبەکەیدا "تهافت الفلاسفة"دا کە لە ساڵی ٤٨٨ك/١٠٩٥ز دا تەواوی کرد(٢)، "پەردەی لەسەر جیاوازییەکانی بیروباوەڕە میتافیزیکی و بیردۆزەکانیان کە دژ بەیەك بوون، لادەدا".(٣) سەرکەوتووش بوو، چونکە هێرشی کردە سەر فەلسەفە و "قاڵبوو بە زانیارییەکی قووڵ لە فەلسەفە و بە هەموو ئەو هێز و ڕۆشنایی و ژیارییەی لە هزریدا هەبوو.(٤) بەڵام هەموو ئەو شتانەی عەقڵانییەکان هێنابوویان، ڕەتی نەکردبووەوە. ئەو دان بەوەدا دەنێت کە "ئەگەر ئەوەی (فەیلەسوفەکان) دەیڵێن لە خودی خۆیدا مەعقول

---

[1]. أبو زهرة، محمد. تاريخ المذاهب الإسلامية، سەرچاوەی پێشوو، بەرگ١، ل٢١٢.

[2]. الغزالي، إحياء علوم الدين، سەرچاوەی پێشوو، وشەی "تهافت" وەرگێڕدراوە بۆ ئینگلیزی بە چەند ڕێگایەك: لەوانە (داڕمان) Breakdown (بێ هێزی) disintegration (پڕوپووچ)Absurdity (مایەپووچ) Bankruptey(تێکچوون / پەرتبوون) incoherenceلەوانەیە وشەی incoherence (تێکچوون / پەرتبوون) نزیکترینیان بێت لە ماناکەیەوە بڕوانە:

-Van Den Bergh, (tr. ), Averroes'Tahafut al-Tahafut, p. xiii, also.

-Watt, W. Montgomery. Muslim Intellectual: A study of Al-Ghazali. Edinburgh: University Press, 1963, p. 59.

– کتێبەکانی تری غەزالی کە پەیوەندییان بەم بابەتەوە هەبوو، وەك " المنقذ من الضلال" و "إحياء علوم الدين".

[3]. الغزالي، تهافت الفلاسفة، سەرچاوەی پێشوو، ل٣١.

[4]. Hourani, George F. Averroes on the Harmony of Religion and Philosophy. (A translation, with introduction and notes, of Ibn Rushd's Kitab Fasl al-Maqal with its appendix (Damimah) and an extract from Kitab al-Kashf an Manahij al-Adillah London: Luzac, 1961, p. 5.

بێــت و پــشتبەستوو بێــت بــە بەڵگــە و دژی قورئــان و ســوننەت نەوەستێتەوە، بۆمان نەهاتووە ڕەتیبکەینەوە. ئەگـەر هـاتوو دەرگـای قبووڵنەکردنمان لە هەموو شتێك کە کافرێك پێی گەیـشتووە، کـردەوە، ئەو کات ناچـار دەبـین زۆرێـك لـە ڕاسـتییەکان ڕەتبکەینـەوە".[1] هـەر شتێك زانیبێتی سوودی هەیە، لێی وەرگرتوون، هەوڵیشی داوە گونجـان لــە نێــوان فەلــسەفە و زانــستی ئاخــاوتن (علــم الکــلام) و زانــستە ئیسلامییەکاندا بکات، توانییشی چەند ناکۆکییەکی وجودی کە ئەو کاتە بـاوبوو، چارەسـەر بکـات. هـەر وەك ئەرناڵـدز (Arnaldez) دەڵێـت: "دەوڵەمەنـدترین و فـراوانترین و زۆرتـرین سیـستمی کـراوەی" هێنایـە کایەوە.[2]

غەزالی لەناو ئەو بیست بیردۆزەیـەی عەقڵانییەکانـدا، سـێ بـیردۆزی دۆزییەوە و ڕەتیکردنەوە، کە بێباوەڕییان تێدایە و بـە هـیچ شـێوەیەك جێگەی قبـووڵکردن نـین. ئەوانـەش بریتـی بـوون لـە (نـەمریی جیهـان، نــەبوونی ژیانــەوەی جەســتەیی، پــەی نــەبردنی خــوا بــە هــەموو وردەکارییــەکان).[3] مــشتومڕی لەســەر ئــەم ســێ بـیردۆزە کـرد، کـە

---

[1]. الغزالي، المنقذ من الضلال، سەرچاوەی پێشوو، ل٣١.

[2] . Arnaldez, R. "Falsafa. " The Encyclopedia of Islam Leiden: Brill, new ed. , 1971, Volume 2, p. 774.

[3]. دروستکرنی قورئان (خلق القران) لـە بیـست بیردۆزەکـەدا نـەبوو، چـونکە ئـەم بیرۆکەیـە لـە ٢٤٣ك/ ٨٤٩ز کۆتـایی هـات، لـە دەسـتەڵاتی خەلیفـە متەوەکیلـدا (٢٣٢-٢٤٧ك/ ٨٤٧-٨٦١ز) پـێش غـەزالی (٥٠٥ك/ ١١١١ز کۆچی دوایی کردووە) بە ماوەیەکی درێژ.

فەیلەسـوفەکان بانگەشـەی ئـەوەیان دەکـرد کـە لـە هـەمان ئاسـتی تێگەیـشتن و دڵنیاییـدان وەك ماتماتیـك و لۆژیـك، بـە شـێوەیەکی سەرەکیش پشتیان بە گریمانە و گومانی نەسەلماو دەبەست، کە عـەقڵ ناتوانێـت بیانـسەلمێنێت.(١) هـیچ دوودڵییـەکی نـەبوو لـە قبـووڵکردنی بیردۆزەکـانی تـر، کـە هـیچ ناکۆکییـەکیان لەگـەڵ شـەریعەتدا نـەبوو و بنەمایەکی زانستییان هـەبوو. بـە شـێوەیەکی تایبـەتیش پـشتگیری لـە ڕاڤەی عەقڵانییەکان دەکرد سەبارەت هەندێ دیاردەی سروشـتی، وەك ڕۆژگیران و مانگگیران، چونکە پێی وابوو ڕەتکردنەوەی ئەو ڕایانە زیان بە ئـایین دەگەیـەنێت.(٢) هـەروەها بـێ دوودڵـی پـشتگیری لـە فیزیـك و کیمیا و گەردووناسی و ماتماتیـك و زانـستییە سروشـتییەکان دەکـرد. غەزالی زۆر بە بوێرییەوە وتی: "هەر کەسێك وای دابنێت ڕەتکردنـەوەی ئـەم زانـستانە بەسـوودە بـۆ ئیـسلام، تـاوانێکی نابـەجێ دژی ئیـسلام ئەنجام دەدات".(٣) هیچ گومانێکی لە عەقڵ بۆ کاروباری مرۆیـی نـەبوو، بـەڵکو دووپاتیـدەکردەوە کـە: "فیکـر سەرچـاوە و خـاڵی دەسـتپێك و بنـەڕەتی زانیارییـە، چـونکە زانیـاری لێدەکەوێتـەوە هـەر وەك چـۆن درەخت بەر دەگرێت و ڕۆشنایی لە هەتاوەوە و بینین لـە چاوەوە".(٤)

---

[1]. الغزالي، تهافت الفلاسفة، سەرچاوەی پێشوو، ل٣١.

[2]. سەرچاوەی پێشوو، ل٣٣.

[3]. الغزالي، المنقذ من الضلال، سەرچاوەی پێشوو، ل٢٥.

[4]. الغزالي، إحياء علوم الدين، سەرچاوەی پێشوو بەرگ١، ل٨٣.

بـــەڵام گومــانی هـــەبوو بـــۆ ســـەلماندنی ڕاســـتییە میتافیزیکییـــەکان و جیاکردنەوە لە نێوان هەق و ناهەقدا، تەنیا پشت بە عـەقڵ ببەسـترێت. وای دەبینی کە عەقڵ و وەحـی ڕۆڵێکـی تەواوکـەری یـەکتری لـە ژیـانی مرۆییدا دەبینن.

ئەوەی کە زیاتر هێز بە غەزالی دەدات کـە بەرگرییـەکی عـەقڵانی لـە بیروباوەڕ و کردارە ئیسلامییەکان بکات، زمانە پاراوەکـەی و زانیارییـە بەرینەکەی لە شەریعەتدا و خواپەرستی و ڕەوشتە ڕەسـەنە بەرزەکـەی بـوون. ئـەم سـیفاتانە وای لێکردبـوو ڕێزێکـی زۆری سەرسـوڕهێنەری هەبێت. هەروەها لەو کاتەدا دەستەڵاتێکی بەهێزی لە جیهانی ئیسلامیدا هەبوو، تا ئێستاش کتێبەکانی دەخوێنرێنەوە و بە نموونە دەیهێننەوە. لە سایەی ئەودا زانستی ئاخاوتن _ کـە موعتەزیلـەکان دایاننـابوو و بـە شـێوەیەکی بـەرفراوان وتـەی فەیلەسـوفەکان و بەڵگـەکانیان بـوون — زانستێکی ئایینی بە فەرمی ناسێنراو بێت و بەشێکی بنـەڕەتی بێـت لـە پرۆگرامی فێرکردنی ئایینی.

لەگەڵ ئەوەی غەزالی لە چوارچـێوەی بـەرگریکردن لـە بیروبـاوەڕ و کـردارە ئایینییـەکانی دژی کـافر و گـومڕا و عەقڵانییـە پـەڕگیرەکان، خزمەتێکی گەورەی پێشکەش بە ئیسلام کرد، بەڵام لـە پێـداگیریکردنی لەوەی هۆکاری یەکەمی هـەموو دیاردەیـەك هـەر خوایـە، هەڵـەی کـرد، بـــەوە لـــە هۆکـــارە کاریگـــەرەکانی (یـــاخود هەنووکەییـــەکانی) کـــەم دەکـردەوە، چـونکە دەڵـێ: "پەیوەنـدی لـە نێـوان ئـەوەی هەمیـشە

دادەنرێت بە هۆ و ئەوەشی کە دادەنرێت بە ئامانج، پێویست نییـە". [١]
بۆ سەلماندنی بیروبۆچوونەکەی، دەڵێت: پەیوەندیی نێـوان تینوویـەتی شـــکاندن و ئـــاو خواردنـــەوە، تێربـــوون و خـــواردن، ســـووتان و بەرئاگرکەوتن، چارەسـەر و دەرمـانخواردن، پێـشتر چارەنووسـیان لای خوا دیاری کـراوە. [٢] ئـەوەی هەنـدێ جێـی سەرسـوڕمانە، ئەوەیـە کـە نکـوڵی لـە هۆکـارە کاریگـەرەکان دەکـات و دان بـە گرنگیـی زانـستە سروشتییەکاندا دەنێت، کە یەکێکە لە کۆڵەکەکان کە پەیوەندی بـە هـۆ و ئامانجەوە هەیە، لەگەڵ ئەوەشدا پێـداگیری لـەم خاڵـە ناکـات – وەك دەردەکـــەوێت – شـــتەکان بـــەرەو بـــەهێزبوونی پلـــەی پارێزگـــارە (تەقلیدییەکان) پەڕگیرەکان دەچێت، ئەمیش لە ڕێگەی خۆیـەوە بـوو بە هۆی لاوازبوونی هێزی عـەقڵانی و توێژینـەوەی زانـستی لـە جیهـانی ئیسلامیدا.

مرۆڤـ سەری سوڕدەمێنێت، چۆن زانایەك لـە پلـەی غەزالیـدا، بڕیـار دەدات بچێتە ڕیزی هێڵی ئەشعەرییەکانەوە لە ڕەتکردنەوەی پەیوەندیی نێـــوان هـــۆ و ئامـــانج! لەوانەیـــە بـــەهۆی کاردانەوەیـــەکی هەســـت پێنەکردنەوە بوو بێت لەو کەشە باوەی ڕوونبوونەوە و گومـان، کـە لـە ئـــەنجامی نکـــوولێکردنی عەقڵانییـــە پەڕگیرەکانـــەوە لەســـەر ڕاســـتیی زانیارییە بنەڕەتییەکان دروست بوو بوو، لەوانەشە مەترسی هـەبووبێت

---

1. الغزالي، تهافت الفلاسفة، سەرچاوەی پێشوو، ل١٦٩.

2. سەرچاوەی پێشوو.

لـه قبـووڵكردنی ڕۆڵێكـی یەكلاییكـەرەوە بـۆ هۆكـارە كاریگـەرەكان لـە هەموو دیاردە جیاوازەكانی ژیانی مرۆییدا، بە شـێوەیەكی ناڕاسـتەوخۆ مانای نەبوونی پەیوەندیی خوا بە كاروبـاری مرۆڤەكانـەوە بگەیـەنێت و گەڕاندنەوەی بۆ ڕۆڵی خوا كە دروستكەری كاتەكانە. لەگەڵ ئەوەشدا وا دەردەكەوێت ئـەو مەترسـییە بنـەمای نـەبێت كـە لەسـەری بوەسـتێت، بەڵام ئەوە بیانوویەك بێت بۆ ئەو كەشە فیكرییەی كە ڕووبەڕووی غەزالی دەبووەوە.

## ئیبن ڕوشد (٥٩٥ك / ١١٩٨ز كۆچی دوایی كردووە)

ئیبن ڕوشد هەوڵێكی مەزنی دا بۆ ڕزگاركردنی بزووتنـەوەی عـەقڵانی لە داڕمان، دوای لێدانە كوشندەكەی لە غەزالی پێش نزیكـەی ٨٥ سـاڵ. وەڵامدانەوەیەكی لە دژی غەزالی ئامـادەكرد، لـە ٥٧٦ك/١١٨٠ز تـەواوی كرد و ناوی نـا "تهافـت التهافـت".[1] "تهافـت"ی غـەزالی و "تهافـت"ی ئـیبن ڕوشـد، بـە ڕوونـی ڕەنگدانـەوەی كرۆكـی ململانێـی بیروڕاكانـە دەربارەی عەقڵ و وەحی، كە لە جیهانی ئیسلامیدا لە سەدەی دووەمی كۆچـی/ سـەدەی هەشـتەمی زایینـی، تـاوەكو سـەدەی نـۆی كۆچـی /

---

[1] . ڤان دن بێرگ (Van Den Bergh) وەرگێڕانە ئینگلیزییەكـەی"تهافـت التهافـت"ی بڵاوكـردەوە، بڕوانە:

- Van Den Bergh, Averroes' Tahafut al-Tahafut…

- بۆ زانـین دەربـارەی هەڵبـژاردە لـە كتێبـی **"**كتـاب فـصل المقـال**"** و كتێبـی " الكـشف عـن منـاهج الأدلة"ی ئیبن ڕوشد، بڕوانە:

- Hourani, *Averroes on the Harmony of Religion and Philosophy*…. .

سیازدەی زایینی بڵاوبووبووەوە، هەر ئەو ململانێیەش بوو کە لە ڕۆژئاوا دوای پێنج سەدە دروست بوو.

ژمارەیەك لەو تۆمەتانەی غەزالی ئاراستەی فەیلەسوفەکانی کرد لەسەر فەیلەسوفە میانڕەوەکان وەك ئیبن ڕوشد، کە بیروبۆچوونی لەسەر باوەڕ و کردارەکان وەك بیروبۆچوونی تەقلیدییەکانی ئەوکات باو بوو، وابوون. ئیبن ڕوشد درکی بەوە کردبوو کە هەڵوێستی عەقڵانییە پەڕگیرەکان دەربارەی هەندێ خاڵ، لاواز بوون، بۆیە پشتی بە نزیکبوونەوە و یەکخستن بەست، بەو پێیە ڕۆڵی وەحی و عەقڵ وەك یەك لە ئاییندا دووپاتبکاتەوە. بۆیە وتی: "هەموو ئایینێك لەسەر وەحی دامەزراوە، بەڵام عەقڵ ئاوێتەی دەبێت، هەر کەس باوەڕی وا بێت کە دەتوانرێت ئایینێك هەبێت پشت بە عەقڵ نەبەستێت، بێگومان دەبێ بەوەش قایل بێت کە ئەو ئایینە کەمترە لەو ئایینانەی کە لەسەر عەقڵ و وەحی دامەزراون".(١) هەروەها پێداگریی لەسەر ئەوە دەکرد "ئایا نابێت لەسەر ڕێگەی شکۆمەندیی ئایین ڕێ بکرێت"(٢) و پێویستە "لەسەر هەموو کەسێك باشترین ئایینی سەردەمەکەی هەڵبژێرێت".(٣) دوای ئەوەی دانی بەوە دا نا کە ئایین پێویستە، دەچێتە سەر بەرگریکردن لە فەیلەسوفە میانڕەوەکان. ئاشکرای کرد کە: "فەیلەسوفە داناکان ڕێگە نادەن گفتوگۆ

---

[1]. ابن رشد، أبو وليد محمد، تهافت التهافت، تحقيق: موريس بريجز، بيروت، دار المشرق، ط٤، ١٩٩٢م، ل٥٨٤.

[2]. سەرچاوەی پێشوو، ل٥٢٧.

[3]. سەرچاوەی پێشوو، ل٥٨٣.

یاخود ململانێ لەسەر بیروباوەڕی ئایین بکرێت". [(١)] بەڵکو گەیشتە ئەو ئاستەی کە دووپاتی ئەوەی دەکردەوە: "ئەوانەی گومانیان سەبارەت بە (ڕاستییە ئایینییەکان) هەیە و بە ڕوونی ململانێی تێدا دەکەن، هەر ئەوانن ئایین وێران دەکەن و شکۆمەندیی قەدەغە دەکەن. بێگومان هەر ئەو کافرانەن کە باوەڕیان وایە مەبەستی مرۆڤ تەنیا چێژێکی هەستپێکراوە... ئەوەی غەزالی دەیڵێت دەربارەیان ڕاستە.[(٢)] لە کتێبی "فصل المقال"دا بە توندی بەرگری لە گونجاندنی نێوان عەقڵ و شەریعەت دەکات.

لەگەڵ ئەوەشدا ئیبن ڕوشد هەوڵی دا هەڵەی غەزالی ڕاستبکاتەوە، ئەوانەی پەیوندییان بە هۆکارە کاریگەرەکانەوە هەبوو، مشتومڕێکی توندیشی کرد، کە لەگەڵ ئەوەی خوا هۆکاری ڕەهای هەموو دیاردەیەکە، بەڵام هەر خۆی هۆکارێکی دووەمی بۆ هەر دیاردەیەك داناوە. لە کاتێکدا ئەو باڵادەستە لە دروستکردنی کۆمەڵگایەك کە مرۆڤی تێر ببێت بە بێ ئەوەی خواردن بخوات، تینویەتی نەهێڵێت بە بێ ئەوەی ئاو بخواتەوە، بسووتێت بە بێ ئەوەی ئاگری بەربکەوێت، ئەمەش هەموو کات نایکات. کاتێکیش ئەمە بکات، ئەوکات دەبێتە

---

[1]. سەرچاوەی پێشوو، ل٥٢٧.

[2]. سەرچاوەی پێشوو، ل٥٨٥–٥٨٦. لەوانەیە بۆ خوێنەر سوودمەند بێت تەواوی گفتوگۆی چوارەم لە لاپەڕەکانی ٥٨٠ – ٥٨٦ بخوێنێتەوە، بیروبۆچوونی ئیبن ڕوشد ڕووندەکاتەوە کە بە تەواوی لەگەڵ بیروباوەڕە تەقلیدییەکاندا هاوڕایە، بەرگریکردنیشی لە فەیلەسوفەکان (نەك کافرەکان) بێ بنەما نەبووە.

پەرجوو (معجزة)، پەرجووش لەو کارانەی خواوەندە کە عـەقڵی مرۆڤــ تێدەپەڕێنێت.[1] لەبەر ئەو هۆیەیە هـیچ کـام لـەو فەیلەسـوفانە پێـشتر باسیان لە گفتوگۆ و مەسەلەی پەرجوو نەکردووە، سـەرەڕای هـەبوونی لە جیهاندا[2]، چونکە "نکووڵیکردن لەو هۆکارە کاریگەرانەی کە بەهۆی هەسـتەکانەوە لـە دیـاردە هەسـتپێکراوەکاندا دەبینـرێن، جۆرێکـە لـە گـۆڕینی ڕاسـتییەکان".[3] ئـیبن ڕوشـد وای دەبینێـت کـە زانیـاری لـە چوارچـێوەی دیـاریکردنی پەیوەندییــەکان لــە نێــوان هۆکارەکــان و ئەنجامەکاندا پێش دەکەوێت: " نکووڵیکردن لـە هۆکارەکـان، خـۆی لـە خۆیدا نکووڵیکردنە لە زانیاری، نکووڵیکردنیش لـە زانیـاری مانـای وایـە ناتوانرێت هیچ زانیارییەکی ڕاست و تەواو دەربارەی هیچ شتێك بزانرێت، ئەوانەش هەموو گریمانەن، پشت بە هیچ بەڵگەیەك نابەستن.[4]

سەرەڕای دانایی ئیبن ڕوشد و قـووڵیی زانیارییـەکانی، بـەڵام نـەیتوانی بیروڕای باوی ئەو کاتە کە لە بەرژەوەندیی فەیلەسوفەکان بـوو، بگۆڕێـت. بۆیـە لەگـەڵ ئـەوەی ڕۆڵێکـی گرنگـی لـە مێـژووی سـەدەکانی ناوەڕاسـتی

---

1. سەرچاوەی پێشوو، ل٥٢٧.
2. سەرچاوەی پێشوو.
3. سەرچاوەی پێشوو، ل٥١٩.
4. سەرچـاوەی پێـشوو. ل٥ ٢٢. لەوانەیــە خوێندنــەوەی تــەواوی بەشــەکەی تایبــەت بــە هۆکــار ە کاریگەرەکان لە ل ٥١٩–٥٢٧ بەسوود بێت.

لاتینیدا[1] گێڕا، بەڵام کاریگەریی لەسەر فیکری ئیسلامی بە شێوەیەکی کەم نەبێت، نەبوو. بەوەش جیادەکرایەوە کە لەوانەیە دوایین فەیلەسوفی مەزن بێت لە جیهانی ئیسلامیدا.[2] لەگەڵ ئەوەشدا "خوێندکار و شوێنکەوتەی نەبوو".[3] گومانی تێدا نییە، ئەم شتە زۆر جێی داخ و نیگەرانیی بوو بۆ جیهانی ئیسلامی، نەك هەر لە بواری عەقڵانییدا بە تەنیا، بەڵکو لە بواری فیقهیشدا، تاوەکو ئەمڕۆش نامەکەی (بداية المجتهد) لای توێژەرەکان سەرچاوەیەکی بەنرخە.[4] باوەڕی بە دۆزینەوەی ئاوێتەیەکی هاوسەنگ لە نێوان عەقڵ و وەحیدا هەبوو (کۆکردنەوە لە نێوان ماقووڵ و وەرگیراودا) لە ڕێگەی پێدانی عەقڵ و تاقیکردنەوە (پێوانە و تاقیکردنەوە) شوێنێکی شیاو لە شەریعەتدا.

---

1. تۆماس ئاکۆیناس (Thomasaquinas) ئیبن ڕوشد بە لای کەمەوە پێنجسەد و سێ جار بە نموونە هێناویەتیەوە، بڕوانە: - Urvoy, Dominique. Ibn Rushd. Olivia Stewart, (tr. .), London: Routledge, 1991

2. بڕوانە پێشەکیی ڤان دن بێرگ (Van Den Bergh) لە وەرگێڕانی کتێبی (تهافت التهافت) ئیبن ڕوشدا.

- Van Den Bergh, Simon, (tr. ), *Averroes' Tahafut al-Tahafut* (The Incoherence of the Incoherence). Cambridge, UK: The Gibb Memorial Trust, 1954, reprinted in 1969 and 1987 by Luzac and Co. , London, 1954, p. xii.

- هەروەها ڕوانە: Gardet, "Ilm al-Kalam. ", p. 1149.

3. De Boer, T. J. *The History of Philosophy in Islam*. Edward R. Jones (tr. ), London: Luzac, 1970, p. 200.

4. عمران نیازی ئەم کتێبەی لە دوو بەرگدا وەرگێڕا، بڕوانە:

-Nyazee, Imran, Ahsan Khan. *The Distinguished Jurist's Primer*. Reading, UK:Garnet, 1994.

ڕەخنەی لەوانەش دەگرت کە بە بێ لێکۆڵینەوە و پوختەکردن بیروڕای ئەوانەی پێش خۆیانیان وەردەگرت.(١) دەتوانرا ڕێگە زانستییەکەی و دووربینی و هەڵوێستی لیبراڵی و لێبوودرەیی، بەهایەکی گەورەیان لە دارشتنەوەی ڕێڕەوی چالاکیی فیکری لە ئایندەدا هەبووایە.

هەتاوەکو ئەو چاودێرییەی عەقڵانییەکان لەلایەن حکومەتەوە هەیانبوو، کە خەلیفەکان لاوازبوون، ئەویش بەردەوام نەبوو و پێویستیان بە کۆمەکی گەل هەبوو، بۆیە چیتر نەیاندەتوانی تێڕوانینی نوێیان بە تایبەت لەسەر بنەما سەرەکییەکانی ئیسلام، لە دەرەوەی تێڕوانینەکانی کۆمەڵگا هەبێت، بەوەش هیچیان بۆ نەمایەوە تەنیا گەڕاندنەوە بۆ بیروڕای کۆمەڵ نەبێت.(٢) لە کاتێکدا لۆمە دەکران، لەوانە ئیبن ڕوشد، هەروەها بزووتنەوەی عەقڵانی بەهاکەی نەما، تا ئاستێکی زۆریش پلە و پایەی بێهێز بوو. کەسیش نەما ڕووبەڕووی ئەشعەرییەکان بوەستێتەوە، تای ترازووەکەی بەرزبووەوە و بووە تاکە مەزهەبی باو لە جیهانی ئیسلامیدا، هەر بەو شێوەیە تاوەکو ئەمڕۆ مایەوە، لە سایەی پارێزەرانی بەناوبانگی وەك شەهرستانی (٥٤٨ك/١١٥٣ز کۆچی دوایی کردووە)، فەخرەدینی ڕازی (٦٠٦ك/١٢٠٩ز کۆچی دوایی کردووە)، ئەیجی (٧٥٦ك/١٣٥٥ز کۆچی دوایی کردووە)، جورجانی (٨١٦ك/١٤١٣ز کۆچی دوایی کردووە).

---

[1]. Dutton, Yasin. "The Introduction to Ibn Rushd's Bidayat al-Mujtahid. " Islamic Law and Society, August, 1994, p. 193.
[2] . Watt, Muslim Intellectual..., p. 13.

**ئیبن تەیمییە، ئیبن خەلدون و مەقریزی**

لەگەڵ هاتنی ئەو سەردەمەی کە ئیبن تەیمییە (٧٢٨ك/١٣٢٨ز کۆچی دوایی کردووە) کتێبەکەی (کتاب المنطق)ی نووسی، بزووتنەوەی فەلسەفی بە هەموو شێوەیەك ڕەتدەکرایەوە، بە شێوەیەك گەیشتە ئەو ئاستەی بڵێن "لە ئیسلامدا فەلسەفە نییە"، هەروەها "فەیلەسوفەکانیش موسڵمان نین".[١] ئەمەش بە هۆی لێکدانەوەیان بۆ هۆ و ئەنجام نەبوو، بەڵکو بۆ قوڵبوونەوەیان بوو لە لێوردبوونەوە، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا پشتگیریی هەوڵدانی دەکرد بۆ سەلماندنی پەیوەندیی نێوان هۆ و ئەنجام، هێرشیشی کردە سەر ئەشعەرییەکان لەبەر نکووڵیکردنیان لە هۆکارە کاریگەرەکان و دەڵێت: "خەڵکی لە میانەی درککردنیان بە هەستەکانیان و فیکریانەوە، دەزانن کە هەندێ شت هۆکارن بۆ شتەکانی تر".[٢] هەروەها وا دەبینێت کە ئەوانەی نکووڵی لە هۆکارە کاریگەرەکان دەکەن، پێچەوانەی قورئان و سوننەت و کۆدەنگیی چاکەکارانی پێشوون.[٣]

بەڵام ئیبن خەلدون (٨٠٨ك/١٤٠٨ز کۆچی دوایی کردووە) — هەر خۆی باوەڕی بە مەزهەبی عەقڵانی هەیە و پشتگیری لە عەقڵ و

---

1. ابن تيمية، الإمام أحمد بن عبدالحليم. مجموع الفتاوى، شيخ الإسلام أحمد بن تيمية، تحقيق: عبدالرحمن العصيمي، الرياض: مطابع الرياض، ١٣٨١–١٣٨٣هـ/ ١٩٦١–١٩٦٣م،، بەرگ٩، ل١٨٦.

2. سەرچاوەی پێشوو ل٢٨٨.

3. سەرچاوەی پێشوو.

شـیکردنەوەی هـۆ و ئـەنجام دەکـات — زۆر بـە ئاگاییـەوە وەسـفی فەیلەسوفەکانی دەکرد، بەڵام لەگەڵ ئەوەشدا فەلسەفەی لەناو زانستە قبووڵنـەکراوەکان وەك: سـیحر و فاڵگرتنـەوە و خیمیـا (کیمیـای کـۆن) دادەنا. لە پێـشەکییەکەشیدا بەشـێکی بـە نـاوی (إبطـال الفلاسـفة)ەوە دانـاوە.[1] فەیلەسـوفەکان بـە دیـدی ئـەو دانیـان بـە سـنووردارییەتی خۆیانـدا نـەناوە، هەستیـشیان نـەکردووە کـە جیهـان زۆر گـەورە و فراوانترە لەوەی عەقڵی مرۆڤ و درکی هەستەکان بتوانێت بە تـەواوەتی وەری بگرێت یان تێی بگات. فەیلەسوفەکان وا نیشان دەدەن کە تـەنیا بە جێبەجێکردنی یاساکانی لۆژیك دەتـوانن بگەنـە ڕاسـتییەکی ڕەهـا، ئەمە تەنیا وتەی لەخۆباییبوونە.[2]

بەڵام مەقریزی (٨٤٦ك/١٤٤٢ز کۆچی دوایـی کـردووە) — وەك ئـیبن خەلدون زۆر بە ئاگاییەوە وەسفی فەیلەسوفەکانی نەکردووە — بەڵکو لە ئیبن تەیمییە زیاتر، فەیلەسـوفەکانی لـەناو چـینی یـاخیبوو لـە ئـیسلام دانـــاوە.[3] ئـــەم تاوانبارکردنـــە لەوانەیـــە بەســـەر هەنـــدێ گـــومڕادا

---

1. "المقدمة" لاپەڕەکانی ٥١٤–٥١٩ (وەرگێڕانی ڕۆزنتال بەرگ٣، ل٢٤٦–٢٥٨) ئیبن خەلدون (الالهیـات) و سیحر و جـاد و خیمیـا (کیمیـای کـۆن) و فەلـسەفە و فاڵگرتنـەوە لـە ڕیـزی زانستە قبووڵنـەکراوەکان دادەنێت (لاپەڕەکانی ٤٩٥–٥٣١)، لەگەڵ ئەوەشدا ئیبن ڕوشد لە (تهافت التهاقت)دا ڕەخنەی زۆری لـەم زانستانە گرت، بە شێوەیەك کە ئاستەکەی لە شێوەکەی ئیبن خەلدون کەمتر نییە. بڕوانە:
– ابن رشد، تهافت التهافت، سەرچاوەی پێشوو ل٥١.

2. "المقدمة" لاپەڕەکامی ٥١٤–٥١٩ (وەرگێڕانی ڕۆزنتال)، هەروەها بڕوانە:
-De Boer, T. J. The History of Philosophy in Islam, p. 202.

3. المقریزی، الخطط المقریزیة، سەرچاوەی پێشوو، بەرگ ٢ ، ل ٣٤٤.

نەچەسپێت، لەناویاندا ئـیبن ڕاوەنـدی، بـەڵام زۆربـەی هـەرەزۆریان بـە موسوڵمانی ڕاستەقینە مانەوە و وا دادەنرێـت کـە هـەر لـەناو سـنووری ئیـسلامدا ماونەتـەوە، بـەڵام پـەڕگیری و دەمارگیرییـان و بـەکارهێنانی هێـز، بـووە هـۆی ئـەوەی کـە ئـەو وێنانـەیان بکێـشرێت و کاردانـەوە بەرانبەریان هەبێت، وەسـفەکەی مـەقریزیش بـە وێنەیـەکی نـەرێنی بـۆ بزووتنەوەی عەقڵانی دادەنرێت.

## چوارەم: زیاتر ڕووکردنە کۆنە پارێزی (تەقلیدی)

وێنـەی نـەرێنیی فەیلـسوفەکان و فەلـسەفە، بـۆ جیهـانی ئیـسلامی کارەسات بوون، چونکە تەنیا بزووتنەوەی عەقلانییـەکانی لاواز نـەکرد، بەڵکو وردە وردە پاڵی بە جیهانی ئیسلامییەوە نا بۆ خـۆ بـەهێزکردنی زیاتر بەرەو کۆنەپارێزی (تەقلیدی) بچێت. هەروەها هێـز و ژیـاری لاواز بـوون، کـە دوو پێناسـەی بزووتنـەوەی زانـستی ئیـسلامی بـوون لـە سەردەمی ئومەوییەکان و سـەرەتای عەباسـییەکاندا، لـە کاتێکـدا هـیچ گفتوگۆیـەك بـە حـەرام دانـەدەنرا. تـەنیا فەلـسەفەش لـە بەرنامـەی خوێنـدنی خوێنـدنگا ئایینییەکانـدا هـەڵگیرا، بـەڵکو زانـستە سروشـتییەکانیش کـە پەیوەسـتبوون پێـوەی. سـەرەڕای ئەمـە، حکومەتـەکانیش گرنگییـەکی ئـەوتۆیان بـە فێربـوون و توێژینـەوەی زانستی نەدەدا، هەر وەك لە سەدەکانی یەکەمدا، بۆیە گۆڕەپانەکـە بـۆ دواکەوتنی فیکر و تەکنۆلۆژیا لە جیهانی ئیسلامیدا فراوان بوو.

ئەگـەر بمانـەوێت زانایـانی موسـڵمان لـەو ماوەیـەدا بـە پێـی پابەنـدبوونیان بـە مەزهـەبی عـەقلانی یـاخود مەزهـەبی کۆنـەپارێزی (تەقلیـدی) پـۆلێن بکـەین، هـەموو دەچـنە ڕیـزی ئـەم چـوار چـینەی خوارەوە:

أ‌- عەقلانییە پەڕگیرەکان، وەك: ئیبن ڕاوەندی و ئەبوبـەکری ڕازی، کە دەیانویست تەنها لـە ڕێگـەی عەقڵـەوە و بـە بـێ یارمـەتیی وەحـی، بگەنە هەموو ڕاستییە میتافیزیکییەکان.

ب– عەقڵانییە میانڕەوەکان، وەك: ئیبن ڕوشد، کە بڕوایان وابوو هەریەکە لە وەحی و عەقڵ پێویستن.

ج– کۆنەپارێزە (تەقلیدی) میانڕەوەکان، وەك: ئەشعەری و ئەلماتوریدی (٣٣٣ك/٩٤٥ز کۆچی دوایی کردووە)، غەزالی، دانیان بە ڕۆڵی عەقڵدا نا، بە پلەیەکی کەمتر لەوەی لای عەقڵانییە میانڕەوەکان.

د– کۆنەپارێزە (تەقلیدی) پەڕگیرەکان، وەك حەشویە: کە پێداگری لەسەر باوەڕهێنانی کوێرانە بە هەموو بیر و باوەڕە ئایینییەکان دەکەن، نکوولّی لە ڕۆڵی عەقڵ دەکەن تەنانەت ئەگەر بۆ ڕاڤەکردنی ئیمان و بەرگری لێکردنیشی بێت.

لەناو ئەم چوار چینەدا، عەقڵانییە پەڕگیرەکان و کۆنەپارێزە (تەقلیدی) پەڕگیرەکانیش پاشگەزبوونەوە، بەڵام کۆنەپارێزە (تەقلیدی) میانڕەوەکان سەرکەوتوو بوون، بە هۆی "نوێبوونەوەی ڕووداو لە مێژوودا".[1]

ئەوەی زیاتر کارەکەی کارەساتبارتر کرد، کۆنەپارێزە (تەقلیدی) میانڕەوەکان وردە وردە لەم سەدانەی دواییدا دەستیان بە جووڵە کرد، زیاتر بەرەو کۆنەپارێزی و نەجوڵان ڕۆیشتن، ئەمە لەو کاتەدا زەحمەت بوو – هەتاوەکو عەقڵانییە میانڕەوەکانیش – بە ئازادی هەناسە بدەن. لە سەدەکانی پێشوودا زانایانی وەك ئەشعەری و غەزالی و ئیبن ڕوشد و

---

1 . Reinhart, A. Kevin. *Before Revelation: The Boundaries of Muslim Moral Thought.* Albany: State University of New York, 1995, p. 183. )

زۆرێکی تـر، دەیـانتوانی زانیـاریی ورد و قـووڵ لـە هـەموو زانـستەکانی ئاینی و دونیایی وەربگرن، لەگەڵ ڕابووردنی کاتدا ئەمەش بە زەحمەت ئەنجام دەدرا. خوێندنی زانستەکان بە شێوەیەکی ئەوتۆ نەگەڕایەوە بۆ جیهانی ئیسلامی، تاوەکو ئیمپریـالیزم هـات. هەرچـەندە کۆکردنـەوەی هەردووکیان — کە کارێکی تا ڕادەیەك سروشتی و ئاسانە لە سەدەکانی ڕابـوردوودا — هێـشتا زەحمەتـە. ئەمـە بـووە یـەکێك لـە کاریگەرییـە یەکلاییکەرەوەکان لە هۆکارە بازنەییەکانی داڕمان.

## پێنجەم: جیاوازی لە نێوان هەردوو بزووتنەوەی ڕووناکبیریی ئیسلامی و ڕۆژئاوایی

ئەوەی زیانی بە بزووتنەوەی عەقڵانی گەیاند، سەرنەکەوتنی هەندێ لە پـەڕگیرەکان لـە مەزنـدەکردنی سـنووری عەقڵدا و لێنەبووردنیـشان بەرانبەر دوژمنەکانیان بوو. ئەوان هێزە داپڵۆسێنەرەکانی دەوڵەتیشیان بۆ سەپاندنی بیروباوەڕیان بەسەر زۆرینەی دانیـشتواندا بـەکاردەهێنا، ئەمە بووە هۆی بە سیاسی کردنی ئەو گفتوگۆیانـەی کـە لـە بنـەڕەت و ناوەرۆکـدا فیکـری بـوون، پاشـانیش نانـەوەی ڕق و کینـە و ڕاگرتنـی هەڵویستەکان. ئەمەش بە شێوەیەکی تایبەتی پێویستی بـە ناڕەحـەتی نـەدەکرد، چـونکە ئـەو بیروباوەڕانـەی دەسـەپێنران، لەگـەڵ هەنـدی بیروبـاوەڕی پەسـەندکراوی بنـەڕەتی ئیـسلامی نـاکۆك بـوون، کـە

دەتوانرێت بە عەقڵ بەرگریی لێ بکرێت.[1] لەو بارەیەوە گەورەترین زیان بە باوەڕبوون بە دروستکردنی قورئان (خلق القران) و شوێنکەوتووانی کەوت. ئەم ڕووبەڕووبوونەوەیەش کە بە شێوەیەکی دروستکراو ورووژێنرا، لە گفتوگۆیەکی بێ ئەنجامی چەند سەدەییدا بەشێك لە باشترین خاوەن عەقڵەکانی لە جیهانی ئیسلامیدا پێوە سەرقاڵ بوو، کە ئەو کاتە داگیرکەر بوون. گەر بهاتایە و هێز بەکارنەهێنرایە، ترس سەری هەڵنەدەدا و ڕووبەڕووبوونەوەش دروست نەدەبوو، هەڵوێستەکانیش ڕەق نەدەبوون و دابەشبوونیش – کە ناتوانرێت بوترێت تەنیا لە نێوان حکومەت و زانایان و لە نێوان فەلسەفە و ئاییندا – ڕووی نەدەدا. دواتریش دەرکەوت کە ئەم دابەشبوونە کارێکی دڵتەزێن بوو لە ڕەوڕەوەی پێشکەوتنی (فیقه) و زانستە سروشتییەکان لە جیهانی ئیسلامیدا.

بەم شێوەیە هۆیەکانی بزووتنەوەی "ڕووناکبیری" لە جیهانی ئیسلامیدا پێچەوانەی هۆیەکانی سەرکەوتنی بوون لە ڕۆژئاوا. ئەمەش لە ژمارەیەك خاڵدا دەردەکەوێت:

أ– لە پلەی یەکەمدا، گەندەڵی و زۆرداریی کەنیسە لە ڕۆژئاوا، دوو هۆ بوون بۆ سەرکەوتنی بانگەوازەکەی ڤۆلتێر (Voltaire) بۆ "ڕووخاندنی ئەو شتەی شوورەییە یان ئابڕووبەرە" کە گومان و

---

[1]. الغزالي، تهافت الفلاسفة، سەرچاوەی پێشوو، ل٢١٩–٢٢٠. هەروەها بڕوانە:

– أبو زهرة، تاريخ المذاهب الإسلامية، سەرچاوەی پێشوو بەرگ١، ل١٤٧–١٩٠.

دوودڵیــی لــەو بیروبــاوەڕە میتافیزیکییەکانــە دروســت کــرد کەنیــسە نوێنەرایــەتیی دەکــردن.[1] ڤـۆلتێر لـە نامەکەیـدا (نامەیـەك دەربـارەی لێبــووردن) دەڵێــت: "بەرگــەی شــتە نابــەجێکانی بیروبــاوەڕم دەگــرت، ئەگەر پیاوانی کەنیسە ئــەوەی لــە وتارەکانیانــدا دەیڵــێن، جێبــەجێیان بکردایە، ئەگەر بهاتایە و لێبووردنیان هەبوایە بەرانبەر ناکۆکییەکانیان، بــەڵام "کــارە وردەکــان ناتوانرێــت هــیچ ئاســەوارێکیان لــە ئینجیلــدا بدۆزرێتەوە، ئەمە سەرچاوەی ناکۆکییە خوێناوییەکان بوون لە مێژووی مەسیحیدا".[2] دیورانـت (Durant)یـش دووپاتیدەکاتــەوە و دەڵێــت: "دەتــوانرا کەنیــسە پارێزگــاری لــە بەربەســتەکانی ســەروو سروشــت (Supernatural) بکردایە، کە لە کتێبە عیبرییە پیرۆزەکاندا هاتووە لەگەڵ عاداتی مەسیحی، ئەگەر ئەوانەی نوێنەرایەتییان دەکرد، ژیانێکی باڵاپۆشی و لەخواترسانەیان هەبووایە".[3] بـە پێـچەوانەی ئەمەشـەوە، زۆربەی– ئەگەر هەمووی نەبێت – گەورە زانایـانی ئـایینی لـە جیهـانی ئیسلامیدا، وەك ئەبو حەنیفـە (١٥٠ك/٧٦٧ز کۆچـی دوایـی کـردووە) و مالیـك (١٧٩ك/٧٩٥ز کۆچـی دوایـی کـردووە) و شـافیعی (٢٠٤ك/٨٢٠ز کۆچی دوایی کردووە) و ئەحمەد کـوڕی حەنبـەل (٢٤١ك/٨٥٥ز کۆچـی

---

1 . Burtt, Edwin A. *The Metaphysical Foundations of Modern Science.* Garden City, New York: Doubleday, 1955, p. 237.

2 . Durant, Will. *The story of philosophy*, New York: Washington Square Press, 1970, p. 237. (cited from Voltaire, *Selected Works*, p. 62

3 . Durant, Will. *The story of philosophy*, Volume 5, p. 571.

دوایـی کـردووە)، کەسـانێك بـوون زۆر خواپەرسـت و ڕاسـتگۆ بـوون، لەلایەن گەلیشەوە جێگەی ڕێز و متمانە بوون، خاوەنی هیچ سەروەت و سامانێکی زۆر نەبوون، پلە و پایەی سیاسییان ڕەتـدەکردەوە، لەگـەڵ ئەوەی پۆستیان دەخرایە بەردەم بۆ بێدەنگکردنیان لە ڕەخنەگرتن لـە کردارە گەندەڵ و نائسلامییەکانیان.

ب- هەر وەك حـورانی (Hourani) ئامـاژەی پـێ داوە "ئیـسلامی ڕابەر (ڕێبازی باو orthodox Islam) ئەنجومەنە ئایینییەکان دیاری ناکەن، وەك لە مەسیحییەتدا هەیە، لەم جۆرە ئەنجومەنانە نەبەستراوە، لەبەر نـەبوونی چـینی قەشـە لـە ئیـسلامدا".[1] ئیـسلامی ڕابـەر یـاخود ئیسلامی تەواو، قورئان و سوننەت و کۆدەنگیی ئومەتی ئیسلامی دیاری دەکات، کە دەتوانرێت لە میانەی گفتوگۆی ئازادی زانایانەوە بەدی بێت – ئەوانەی هەر وەك لە فەرموودەی (صحیح)دا هاتووە و بە شێوەیەکی بـەرفراوان بـە نموونـەی دەهێنرێتـەوە – کـە نـەوەی پێغەمبـەرانن. هەوڵەکانی دەوڵەتیش کە دەیویست ناوەرۆکی شەریعەت دیـاری بکـات، بە کۆتایی کارەساتەکە ئـەویش کۆتـایی هـات.[2] لـە کاتێکدا بیرمەنـدە ڕۆژئاواییەکان گومانیان لە ڕاستیی کتێبی پـیرۆز هـەبوو، موسـڵمانەکان هـەر وەك ئەنـساری (Ansari) دەڵێـت: "بـاوەڕدەهێنن بـە پیرۆزیـی

---

[1] . Hourani, Averroes on the Harmony of Religion and Philosophy… p. 29.

[2] . Hinds, "Mihna. " P. 6.

دەستەڵاتی قورئان و وسوننەتی پێغەمبەر".[1] ماوەیەکی دوورودرێـژە، هەموو بیروباوەڕەکان و پەرستشە ئایینییەکان و یاساکان، لەو دووانەوە وەرگـیراون. زانایـانیش کـە کۆدەنگییـان پاڵپـشتە بـە بیروڕاکانیـان، بیروڕاکانیـشیان بەسـەر خەڵکـدا دەسـەپێنن. لـە ڕاسـتیدا خـەڵکانیش بیروڕاکانیان بۆیە وەردەگرن، چونکە هاوڕان لەگەڵ قورئان و سوننەتدا، سەرەڕای بەهێزیی لۆژیکییان و متمانەیان بە خواپەرستی و ڕاستگۆیی و زانستییان.

ج– لـە کاتێکـدا کەنیـسە لـە ڕۆژئـاوا، پـەنای بـۆ دادگـای پـشکنین (Inquisition) برد، عەقڵانییەکانیش لە جیهانی ئیسلامیدا بە هەمان شێوە پـەنایان بـۆ بـرد. ئەگەرچـی بـەکارهێنانی هێـز ناگاتـە دڵڕەقیـی کەنیسە، وەك سووتاندنی مرۆڤـ کە کەنیسە پەنای بۆ دەبرد، ئەمـە بـە هیچ شێوەیەك لە ئیسلامدا ڕووی نەداوە. لەگەڵ ئەوەشدا کارەسـاتەکە کاردانەوەیـەکی ناتەندروسـتی بەجێهێـشت، چـونکە – بـە شـێوەیەکی گـشتی – توندووتیـژی مـل بـەرەو کاردانـەوەی تونـد دەنێـت، وا لـە گۆشەگیرەکان دەکات پەنا بۆ پەڕگیری ببەن. بەکارهێنانی لـە ڕۆژئـاوا، زیانی بە ئایین گەیاند، بەکارهێنانیشی لەلایەن موعتەزیلەوە، زیـانی بـە مەزهەبی عەقڵانی لە جیهانی ئیسلامیدا گەیاند، لەگەڵ ئەوەی ڕێگـە بـە

[1] . Ansari, Zafar Ishaq " The Contribution of the Qur'an and the prophet to the Development of Islamic Fiqh. " *Journal of Islamic Studies,* July, 1992, p. 157.

مشتومڕ درا لە نێوان موعەتەزیلەکاندا کە زۆرێك لەوان زانای ئایینی بوون و ڕێزی تایبەتییان لێ دەگیرا، کۆنەپارێزە (تەقلیدی)یەکان بە سەربەستی ئەنجام بدرێت دوور لەبەرکارهێنانی هێز، ئەو کاتە باشتر دەبوو بۆ هەردوو تیمەکە و زیاتر بیروڕاکان یەکانگیر و هاوسەنگ دەبوون.[1]

کەنیسە بریتی بوو لە ژمارەیەك بیروباوەڕ کە بە پێی عەقڵ ناتوانرێت بەرگرییان لێ بکرێت، هیچ بنەمایەکیشیان لە ئینجیلدا نییە. هەروەها هەندێ بیروڕای پەرگیری فەیلەسوف و موعتەزیلەکان هەیە کە هیچ بنەمایەکیان لە قورئان و سوننەتدا نییە و ناوتوانرێت بە پێی عەقڵ بەرگرییان لێ بکرێت. بە بەراوردیش ئەو بیروباوەڕەی زاناکان و خەڵکیش باوەڕیان پێی هەیە، ڕەسەنایەتی لە قورئان و سوننەتدا هەیە و تێگەیشتنیشیان ئاسانە.

---

[1]. روبیرت وابلز (Robert Whaphes)، کە من سوودێکی زۆرم لە تێبینییەکانی لەسەر ئەم ڕەشنووسە بینی، وای دەبینێت کە "کەنیسە بە تەنیا نەیدەتوانی ئەمانە بکات. زۆری ئەو دەستەڵاتەش دەوڵەت پێی بەخشیبوو، بە تایبەتی کاتێك دادگای پشکنین لەوپەڕی هێز و توانایدا بوو، بۆ نموونە "ئایبیریا" ئەمەش ئەوە دەگەیەنێت کاتێ دەوڵەت دەچێتە پاڵ کۆنەپارێزە(تەقلیدی) یاخود عەقڵانییەکان بۆ کپکردنەوەی سەربەستیی بیروڕا لە هەموو کێشەکاندا، لەوانەیە ئەنجامی زۆر خراپیشی لێ بکەوێتەوە".

## شەشەم: ئایندەی مەزهەبی عەقلانی لە جیهانی ئیسلامیدا

ئێستا دێینە سەر کاری یەکلاکەرەوە دەربارەی ئەوەی، ئەگەر لە جیهانی ئیسلامیدا سەرلەنوێ توێژینەوەی زانستی بێتە کایەوە، ئایا دەبێتە هۆی دروستبوونی ململانێ لە نێوان عەقڵ و وەحیدا، کە ببێتە هۆی دروستبوونی گۆڕانێك لە نموونەکەدا، هەر وەك چۆن لە ڕۆژئاوا ڕووی دا؟ دووپاتیدەکەینەوە کە نموونە ئیسلامییەکە مەرجی ئەوەی تێدا نییە کە ململانێ لە نێوان عەقڵ و وەحیدا ڕوو بدات.

لە هەردوو سەدەکەدا، یەکەم و دووەمی ئیسلامی، مشتومڕی ئازاد لە هەموو بابەتەکاندا کە کێشەیان لەسەر بوو، دەکرا، هەر وەك ئیبن تەیمییە دەڵێت، هیچ فەقیهێك نییە، بە لەبەرچاونەگرتنی کەسەکە کێ بێت یان کێ نەبێت، لەو کاتەدا وا دادەنرا کە ئەو مافی خۆیەتی بیروڕاکەی بسەپێنێت بەسەر خەڵکانی تردا، یاخود زۆریان لێ بکات لەسەر مەزهەبەکەی ئەو بن.[1] هەتاوەکو دەستەڵاتداریش ئەم تایبەتمەندییەی نەبوو، چونکە ئەویش یەکێك بوو لە موسڵمانان، تەنیا گەر بیتوانیایە بە لۆژیك و فیکر گفتوگۆی لەگەڵ بکردنایە بۆ سەلماندنی بیروڕاکەی و هیچی تر.[2] دیارە هەر ئەم هۆیە بوو وای لە ئیمامی مالیك کاتێك خەلیفە هاروونە ڕەشید (١٩٣ك/٨٠٩ز کۆچی دوایی کردووە) ویستی هەموو دەستوپێوەندی خۆی دوای ئیمام مالیك بکەون،

---

1. ابن تیمیة، مجموع الفتاوی، سەرچاوەی پێشوو، بەرگ ٣٠، ل٨٠.

2. سەرچاوەی پێشوو، بەرگ ٣٥، ل٣٦٠.

ئامۆژگـاریی کـرد کـە ئـەو کـارە نـەکات.[(١)] ئەمـەش پێچەوانەی گیـانی ئازادیی ڕادەربڕینە لە ئیسلامدا. هەر ئەم ماوەیە بوو کە تیایـدا (فیقـه) گەیـــشتە لووتکـــەی پێـــشکەوتن.[(٢)] ئەگـــەر موعتەزیلـــەکان بـــەم دەستپێـشخەرییە لـە کۆمـەڵگای ئیـسلامیدا پابەندبوونایـە، لەوانـەبوو ئەوەی کە ورووژاندیان، نەبووایەتە هۆی توڕەیی و هەڵچوون و ململانێی نێوان عەقڵانی و کۆنکارە (تەقلیدی)یەکان، کە شێوەیەکی دوژمنکـاریی شەڕی گرتەخۆ، بۆیە هیچ هۆکارێك نەبوو بۆ ئەمە، لەبەر دوو هۆ:

أ- قورئان خودی خـۆی بـە تونـدی دووپـاتی بـەکارهێنانی عـەقڵ و بینین دەکاتەوە. ئەمەش لە دووپاتکردنـەوەی نووسـینی موسـڵمانەکان بە درێژایی مێژوو بە ڕوونی دەردەکەوێت. بۆ نموونە، ئیبن تەیمییـە بـە ڕوونی دووپاتی دەکاتەوە کە لێوەرگرتن یان لێدەرهێنان لە بیروباوەڕ و نوێژ و بـەهاکانیان لـە قورئـان و سـوننەت و کۆمکـاری ئومـەت "نـاکۆك یاخود دژ نییە لەگەڵ عەقڵ، چونکە بە ڕاشکاوانە هەر شتێك پێچەوانەی عـەقڵ بێـت، ئـەوا ناڕەوایـە.[(٣)] هـەروەها گفتوگـۆی ئەوەشـی کـردووە، خەڵکی لەوانەیـە تێنەگـەن کـە دەقـەکانی قورئـان و سـوننەت لـە وشـە پێکهاتوون و لەوانەیە بە شێوەیەکی هەڵە لەو وشـانە تێگەیـشتبن، یـان

[1]. سەرچاوەی پێشوو، بەرگ ٣٠، ل٧٩.

[2]. الزرقا، مصطفى أحمد . الفقه الإسلامي في ثوبه الجديد، دمشق، مطابع أ لف باء الأديب، ١٩٦٧م، بەرگ ١، ل١٤٧و١٧١.

[3]. ابن تيمية، مجموع الفتاوى، سەرچاوەی پێشوو، بەرگ ٣٠، ل٨٠.

به شێوەیەکی هەڵە ڕاڤەیان بۆ کردبێت، بۆیە گرفتەکە لای ڕاڤەکەرانە نەك لە قورئان و سوننەتدا.[1] مستەفا زەرقا (خوا لێی خۆش بێت) – زانایەکی بەناوبانگە تا ئاستێکی بەرز ڕێزی لێ دەگیرێت – ڕوونیدەکاتەوە کە "هەرچی پێچەوانەی عەقڵ بێت، لە ئیسلامدا جێگەی نابێتەوە". [2] سەرەڕای ئەوەش، تاوەکو ئێستا شتێك لە قورئان و سوننەتدا نییە لەگەڵ هەر ڕاستییەکی چەسپاو و بیردۆزێکی زانستیدا ناکۆك بێت".

ب– موعتەزیلەکان، شتی زۆریان کرد بۆ بەرگریکردن لە ئیسلام دژی گومڕاکان، زۆرێکیش لە بیروڕاکانیان لەگەڵ قورئان و سوننەتدا گونجاو بوون.[3] ئەگەر هیچ ناکۆکییەکیش لە ئەنجامی حاڵەتی زیادەڕۆیی و لێکۆڵینەوەدا ڕووی نەدایە، لەوانەیە گفتوگۆی هەموو کێشەکان تا ڕادەیەك بە ئازادی بکرایە، لەوانەیە هەتا ئاستێك عەقڵانییە میانڕەوەکان، وەك ئیبن ڕوشد و کۆنەپارێزە (تەقلیدییە) میانڕەوەکان و ئەشعەرییەکانی وەك غەزالی، بە یەکەوە بگونجانایە. لەوانەیە بوونی گفتوگۆیەکی ڕوون و ئاشکرا و عەقڵانی لە نێوانیاندا یارمەتیدەر بووایە – بە تێپەڕبوونی کات _ بۆ چارەسەرکردنی هەموو ئەو ناکۆکییانەی هەبوون. لەوانەش بوو ببێتە هۆی ئەوەی کە زەحمەت بێت

---

1. سەرچاوەی پێشوو، بەرگ ١، ل٤٩٠.
2. الزرقا، مصطفى أحمد . العقل والفقه في فهم الحديث، دمشق، دار القلم، ١٩٩٦م، ل١٤.
3. أبو زهرة، تاريخ المذاهب الإسلامية، سەرچاوەی پێشوو، بەرگ ١، ل١٩٠.

ئەشعەرییەکان لە دواییدا ئارەزوویان بە لای زیادەڕۆیی لە کۆنەپارێزیدا هەبووایە، تووشی نەجوڵان و بەکارهێنانی هێز بە هەمان شێوەی بەکارهێنانی موعتەزیلەکان بۆ پاڵپشتی بیروبۆچوونیان و بڵاوکردنەوەیان بکردنایە.[1] مانەوەی هەریەك لە عەقڵانییە میانڕەوەکان و کۆنەپارێزە (تەقلیدییە) میانڕەوەکان، دەتونرا وەك هێزێکی هاوسەنگ کار بکات و کاریگەرییەکی تەندروستی باشی لەسەر کۆمەڵگای ئیسلامی و زانست دەبوو، دەتوانرا ئاوێتەبوونێکی تەواوی خوێندنی ئایینی بە ئەنجام بگەیەنن، هاندەر و هاوکاری پێشکەوتنی زیاتر بۆ لیبراڵییەتی (فیقه) و زانستە ئایینی و زانستە دونیاییەکان لە جیهانی ئیسلامیدا بن.

ئەوەی لە ئەنجامی حاڵەتەکانی زیادەڕۆیی ڕووی دا، کە موعتەزیلە پەیڕەویان دەکرد، کەشی ئازادیی فیکری تێکدا، کە لە سەدەکانی پێشوودا ئاسایی بوو. ئەمەش وای لە میلی کاتژمێرەکە کرد کە بە پێچەوانەوە بسووڕێتەوە، وای لێهات هەموو بیرکردنەوەیەکی ئازاد جێی گومان بوو، بووە بەرهەمهێنی زیادەڕۆییەکی زیاتر لە بەئاگابوون و خۆپاراستن لە دەربڕینی بیروڕا دەربارەی کێشە ئایینییەکان. بەم پێیە،

---

[1]. بۆ زانینی زیاتر دەربارەی بەکارهێناتی هێز لەلایەن ئەشعەرییەکانەوە، بڕوانە:

- المقریزی، الخطط المقریزیة، سەرچاوەی پێشوو، بەرگ ٢، ل٣٥٨.

**زیان بەر ئیجتیهاد کەوت، بەڵام خۆشبەختانە بە تەواوەتی نەوەستا.[(١)] هەمیشە دەنگەکان بەرزدەبوونەوە و داوای ئیجتیهادیان دەکرد، زانایانی گەورە و بە توانا و داهێنەر و خاوەن ڕێز، بەردەوامبوون لەسەری، ئەگەرچی بەو ئاستە نەبوو کە لە سەدەکانی پێشوودا دەکرا.[(٢)]**

**سەرەڕای حاڵەتەکانی زیادەڕۆیی کە موعتەزیلە پەیڕەویان دەکرد، کاریگەریی تریش هەبوون کە هاوکاربوون بەرەو نەبزووتن و کۆنەپارێزی، ئەو کاریگەرییانەش ئەمانەن:**

**- ئارەزووی کەسانێکی تایبەتی سیاسەتمەداری ناشەرعی و گەندەڵ لە دەرکردنی فەتوا لەلایەن زانا ئایینییەکانەوە بۆ ڕێگەپێدان بە ناشەرعییەتیان و باجە قورسەکانیان کە سەپاندبوویان. بۆیە محەمەد ئیقبال (١٣٥٧ك/١٩٣٨ز کۆچی دوایی کردووە) – فەیلەسوف و**

---

[1]. Hallaq, Wael B. " Was the Gate of Ijtihad Closed?" Journal of Middle East Studies, March, 1984, p. 3-41; See also Zebiri, Kate. Mahmud Shaltut and Islamic Modernism. New York: Oxford University Press, 1993, p. 136.

[2]. برنارد لویس (Bernard Lewis)دانی پێدا دەنێت کە " یاسای ئیسلامی بێجوڵە نەبوو، کەوتە ژێر پێشکەوتنێکی دوورودرێژو گرێیاویەوە. سەیرکردنێکی وردی دەستنووسە دادوەرییەکان لەوانەیە بمانگەیەنێتە زانیاری بە نرخ دەربارەی بارودۆخی جۆراوجۆرو پاڵەپەستۆو کاریگەرییەکان کە ڕووبەڕووی زانا ئایینییەکان دەبوویەوە. بڕوانە :

- Bernard Lewis, "Sources for The Economic History of the Middle East", In Cook, M. A. , (ed. ) *Studies in the Economic History of the Middle East* …, p. 91.

شاعیرێکی نیمچەکیشوەری هیند و پاکستانییە – کاتێ دەڵێت: "لە ڕووانگەی مەترسیی بیرمەندە کۆنەپارێزە (تەقلیدییە) ئیسلامییەکان لە کەڵەکەبوونی بێهێزی و پەرت پەرتبوون، شتێکی سروشتییە لە ئەنجامی لاوازیی سیاسی هەموو هەوڵەکانیان لە یەك خاڵدا کۆبکەنەوە کە پەیوەستە بە پارێزگاریکردن لە ژیانی کۆمەڵایەتی و یەکریزی گەل، لە میانەی بەئاگابوونێکی تەواو لە دوورخستنەوەی هەموو نوێکارییەك لە یاسا و شەریعەتدا، بەگوێرەی ڕاڤەی زانا پێشووەکانی ئیسلام بۆ ئەم دووانە. بیری سەرەکیشیان لە سیستمە کۆمەڵایەتییەکەدا خۆی دەبینییەوە، ئەوەی گومانی تێدا نییە لە بەشێکیدا بۆچوونەکەیان ڕاستە، چونکە ڕێکخستن تا ڕادەیەك بەرانبەر هێزی پەرت پەرتبوون دەوەستێت".[1]

– کاریگەریی دووەم کە کۆنەپارێزیی بەهێز کرد، خۆی لە دەستبەسەراگرتنی بیانیدا دەبینێتەوە، سەرەتا بە مەغۆلەکان، کە بووە هۆی دروستکردنی ترس لەوەی داگیرکەرانی بیانی هەوڵ بدەن هەندێ لە زانایانی ئایینی بۆ دەرکردنی هەندێ بڕیار لە خزمەتی بەرژەوەندییەکانیاندا بەکاربهێنن و بەرنامەی شەریعەتیش بگۆڕن.

– کاریگەری سێیەمیش بریتییە لە دارمانی گشتگیری جیهانی ئیسلامی. چونکە پێشکەوتنی فیکری، هەر وەك ئیبن خەلدون ئاماژەی

---

[1] . Iqbal, Muhammad. *Reconstruction of Religious Thought in Islam*. Lahore: Shaikh Muhammad Ashraf, 1954, p. 151.

پیٚ دا، ئەگەر کۆمەڵگا خۆی پێشنەکەوێت، ڕوو نادات.[1] فیقهیش بەدەر نییە لەم حاڵەتە، ئەمیش هەر دەبێت لە حاڵـەتی وەسـتاندا بێـت کاتـیٚ کۆمەڵگای ئیسلامی بەرەو داڕمان دەچێت، ئەو ژینگەیە شیاو نەبوو بـۆ داهێنانی فیکری و هەر گۆڕانێکیش بکرایـە بـە هەڵوێـستی دوژمنکارانـە ڕووبەڕووی دەبوونەوە، بە بیٚ ڕەچاوکردنی ئەوەی ئایا لەگەڵ شەریعەت دەگونجێـت یـان نـا. ئـیبن تەیمییـە و شـا وەلی الله دەهلـەوی (١١٧٦ك/١٧٦٢ز کۆچی دوایی کردووە)– هەردووکیان زانای داهێنـەر و تا ڕادەیەك لیـبراڵین، ئەگـەر بـەراورد بکـرێن بـە مەزهەبـە فیقهییـە بـیٚ جووڵە و وشکەوەبووەکان کە ئەو کـات هـەبوون – بـەرگریی گـەورەیان کردووە بە هـۆی بیروبـاوەڕە بێلایەنـەکانیان و پەیوەسـت نـەبوون بـەو بیروبۆچوونانەی ئەو کات هەبوون. بەڵام شا وەلی الله دەهلەوی، بە هۆی وەرگێڕانی قورئان بۆ زمانی فارسی، ڕووبەڕووی بەرهەڵـستییەکی تونـد بووەوە، هەروەها کوڕەکانیـشی ڕووبـەڕووی هـەمان شـت بوونـەوە کـە قورئانیان وەرگێڕایە سەر زمانی ئوردی [2]، لەبەر ئەوەی حکومـەت نـە

---

1. ابن خلدون، المقدمة، سەرچاوەی پێشوو، ل٤٣٤.

2. لەگەڵ ئەوەی ئەم بەرهەڵستی کردنەی وەرگێڕانی قورئان، ئێستا بە کارێکی نالۆژیکییانە دادەنرێـت، ئەو کاتە وەك ئێستا نەبووە، هەر وەك ئەربیری دەربارەی ئەم شتە لە پێشەکیی وەرگێڕانەکەیدا دەڵێت: "ئەگەر قورئان بە لای ئیماندارانـەوە بـە ڕاسـتی وشـەی خوایـە، هـەر لـە سـاتەکانی یەکەمـەوە بـیروڕای تەقلیدییەکان دەڵێت نابێت وەربگێڕدرێت، چونکە پەرجووی ئاخاوتنە و کوفرە هـەوڵی لاسـاییکردنەوەی بدرێت". بڕوانە:

-Arberry, A. J. The Koran Interpreted. London: Oxford University Press, 1964, p. ix.

بە ئەرێنی و نە بە نەرێنی، بەشداریی نەکرد. لەو کاتەدا زیاتر بیروڕای عەقڵانییەت بڵاوبوو، تا ئاستێکیش کەس نەبوو — لە میانەی بیروباوەڕەوە _ هەڵەیەك یان شتێك کە لێی بگیرێت، لە وەرگێڕانی قورئاندا بۆ هەر زمانێکی تر بدۆزێتەوە.

بەم شێوەیە عەقڵ دەتوانێت ڕۆڵی گەورە لە سەرلەنوێ ڕێکخستنەوەی کۆمەڵگای ئیسلامی بگێڕێت، بێ ئەوەی بەرکەوتن لەگەڵ وەحی ڕوو بدات، بە مەرجێ هیچ لایەك، دەوڵەت و عەقڵانییەکان و کۆنەپارێزەکان (تەقلییدیەکان)، خۆی بەسەر ئەوی تردا نەسەپێنێت و لە ڕووبەڕووبوونەوە و بەکارهێنانی هێز دووربکەونەوە. سەرەڕای نزمبوونەوەی پلە و پایەی زانایان — بەهۆی باری ئابووری— کۆمەڵایەتی دابەزیویانەوە و پێویستییان بە زانستی نوێ — بەڵام دەستەڵاتیان لە ناساندنی ئیسلام لە جیهانی ئیسلامیدا بەردەوام بووە، هەر وەك گیب (Gibb) لە ساڵی ١٩٤٧ز دانی پێدا دەنێت و دەڵێت: "ئایندەی ئیسلام هەر وەك ڕابووردوو دەمێنێتەوە، پشت بە کارامەیی سەرکردە تەقلیدییەکان (لایەنی باو لەو کاتەدا) و توانایان دەبەستێت لە چارەسەرکردنی گرژی و ئاڵۆزیی نوێ، کە لە ئەنجامی بیروباوەڕێکی ئەرێنی بەرەوڕووی ئەو هێزانە دەوەستێتەوە کە کار بۆ نەهێشتنی و دەستبەسەراگرتنیدا دەکەن".[1] تاقیکردنەوەکانی مێژوو بەڵگەن لەسەر

---

[1] . Gibb, H. A. R. *Modern Trends in Islam*. Chicago: University of Chicago Press, 1947, p. 122.

ئەوەی ئەگەر سەرکردایەتیی سیاسی هەر وەك خەلیفەکانی عەباسی، [1] هەوڵی دا بیروڕایەك بسەپێنێ کە زانایان بزانن بە ئاشکرا لەگەڵ ڕۆحی ئیسلامدا ناکۆکە و کۆتاییەکەی دەبێتە هۆی دروستبوونی تورەیی و گرژی لە هەڵوێست و دروستبوونی ناکۆکی و مشتومڕ، هەر وەك لە ڕابوردوودا ڕووی دا[2]، بێگومان لە ئەنجامی ئەم ناکۆکییە کرداری گۆڕان و پێشکەوتن لە جیهانی ئیسلامیدا خاودەبێتەوە.

حەفتا ساڵ سەپاندنی عەلمانییەت بە هێز لە تورکیا، باوەڕی گەلی بە ئیسلام لەق نەکرد، بەڵکو ئێستا کرداری زیندووکردنەوەشی هەیە. هەروەها هەندێ ڕژێمی دکیتاتۆری تر لە وڵاتە ئیسلامییەکاندا هەوڵ دەدەن کۆپیی تایبەتی ئیسلامی خۆیان بەسەر گەلدا بسەپێنن، ئەمەش لەوانەیە سەرکەتوو نەبێت. گفتوگۆی ئازاد و هێمن و لەسەرخۆ، بێ

---

[1]. ڕیچارد ئەنتۆن (Richard Antoun) تێڕوانینێکی جوانی دەربارەی ڕۆڵی یەکلاییکەرەوەی زانایان هەیە. هۆشداری دەدات دەربارەی "متمانەیەکی زیاد لە پێویست بە دەستەڵاتی دەوڵەت و پلەوپایەی کەسانی سیاسی، ئەمەش بۆ ئەو پەیوەندییە نەپچڕاوە دەگەڕێتەوە لە نێوان زانایان و زۆربەی هەرە زۆری دانیشتووانی موسڵماناندا" بڕوانە:

-Binder, Leonard. Ideological Revolution in the Middle East. New York, Leiden: Brill, 1964, p. 24.

[2]. دیل ئیکرمان (Dale Eickerman) دەڵێت "توخمێك هەیە لە ناخی ئیسلامدا کە پێناسەی ئایینە، ئەویش لە ڕێزگرتن لە لایەنی ئیمان و کارە ئایینییەکاندا خۆی دەبینێتەوە کە هەمیشەیی و نەگۆڕن" بڕوانە:

-Binder, *Leonard. Ideological Revolution in the Middle East*. New York, Leiden: Brill, 1964, p. ٣٠٥.

ئــەوەی هێــرش بکرێتــە ســەر بنــەمای ئیــسلامی کۆمــەڵگا، بــۆ چارەســەرکردنی هــەموو کێــشەکان پێویــستە. قورئــان و ســوننەت، هــەردووکیان بەشــێکی بنــەڕەتین لــە نموونــەی ئیــسلامی، هــەر کــەس پێـشنیار دەکـات وازیـان لێبهێنرێـت، یـاخود تـەنیا هـەر سـوننەت، بـۆ بنیاتنانەوەی کۆمەڵگای ئیسلامی، بێگومان کاردانەوەیەکی پەڕگیرانەی لێ دەکەوێتەوە. وا دەردەکەوێت نەرمینواندنی زۆر لە تەفـسیردا لـەناو خودی شـەریعەتدا ئاسـاییە، بـەڵام هەڵوێـستێکی پـەڕگیر لـەم شـێوەیە ئاسانکار نییە و پێویستیش ناکات. ئەوەی پێویستە دەوڵـەت ئـەنجامی بــدات، کارئاســانی بــۆ گفتوگــۆی ئــازاد و کــراوە لــە نێــوان هــەموو عەقڵانییــەکان و کۆنــەپارێزەکان (تەقلیدیــەکان)، هــەر کامێکیــشیان بیروڕاکانیان زیاتر قەناعەتی پێ کرا و زۆرینەی بەدەستهێنا، سەرکەوتن بۆ ئەو بێت.

ئەگەر زانایان لێبووردە نەبوون و کاردانەوەکانیشیان – لەبری ئـەوەی ئامادەبن واز لە گۆشەگیری و نەرمی نەنواندن بهێنن – بۆنی دوژمنایەتی و زبری لێبێت لەبەرانبەر ئـەو بابەتـە میانڕەوانـەی لـە بـیری عەقڵانییەکانـدا هەیـە، کـە پێویـستە بـۆ (فیقـە) بـۆ ئـەوەی بتوانێـت بەرپەرچـی ئـەو بەربەرەکانییانەبداتەوە کە ڕووبەرووی ئومەتی ئیسلامی دەبێتـەوە، ئـەو کاتـە کاردانـەوەی نـەرێنی دروسـتدەبێت. ئەمـە لەوانەیـە وا بکـات میلـی کاتژمێرەکـە بـە لای عەقڵانییـە پەڕگیرەکانـدا بـسوورێتەوە، هـەر وەك لـە ڕۆژئـاوا ڕووی دا، پاشـانیش زیـان بـە ئیـسلام و پلـە و پایـەی خـودی

زانایـانیش دەگەیـەنێت. بـۆ ڕێگـەگرتن لەمـە، لەوانەیـە هێنانـەناوەوەی زانستە نوێیەکان بە سوود بێـت، سـەرەڕای زمـانێکی ڕۆژئـاواییش بـە لای کەمـەوە، بـە تایبـەتی ئینگلیـزی، ببنـە بابـەتێکی ئیجبـاری لـە پرۆگرامـی هـەموو دەزگـا فێرکردنـەکانی ئیـسلامیدا، فێرکردنـی ئـایینیش بەشـێکی بنـەڕەتی بێـت لـە فێرکردنـی نوێـدا. ئەمـە لەوانەیـە یارمەتیـدەر بێـت بـۆ هێنانەکایـەی ژینگەیـەکی باشـتر و گونجـاوتر بـۆ گفتوگـۆ لـە نێـوان دەرچـووانی دەزگـا ڕۆژئـاویی و ئایینییەکانـدا و ببێتـە هـۆی زیـاتر لێکتێگەیشتنی بەرانبەر و گفتوگۆی پڕ مانا بۆ گشت بابەتەکان.

خۆشـبەختانە نـەجوڵانی زانایـان وردە وردە و بـە ڕابـوردنی سـاڵ لاواز دەبوو، لە ئەنجامی هەوڵی جەمالەددینی ئـەفغانی ١٣١٥ك/١٨٩٧ز کۆچـی دوایی کردووە) و محەمەد عەبدە (١٣٢٣ك/١٩٠٥ز کۆچی دوایی کردووە) و محەمەد ئیقبال (١٣٥٧ك/١٩٣٨ز کۆچـی دوایـی کـردووە) و ژمارەیـەك لـە زانایـان و چـاکەخوازی خـاوەن زانیـاری، ئەوانـەی ڕێـز و شـکۆیان هەیـە. زانایان هەر خەریکی خودی مشتومڕی بێزەنتی (درێـژدادڕی) نـەبوون، کـە لـــە ڕابـــوردوودا پێـــوەی خـــەریك بـــوون. وردە وردەش خـــەریکی زیندووکردنەوەی دەزگای ئیجتیهاد بوون، تـەنیا بیرکردنـەوەی لیبراڵـی لـە سنووری شەریعەتدا نـاڕەزایی و کاردانـەوەی نـەرێنیی دروسـت نـەدەکرد، هەر وەك – بۆ نموونە – لـە سـەدەی هەژدەیـەمی زایینیـدا لـە ژیـانی شـا وەلی اللە دا ڕووی دا. وا دەردەکەوێت زانایان هەسـتیان کـرد – ئەگـەر بـە شـێوەیەکی تـەواویش نـەبووبێت – کـە جیهـان بـە شـێوەیەکی بنـەڕەتی بەرەو پێشەوە ڕۆیشتووە لە ڕۆژانی کورتـە فیقهـی کلاسـیکی (تەقلییـدی/

کـەلتووری)یـەوە بـەم پێیـە، وا دەردەکـەوێت کـە هەڵوێـستی نـەجووڵانی فەقیهەکان، کە لەبارەی هەندێ کێشەوە وەریـان دەگـرت، وردە وردە لـە پاشەکشەدا بوون و بیروڕای تا ڕادەیەك زیاتر لیبڕاڵی جێگەی دەگرتنـەوە، نەك تەنیا دەتوانراو نـاکۆك نـەبوو لەگـەڵ قورئـان و سـوننەتدا، بـەڵکو بـە هۆی گۆڕانی بارودۆخەکەوە پێویستیش بوو.

نـــەبوونی دەســـتەڵاتێکی ئـــایینیی یـــەکگرتووی بـــاڵا، یـــاخود ئەنجومەنێکی ئایینی، سوودێکی گەورەی دەبوو، بۆ ئەوەی بتوانرێت لە سـێبەری بیروڕایـەکی لیبڕاڵـی و بیروڕایـەکی کۆنـەپارێز (تەقلییـدی)دا، کاریگـەرییان لەسـەر یەکـدی دەربـارەی هـەموو بابەتـە شـەرعییەکان هەبووایە. سەربەخۆیی زۆربەی هەرە زۆری وڵاتـە ئیـسلامییەکان لـەژێر دەستەڵاتی بیانیـدا، کـە پێویـستییەکی زۆری دروسـت کـرد دەربـارەی دۆزینەوەی چارەسەر بۆ هەموو کێشە جیاوازەکانی گۆڕەپانە سیاسی و کۆمەڵایـــەتی و ئـــابووری و فێرکـــردن و ڕووبەڕووبوونـــەوەیان، وا دەردەکەوێت کە پێناسەیەکی تا ڕادەیەك زیاتر لیبڕاڵـی بـە فەقیهـەکان بەخشی. لیژنە فیقهییەکان لە ڕێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامی و "رابیتە" {رابیتـەی جیهانی ئیسلامی} و وڵاتانی ئەندام، کاری بە سـوودی مـەزن لـە هـەردوو لایـەنی دەوڵـەتی و نیـشتمانی ئـەنجام دەدەن. لەوانەیـە زیندووکردنەوەی دەزگای شووراش لە ژمارەیەك وڵاتی ئیسلامیی گرنگ، هێزێکی زیاتر ببەخشێتە کرداری پێشکەوتن و کرانەوە.

وا دیاره قورئان و سوننەت هاندەربوون بۆ نەرمینواندن و کارئاسانی بە شێوەیەکی زۆر باش. قورئان دەفەرموێت: ﴿**يُرِيدُ اللَّهُ بِكُمُ الْيُسْرَ وَلَا يُرِيدُ بِكُمُ الْعُسْرَ**﴾ البقرة/١٨٥ و پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) دەفەرموێت: "إن الدِّين يُسْرٌ، ولن يُشادَّ الدين أحدٌ إلا غلبه".[1] ئەو قەبارە گەورەیەی ئەدەبیاتی پەیوەست بە مەبەستەکانی شەریعەتەوە، مانای ئەوەشە کە هەستکردن بە وەرگرتنی مەبەستەکان و بەهەند وەرگرتنیان لە ڕاڤەکردنی دەقەکاندا، بە لای کەمەوە گرنگییەکەی بە ئەندازەی وەرگرتنی هەموو دەقەکەیە. چاوەڕوان دەکرێت ئەم پێشکەوتنە بە شێوەیەکی نەگۆڕ بەردەوام بێت، تاوەکو هەموو مەزهەبە فیقهییەکان یەك دەگرن، بە مەرجێك هەموو فەرمانە جۆراوجۆرەکانی لە هەموو بوارە جیاجیاکاندا شێوەی جێگرەوەی جۆری خۆی وەربگرێتەوە، کە تاك یاخود کۆمەڵ یان ئومەت، بتوانێت کامیان گونجاوە بۆ بارودۆخی تایبەتی خۆی، هەڵیبژێرێت.

کێشەکە لەوەدایە کە عەقڵانییە نوێکان — وەك هاوشێوەکانیان لە ڕابردوودا — کۆمەڵەیەکی یەکگرتوو پێکناهێنن، کە تیایاندایە — بۆ نموونە — میانڕەوەکان، کە ئەرێنین لەوەی پەیوەندی بە ئیسلام و بەهاکانیەوە هەیە، چی لە توانایاندا هەبێت لە خستنەڕووی بەڵگەی سەلمێنراو لە پێناو شکاندنی توێکڵی ئەستووری نەجووڵان دەیکەن. ئەمە کارێکی پێویستە ئەگەر بخوازرێت ئیسلام ڕووبەڕووی

---

[1]. البخاري، صحيح البخاري، سەرچاوەی پێشوو، ج١، ل٢٣، فەرموودەی ژمارە ٣٩.

بەربەرەکانییەکان لە جیهاندا ببێتەوە، کە هێشتا عەلمانییەت لە جیهاندا نموونەی باوە. ئەمانە هیچ گێروگرفتێك دروست ناکەن، بەڵکو وا دەردەکەوێت وردە وردە پێشکەوتن بەدەست دەهێنن.

لەگەڵ ئەوەشدا تیمێکی تر هەیە کە لە عەلمانییە پەڕگیرەکانن، کە حەزیان لێیە قورئان و سوننەت بەلاوە بنێن و سەرلەنوێ کۆمەڵگای ئیسلامی هاوشێوەی ڕۆژئاوا بنیاتبنێنەوە، لە کاتێکدا دەبینین هەموو ڕۆژئاوا خۆیان لەناو یەکدا یەك نین، کە تیمێك ئایینی و تیمێك دژی ئایینە، تیمێك دیکە داوای چێژی ژیان دەکات... عەلمانییە پەڕگیرەکان دەیانەوێت جیهانی ئیسلامی لەسەر ڕێوشوێنی دوایین تیم بڕوات، بەم شێوەیە دەبنە هۆی دروستکرنی ناکۆکی و دڵەڕاوکێ و بۆ سەپاندنی بیروباوەڕەکانیان هێز بەکاردەهێنن، بە تەواوەتی وەك موعتەزیلەکان، پشت بەست بە دەستەڵاتی سیاسی کە هەندێکیان هەیانە. بەڵام لە ڕابردوودا هێز سەرکەوتوو نەبووە، زەحمەتە ئێستاش سەربکەوێت، بەڵکو دەبێتە هۆی دروستکردنی کاردانەوەی دوژمنکاری و پەڕگیری کە هێزە کۆنەپارێزەکان دەیانەوێت. لەوانەشە ببێتە کۆسپ هەتاوەکو بۆ عەقڵانییە میانڕەوەکان، کە دەیانەوێت کۆمەڵگاکانیان بگوازنەوە بۆ هاوسەنگییەکی زیاتر تەندروست، هەر وەك لە ڕابردوودا ڕووی دا. ئەوەی جێگەی گەشبینییە، بڵاوبوونەوەی دیموکراتییەتە بە بەردەوامی، بەرەو ئەوە دەڕوات کە وەك هێزێکی ئەرێنی بەرژەوندیی مامناوەندی تێدا بێت، بە هۆی پێداویستی کۆکردنەوە و پشتگیریی هەموو چینەکان.

# بەشی شەشەم

# دارمانی کۆمەڵایەتی

## دارمان لە هەندێ بواری کۆمەڵایەتیی گرنگی یەکلاکەرەوە

### یەکەم: کەلێنەکانی یەکگرتن لە نێوان حکومەت و گەلدا

تاقیکردنەوە مێژووییەکان دەیسەلمێنن کە بەردەوامبوونی پێشکەوتن لە کۆمەڵگادا سەخت و ئەستەمە، ئەگەر کەلێن لە یەکگرتنی نێوان حکومەت و گەلدا هەبوو. ئەم جۆرە کەلێنانە دەبنە هۆی ناکۆکی و نەبوونی هاوکاری، ژینگەی پێشکەوتنیش تێك دەدات. لەبەر ئەوەی هێشتا ئیسلام لە جیهانی ئیسلامیدا، حوکمی دڵی خەڵکی دەکات، خواپەرستەکان و زانا بەتواناکان بە پاسەوانی ئیسلام دادەنرێن، سەلمێنراویشە کە پێویستە ژینگەیەکی متمانە لە نێوانیان و حکومەتدا هەبێت، لە پێناو مسۆگەرکردنی حکومەتێکی لە گەل هەڵقوڵاو و جێگیر و بەکردار. پێویستە لەپێناو پێشکەوتنی (فیقە) لەگەڵ پێداویستییە گۆڕدراوەکانی کۆمەڵگادا، ئەم جۆرە یەکگرتنە هەبێت. لەگەڵ ئەوەشدا پەیوەندیی نێوان زانایان و حکومەت بە درێژایی سەدەکان گۆڕانکاریی

بەخۆوە بینیوە، لە کاتێکدا ماوەی وا هەبووە پەیوەندی لە نێوان هەردوو لادا باش بووە، ئەم پەیوەندییەش – لە بێ بەختیدا – لەگەڵ کاتدا بەرەو دواوە ڕۆیشتووە.

لەسەردەمی خەلیفە هاروونە ڕەشیدا (١٩٣ك/٨٠٩ز كۆچی دوایی کردووە) زانایانی خواپەرست و بە توانا هەبوون، وەك ئەبو یوسف (١٨٢ك/٧٩٨ز كۆچی دوایی کردووە) و شەیبانی (١٨٩ك/٨٠٤ز كۆچی دوایی کردووە)– هەردووکیان خوێندکاری دیاری ئەبو حەنیفە بوون – جێگەی ڕێزبوون لای خەلیفە، کە ئەویش ئامۆژگاریی وەردەگرتن و بە شێوەیەکی گشتی جێبەجێی دەکردن.[1] لەگەڵ ئەوەشدا هاروونە ڕەشید دەستەڵاتدارێکی نموونەیی نەبوو، ئەگەر بیروڕایەك ڕووبەڕووی بکرایەتەوە و لە بەرژەوەندیی تایبەتی خۆی نەبوایە، بە شێوەیەکی زۆردارانە مامەڵەی دەکرد. ئەمەش لە ڕووداوێکدا دەردەکەوێت کە شەیبانی دەیگێڕێتەوە کە یەکێکە لە بەناوبانگترین ئەو کەسانەی بەشدارییان لە پێشکەوتنی فیقهی حەنەفیدا کرد، ڕووداوەکە کاتێ ڕووی داوە کە شەیبانی قازی بووە لە ڕەقە (سووریا)، هاروونە ڕەشید لێی پرسیوە: ئایا دەتوانێت گرێبەستی پارێزگاری، کە داویەتی بە یەحیای کوڕی عەبدوڵا حەسەن، بکێشێتەوە؟ کە شەیبانی وەڵامی دەداتەوە: بە گوێرەی شەرع ناتوانێت ئەو کارە بکات. هاروونە ڕەشید تووڕە دەبێت

---

[1]. Zaman, M. Qasim. Religion and Politics under the Early Abbasids. Leiden: Brill, 1997.

و شووشـــەی مەرەکەبەکــەی تێــدەگرێت، بەوهۆیەشــەوە ئــازاری پـــێ دەگەیەنێت و جلەکانیشی بە خوێن و مەرەکەب پـیس دەبـن. بـەڵام لـە هەمان کاتدا فەقیهێك ملکەچی فەرمانەکانی هاروونە ڕەشـید بـووە، کـە ئەویش ئەبو بوحتورییە. ئەو ڕێگەی پــێ دا ئــەوەی داوای کـرد بیکـات، بۆیە ئـیتر ڕێگـە بـە شـەیبانی نـەدرا حـوکمی یاسـایی دەربکـات، بـەڵام هاروونە ڕەشید دواتر بۆی قەرەبوو کردەوە، کە پلەکەی بـەرزکردەوە، کاتی مردنیشی پیای هەڵداو باسی لێهاتووی کرد.[1]

لەگەڵ ئەوەی هاروونە ڕەشید لە ڕووانگـەی پێوانـە ئیـسلامییەکانەوە نموونەیی نەبوو، لەگەڵ ئەوەشدا لە زۆرێك لەوانەی لەدوای خۆیەوە هـاتن، باشــتر بــوو، ئەگــەر ئــەوان بوونایــە لەبــەر بــیروڕای نــاکۆکی لەگــەڵ بەرژەوەندەییە تایبەتییەکانیاندا، شەیبانییان لە سێدارە دەدا، هـەتاوەکو ئەگەر بیروڕاکەی بەگوێرەی شەرعیش بووایە. بۆیە پەیوەندیی متمانـە لـە نێوان حکومەت و زانایاندا هەبوو. هەر ئەمەش لە ڕێی خۆیەوە پەیوەندیی دۆستانەی نێوان حکومەت و گـەلی بـەهێز کـرد. وایکـرد زانایـان بچنە نـاو کاروباری حکومەتەوە و وایان لێهات کە بە کردار هەست بـە ژیـانی ڕۆژانـە بکەن. بۆیە (فیقه) هاوشان بوو بۆ بارودۆخـە گـۆڕاو و پێـشکەوتنەکان لـە هەموو بوارەکانیدا، لەوانەش بـواری ڕەوشـتی و کۆمەڵایـەتی و ئـابووری و

---

[1] . ئەم ڕووداوە نووسەر (عبدالفتاح أبو غدە) لە کتێبی الـصیمری "أخبـار أبـي حنيفـة وأصـحابە" بـە درێژی باسی دەکات، لە پێشەکیی کتێبی "کتاب الکسب"ی شەیبانی لاپەڕەکانی ٥٤-٥٦. ئـەم ڕووداوە (أنس الزرقا) لێی ئاگادارکردمەوە.

سیاسـی و نێودەوڵـەتی. ئەمـەش یارمەتیـدەرێك بـوو بـۆ دۆزینـەوەی ژینگەیـەکی باشتر بـۆ جێبـەجێکردنی شـەریعەت و پارێزگـاری لـە یاسـا و سیستم و جێیەجێکردنی دادپەروەری و گەشەپێدان. هەروەها پاڵپـشتێکی بـەهێز ئامـادەکرا بـۆ هـەموو چـالاکییەکانی بنیـاتی ئومـەت و لـەم ڕێگەیەشەوە دەستەڵاتی سیاسی بەهێز بوو.

هاوپـەیمانیی زانایـان و دەوڵـەت، لـە سـەردەمی دەسـتەڵاتی مـەئمون کـوڕی هاروونـە ڕەشـیددا (١٩٨-٢١٨ك/٨١٣-٨٣٣ز) و هـەردوو خەلیفـە موعتەسـیم (٢١٨-٢٢٧ك/٨٣٣-٨٤٢ز) و واسـیق (٢٢٧-٢٣٢ك/٨٤٢-٨٤٧ز)، دووچاری نوشوستییەکی توند هات. لەگـەڵ ئـەوەی هـەردووکیان کاری زۆریان بۆ پشتگیریی گفتوگۆ زانستی و فیکرییەکان کرد، ئەمەش بۆ ئەو هەوڵانەیان دەگەڕێتـەوە لـە بـەرکارهێنانی دەسـتەڵاتی سـەرکوتکەری دەوڵەت بۆ سەپاندنی مەزهەبی موعتەزیلە کە ببێتـە بیروبـاوەڕی فـەرمی، سەرەڕای ئاگادارکردنەوە لەلایەن زانایانەوە کە هەندێ بابـەتی موعتەزیلـە پێـچەوانەی ڕێنماییـەکانی شـەریعەتە. ئەمـە وایکـرد زانایـان و گـەل دوورەپەرێزبن لە حکومەت، و بووە هۆکاری لاوازبوونی.

ئەگـەر مـەئمون و خەلیفـەکانی دوای ئـەو، خۆیـان بـە بەرپرسـیار بزانییانیە لەبەردەم گەلدا، هەوڵیان دەدا ئەو کەلێنە پڕبکەنـەوە، بـەڵام لەبری ئەوە، بە دامەزراندنی پاسەوان و فەرمانبەر و سەربازی بیانی لـە ئاسیای ناوەڕاستەوە بۆ پارێزگاری خۆیـان، هـەوڵیان دا نـاڕەزایی گـەل بەرپەرچ بدەنەوە، بەو شێوەیە دەسـتیان بـە لاساییکردنەوەیەك کـرد،

دەرکـەوت – لـە کۆتاییـدا– کـە هۆکارێـك بـوو بـۆ نـەمانی هێمنـی و ئاسـایش. دەسـتەڵاتدارەکان زیـاتر لووتیـان بـەرزبووەوە و لـە گـەل دوورکەوتنەوە، بە پێچەوانەی تەواوی سەردەمی خەلیفەکانی ڕاشیدین. ئەم دوورکەتنەوەیـە لـە سـەردەمی عوسمانییەکانـدا لـە دوای سـەدەی شازدەیەم، زیاتر پەرەی سەند، کـار گەیـشتە ئـەوەی نزیکبوونـەوە لـە نێوان حکومەت و گەلدا زیاتر لاواز بێت، دەسەڵاتداریش لە خۆی حەرام کردبوو کە ڕاستەوخۆ بزانێت لە وڵاتدا چی ڕوو دەدات.[1]

موتەوەکیل (٢٣٢–٢٤٧ك/٨٤٧–٨٦١ز) کە شـوێنی خەلیفـە واسـیقی گرتــەوە، هەسـتی بـەم نـاکۆکی و دوورەپەرێزییــە کــرد، هــەوڵی دا بــە کۆکردنـەوەی زانایـان و دانیـشتووانە شارسـتانییەکان کێشەکە چارەسـەر بکـات، وازی لــە مەزهــەبی موعتەزیلـە هێنـا و هێزەکـەی تـا ڕادەیـەك کـەمکردەوە، هـیچ دەسـتەڵاتدارێکی تـریش دوای ئـەو هـەوڵی نـەدا ئـەو مەزهەبــە بگەڕێنێتــەوە شــوێنی خــۆی. بــەڵام پاســەوانانی بیــانی موتەوەکیلیان کوشت و سەرەتا ئەمەش تا ماوەیەك بووە هۆی پـشێوی و نائارامی. پاسەوانە بیانییەکان هەڵدەستان بە دانان و لابردنی خەلیفە، لـە دوای موتەوەکیل، چوار خەلیفە هاتن کە سیانیان کوژران.[2] بەم شـێوەیە دەستەڵاتی سیاسی بەردەوام بێهێز دەبـوو تـا لـە کۆتاییـدا عەباسـییەکان ڕووخان.

---

1 . Faroghi, "Crisis and Change. ", p. 616.
2 . Lewis, "Abbasids. ", p. 18.

## دووەم: وەستانی (فیقە)

ئەو پرسیارەی جار لەدوای جار دێتە ئاراوە، ئەوەیە: بۆچی (فیقـە) لەم سەدانەی دواییدا وەستا، لەگەڵ ئەوەی پێشتر گەشاندنەوە و ژیاری بەهێزی بەخۆوە بینی؟ بۆ ئەوەی کلیلی وەڵامدانەوەیەکی سەلمێنەر لە شایستە بدۆزینەوە، پێویستە چاو بە هۆکارە مێژووییەکاندا بگێڕینەوە. ناکۆکیی نێوان زانایـان و دەسـتەڵاتدارەکان کاتـێ خەسـت بـووەوە کـە ناشــەرعیی سیاســی هاتــە کایــەوە و دەســتەڵاتدارەکان لــە پــەیڕەو و پرۆگرامـی شـەریعەت لایـان دا. لـە ئـەنجامی چەوسـاندنەوەی زانایـان لەلایـەن مـەئمون و جێگرەوەکانیـەوە، ڕەوشـەکە زیـاتر بـەرەو خراپـی دەڕۆیشت. ئەمەش بوو بە هۆکاری ئەوەی نەتوانرێت گفتوگۆی دۆستانە لە نێوان هەردوولادا ئەنجام بدرێت. لە چەند کاتێکدا بارودۆخەکـە بـاش بوو، بە تایبـەتی کاتـێ هەنـدێ دەسـتەڵاتداری خـاوەن ویـژدان چـمکی دەستەڵاتیان گرتەدەست و هەوڵیان دا زانایان ڕازی بکەن. بـەڵام لەبـەر ئــەوەی شــەریعەت لــە گۆڕەپــانی سیاســیدا جێبــەجێ نــەدەکرا– کــە گرنگییەکی یەکلاکەرەوەی هەیـە– ئـەمیش جێگـەی مـشتومڕ بـوو، بـە شـێوەیەکی زۆر کـە بـووە هـۆی ژمارەیـەك کارەسـاتی تـر، لەوانـەش بڵاوبوونەوەی ستەم لە سیـستمی باجـدا و گەنـدەڵیی دەسـتەڵاتداران و ڕابواردنیان، هـەروەها پێـشکەوتنی ڕۆشـنبیری ماستاوچـی و کۆیلـە لـە

کۆشکە شاهانەکانیاندا، بەکارهێنانی ئیسلام بۆ بەرژەوەندیی تایبەتی دەستەڵاتداران.[1]

زانایان و سۆفییە لەخواترسەکان – ئەوانەی ڕێزی تایبەتیان لێ دەگیرا – بێزار بوون لەو هەموو خراپەکارییە، زۆرینەیان خۆیان لە دەستەڵاتی سیاسی ڕزگار کرد و لە پلە و پایەی حکومەت دوورکەوتنەوە. وای لێهات خزمەتکردنی زانایان لە دەوڵەتدا کارێکی شوورەیی بوو، هەر کەسێکیش مووچە یان سوودمەند بووایە لە دەوڵەت، بە هاوکاری دەستەڵات دادەنرا لە ستەمکانیاندا، ئەمەش کاریگەریی دوورمەودای لەسەر کۆمەڵگای ئیسلامی هەبوو. ئەو زانایانەی خزمەتی حکومەتیان قبووڵ دەکرد و دەچوونە کۆشکی شاهانەوە، دەستەڵاتی مەعنەویی خۆیان دۆڕاندبوو و خەڵکیش بە خاوەن پلە و پایەی دونیایی ناویان دەبردن، بەراورد لەگەڵ ئەوانەی خۆیان بەدوور دەگرت لە کۆشکی شاهانەوە، لەوانەی کە پێیان دەوتن زانایانی خێر یان زانایانی ڕۆژی دوایی. عەتابی (٢٢٠ك/٨٣٥ز کۆچی دوایی کردووە) هۆیەکی دیکە دەربارەی دوورکەوتنەوەی زانا لەخواترسە ڕوون و سافەکان لە کۆشکە شاهانەییەکان دەخاتە ڕوو. وای دەبینێت کە: "دەستەڵاتدارەکان لەوانەیە پارەیەکی زۆر بە پیاوانی دەستوپێوەندی

---

[1]. الغزالي، إحياء علوم الدين، سەرچاوەی پێشوو بەرگی ١، ل٥٨–٨٢. هەروەها بڕوانە:

ـ الطرطوشی، أبوبکرمحمد الوليد الفهري. سراج الملوك، تحقيق: محمد فتحي أبو بكر، القاهرة، ا لدار المصرية اللبنانية، ١٩٩٤م، مج٢، بەشی تایبەت بە "التحذير من صحبة السلطان"، ل ٤٨٠–٤٨٤.

خۆیـان بـه بـێ بەرانبـەر بـدەن، لەوانەشـە فـەرمان بکـەن بـە بـێ هـۆ بیشیانکوژن، لەوانەشە کەسـانێك هـەبن حـەز نەکـەن چ لـەم لا چ لـەولا بن". [1] سەرەڕای ئەمەش، زانا لەخواترسەکان هەر وەك غەزالی وا بوون، هەموو سامانی دەستەڵاتدارانی گەندەڵ بەماڵی حەرام دادەنێن. [2] بۆیە غەزالی وا دەبینێت نزیککەوتنەوە لە دەستەڵاتداران لەوانەیە ببێتە هۆی دوورکەوتنەوەی زانایان لەسەر ڕێگەی ڕاست و گەیاندنیان بە جۆرەکانی تری لەخشتەبردن و گەندەڵی و بەرەو سوودوەرگرتن لە بەشێك لەو ماڵە حەرامـە. [3] بۆیـە بـۆ زیـاتر سـەلامەتی لـە لایـەنی ڕەوشـتییەوە غـەزالی دەڵێـت: "تـۆ نـەیانبینیت و ئـەوان تـۆ ببیـنن". [4] مەترسـی لـە هەڵخەڵەتاندن و دوورکەوتنەوە لە ڕێگەی ڕاست و لەسێدارەدان، بوونـە هاندەرێك بۆ زانایانی لەخواترس کە لە کۆشکی شاهانە دووربکەونـەوە. ئەمـە دەسـتەڵاتدرانی لـەو ئامۆژگارییـە ڕاسـتەقینانە بێبـەش کـرد کـە زانایان دەیانتوانی، لە پلەی ئەبو یوسف بۆ نموونە، پێشکەشی هاروونە ڕەشـیدی بکردایـە. لـە بەدبەختیـدا پـۆلێنکردنی زانایـان بـەم شـێوەیە هێـشتا– تـا ڕادەیـەك – لـە جیهـانی ئیـسلامیدا بەردەوامـە. تـاوەکو ئێستاش ئەو زانایانەی دەیانەوێت لە حکومەت نزیکببنـەوە، ئەگـەر بـە

---

[1]. الطرطوشی، سراج الملوك، سەرچاوەی پێشوو،ل٤٨١.

[2]. الغزالي، احیاء علوم الدین، سەرچاوەی پێشوو، بەرگ٢، ل١٣٩.

[3]. سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٣.

[4]. سەرچاوەی پێشوو، ل١٤٢.

مەبەستی چاکسازییش بێت، بە چاوێکی گومانــەوە ســەیریان دەکرێـت، بە تایبەتی لەناو چینی سۆفییەکاندا.

ئەم شتە بوو بە هۆی ڕوودانی دژوارییەك لە کۆمەڵگا ئیسلامییەکاندا، لـە لایـەك ئـارەزوو بـۆ بەدەسـتهێنانی دادپـەروەری و خۆشـگوزەرانیی گــشتی بــە پێــی پێداویــستییەکانی شــەریعەت هــەبوو، هــەروەها دووپاتکردنەوەی پێویستی دەوڵەت کە ڕۆڵێکی گەورە ببینێـت لـەوەدا، هەروەها دەوڵەت پێویستی بە زانایان هەبوو کە بەرەو بینینی ئەو ڕۆڵە ئاراسـتەی بکـەن. لـە لایـەکی تـرەوە ئـەو زانایانـەی پەیوەنـدییان بـە دەوڵەتـەوە هـەبوو، خـاوەنی بەرژەوەنـدیی تایبـەت و دونیـایی بـوون. لەوانەیە هەستێك نەبووبێت کە هەست بکـات زەحمەتـە خەلیفەیـەك لـە ئاستی ئەبووبەکر و عومەر و عوسمان و عەلیدا بدۆزرێتەوە، کـە ئەوانـە لـــەخواترس و بـــەتوانا و خوانـــاس بـــوون، ڕەنگـــە هـــیچ چـــارەیەك نەمابووبێتەوە لەبـەردەم زانایانـدا کـە بتـوانن لەگـەڵ دەسـتەڵاتدارێکدا بـژین سـیفاتی مرۆڤـی پێگەیـشتووی تێـدا نـەبێت و بتوانرێـت زۆرتـرین خێریان لێ بەدەست بهێنێـت. لـە فەرموودەیـەکی (صـحیح)دا هـاتووە: ئــایین ئامۆژگارییــە بــۆ هــەموان، لەناویــشیاندا دەســتەڵاتداران.[1]

---

[1]. دەقی تەواوی فەرموودەکە دەڵێت: عن تميم الداري عـن رسـول الله (صـلى الله عليـه وسـلم) أنـه قـال "الدين النصيحة" ثلاث مرات، قـالوا: لمـن يـا رسـول الله؟ قـال: "لله ولكتابـه ولرسـوله ولأئمـة المـسلمين وعامتهم". ئیبن حەبان ڕیوایەتی کردووە. بڕوانە:

ئامۆژگاری بۆ دەستەڵاتداران، بە مانای پێشکەشکردنی ئامۆژگاریی ڕاستگۆیانەیە بۆ دەستەڵاتداران و یارمەتیدانیان یۆ کاری چاکە و ڕێگە لێگرتنیان – یان بە لای کەمەوە – ئاگادارکردنەوەیان لە ستەمکردن. ئەو ئامۆژگارییانە کە زانایان پێشکەشی – ئەوانەی ڕێزێکی زۆریان لێ دەگیرێت – دەستەڵاتدارانی دەکەن، لەوانەیە قورسایی زۆری خۆی هەبێت، ئەگەر هەمووشی بە تەواوەتی جێبەجێ نەکرێت، لەوانەیە هاوکار بێت لە کەمکردنەوەی ستەم، وردە وردەش ببێتە هۆی باشکردنی گوزەرانی گەل. داواکاریی هەموو شتێکیش، ئەگەرنا هیچ، لەوانەیە بەکردار زۆر سوودی نەبێت، لەم ڕووانگەیەوە باشتر وابوو ئەو هەڵوێستە بگیرێتە بەر کە قورئانیش دووپات دەکاتەوە: ﴿وَتَعَاوَنُوا عَلَى الْبِرِّ وَالتَّقْوَى وَلَا تَعَاوَنُوا عَلَى الْإِثْمِ وَالْعُدْوَانِ﴾. المائدة/٢

خۆپاراستنی زانایانی لەخواترس و بەتوانا، لە چەند ڕوویێکەوە زیانی بە ئیسلام گەیاندووە کە بریتیین لە:

أ– جیهانی ئیسلامی لە چاکسازیی سیاسی بێبەش کردووە. ئەگەر زانایان و سۆفییە ڕاستەکان و بەناوبانگەکان، لەبری ئەوەی خۆیان

---

- البستي، محمد بن حبان. صحيح ابن حبان ابن بلبان، تحقيق: شعيب الأرناؤوط، بيروت، مؤسسة الرسالة، ط٢،١٤١٤هـ – ١٩٩٣م، بەش١٠، فەرموودەی ژمارە ٤٥٧٤.
- القشيري، صحيح مسلم، سەرچاوەی پێشوو، بەش ١، ل٧٤، فەرموودەی ژمارە ٥٥.
- الشيباني، مسند الإمام أحمد بن حنبل، سەرچاوەی پێشوو، بەش ٢٨، ل١٤٨، فەرموودەی ژمارە ١٦٩٤٧.

دووره‌په‌رێز بگرن، بۆ چاکسازیی سیاسی و مافی گه‌ل تێبکۆشانایه‌، له‌وانه‌بوو ورده‌ ورده‌ و به‌ ڕابووردنی ئه‌م چه‌ند سه‌ده‌یه‌، کاریگه‌ریی له‌سه‌ر ده‌زگا دیموکراتییه‌کان هه‌بووایه‌ و بیاندۆزینایه‌ته‌وه‌. له‌وانه‌شه‌ ئه‌مه‌ ببوایه‌ته‌ هۆی هه‌ندێ فشار و پاڵه‌په‌ستۆ له‌سه‌ر ده‌سته‌ڵات که‌ سته‌م که‌مبکاته‌وه‌ و چاره‌سه‌رێکیش بووایه‌ بۆ کێشه‌کانی خراپ به‌کارهێنانی داهاتی ده‌وڵه‌ت و دامه‌زراندنی که‌سانی بێ توانا له‌ پله‌ و پایه‌ی به‌رزدا. به‌ڵام کاتێك هه‌موو گه‌ل له‌ پێناو مافه‌کانیدا تێده‌کۆشێت، بۆ ده‌سته‌ڵاتداران ئاسانه‌ ورد و خاشیان بکه‌ن، له‌ کاتێکدا ئه‌گه‌ر زانایان تێکۆشان — ئه‌وانه‌ی ڕێزی تایبه‌تیان هه‌یه‌ و لایه‌نگرێکی زۆریشیان له‌ناو زۆرینه‌ی گه‌لدا هه‌یه‌ — له‌وانه‌یه‌ ده‌سته‌ڵاتداران نه‌توانن به‌ ئاسانی کپیان بکه‌نه‌وه‌، یاخود له‌ناویان ببه‌ن. تێکۆشانی زانایان دژی مه‌ئمون و ده‌ستوپێوه‌ندی، له‌ ڕاستیدا قوربانیی لێکه‌وته‌وه‌، به‌ڵام له‌ کۆتاییدا هه‌ر سه‌رکه‌وت. له‌وانه‌یه‌ ژماره‌ی ئه‌و ده‌سته‌ڵاتدارانه‌ی له‌ سه‌رده‌می عه‌باسی دواییدا هاتن، هه‌ندێ له‌ نه‌وه‌کانی تر ده‌سته‌ڵاتیان نه‌ده‌گه‌یشتنه‌ ده‌سته‌ڵاتی مه‌ئمون، ڕه‌نگه‌ ئه‌و تێکۆشانه‌ی که‌ به‌رده‌وام بوو دژی مه‌ئمون و ده‌ستوپێوه‌ندی، بیتوانییایه‌ ورده‌ ورده‌ قه‌ناعه‌ت به‌ خه‌لیفه‌کان بکات، یان زۆریان لێ بکات چاکسازی ئه‌نجام بده‌ن.

ب— ناکۆکی له‌گه‌ڵ مه‌زهه‌بی موعته‌زیله‌ ده‌رباره‌ی فه‌لسه‌فه‌، گومانی لای زانایان دروست کرد. فه‌لسه‌فه‌ له‌و ڕۆژانه‌شدا په‌یوه‌ست بوو

بـه ژمارەیـەك زانـستی سروشـتییەوە، وەك فیزیـا و كیمیـا. بـەم پێیـە زانستەكان بە بێ مەبەست پەیوەسـت بـوون بـە فەلـسەفەوە، بۆیـە لـە ڕووانگەیـەكی گومناوییـەوە سـەیری دەكـرا، هـەر بۆیـەش پرۆگرامـی خوێنـدنگاكان تـەنیا زانـستە ئایینییـەكان بـوو، گرنگـی بـە زانـستە كۆمەڵایـەتی و سروشـتی و ئامێرەكـانی شـیكردنەوەكانی تـر — كـە فەقیهـەكانی ڕابـردوو وەك: ئـەبو یوسـف و غـەزالی و ئـیبن ڕوشـد خوێنـدبوویان، ئەگـەر بهاتبایـە ئـەو زانـستانەیان وەرنەگرتایـە نەیاندەتوانی بە شێوەیەكی كاریگەر ڕۆڵی خۆیان ببینن — بۆ زانایـانی نەوەكانی داهاتوو ڕێگە پێدراو نـەبوو، ڕانـەهێنرابوون لـە ئایندەدا لـەو جۆرە كارە فیكرییە بكەن كە فەقیهەكانی ڕابردوو پـەیڕەویان دەكـرد و وایان لێهات توانای داهێنانیان نەما.

ج— دووركەوتنەوەی زانایان لە بەڕێوەبردنی دەستەڵات، بووە هـۆی ئەوەی كە تەنیا لە مزگەوت و خوێندنگاكاندا بوونیـان هـەبێت، ئەمـەش دووركەوتنەوەیان بوو لە كرۆكی ژیانی ڕۆژانە، بێجگـە لـە هەنـدێ كـاتی كەم نەبێت لە چاكسازی لە نزیكەی هەموو نەوەكانی دەسـتەڵات. بۆیـە سـنووری مـاوەی ڕێگەپێـدراو بـۆ بەدەنگـەوهاتنی ڕووبەڕووبوونـەوەی كۆمەڵایەتی _ ئابووری و سیاسییەكانی ئەو كاتە، بەرتەسـك بـووەوە و نەتوانرا شەریعەتیش بكرێتە ڕاستییەكی بنەڕەتی لە ژیانی موسڵمانان‌دا. بۆیە هەر وا مانەوە و پێگەیەكیان لە شیكاریی لۆژیكی و هاوبەشـییەكی نوێیان لە ئیجتیهاددا نەبوو. زانستیش بە گـوێرەی خواسـت و پێویـست

گەشە دەكات و پێش دەكەوێت، ئەگەرچی ئایینی یاخود دونیایی بێت، فیقهیش بەدەر نییە لەم حاڵەتە و نزیكەی تا ماوەیەك وەستابوو، زاناكانیش خۆیان بە شتی لاوەكیی ڕێگەی ژیانی ئیسلامییەوە خەریك كردبوو.

وای لێهات ئەوەی لە ڕابردوودا نووسرابوو، بووبوونە نموونەی باڵا، بووە هۆی خۆ تەرخانكردنێكی بێ بەڵگە بۆ قبووڵكردنی هەموو حوكمەكانی پێشوو، بە بێ جیاوازی لە نێوان پێداویستییەكان و ڕووبەڕووبوونەوە گۆڕدراوەكاندا، زاناكانیش تەفسیری دەقەكانیان بە هەمان شێوەی پێشوو كە مامۆستاكانیان تەفسیریان كردبوو، دەكردەوە. هەتاوەكو زۆربەی ناودارەكان كاتەكانیان بە نووسینەوەی تەفسیری تەفسیرەوە بەسەر دەبرد، بەم شێوەیە حوكمی كتێبە كۆنەكانیان سەلماند كە لە بارودۆخێكی زۆر جیاوازدا نووسراون. هیچ بژارەیەك لەبەردەم خوێنكاراندا نەمابووەوە، تەنیا وتنەوە و لەبەركردنی دەقە كۆنەكان نەبێت، لەبری ئەوەی تواناكانیان بۆ شیكاریی كێشەكان بەكاربهێنرێت بە شیكارییەكی زانستی و دانانی چارەسەر بۆ هەموو كێشە جۆراوجۆرەكان.

وەستانی (فیقه) و پێشنەكەوتنی، بووە هۆی ئەوەی نەبێتە سیستمێك كە هەموو بەشە بەیەكەوەبەستراوەكانی شەریعەت لە هەموو بوارەكانی ژیانی مرۆڤایەتیدا لە خۆیدا هەڵبگرێت و وەڵامدەرەوەی

تەواوی پێویستی و پرسیارەکانی مرۆڤ بێت.[1] ئیتر بڕیارە فیقهییەکان بۆ لێکدانەوەی دەقە ئایینییەکان، ڕووی لە پشتبەستنێکی بە بیانووە فیقهییەکان کرد، بە بێ ئەوەی گرنگیی پێویست بە مەبەست و ئامانجەکانی ئایین بدرێت.[2] لێرەدا هەوڵە سەرەکییەکانی ئیسلامی پێشوو کۆتاییهات و نموونەی باڵایان بەسترابووەوە بە بەهێزکردنی ڕژێمی سیاسی و یاسایی و کۆمەڵایەتی ـ ئابووری — کە لە کۆتاییدا بە هۆیەوە یارمەتیی بدات سیستمێکی کۆمەڵایەتی ـ ئابووری دادپەروەر بەدەست بهێنێت. هەتاوەکو بنەما سەرەکییەکانی ڕێنماییەکانی ئیسلامی — کە ئامانجی چاندنی ڕەوشتی جوانە، وەك: دادپەروەری و ئەمانەت و ڕاستگۆیی و ویژدانێکی زیندوو، یارمەتی و کاری باش، وردی لە کات دیاریکردندا، لێبووردن و دڵسۆزی بۆ کار — گرنگی پێدانیان کەمبووەوە و ئەو گرنگیپێدانەی پێشوو نەما، کە ئەمەش پێشێلکردنێکی ئاشکرای فەرموودەکەی پێغەمبەرە (درودی خوای لەسەر): "أكمل المؤمنين إيماناً أحسنهم خلقاً".[3] بەم شێوەیە (فیقه)

---

[1]. بەراورد بکە لە نێوان وتەکانی فضل الرحمن لە:

(Rahman, Fazlur. *Islamic Methodology in History*, p. 284-85)و

لەگەڵ وتەکانی أبو سليمان لە:

(AbuSulayman, AbdulHamid. *Crisis in the Muslim Mind*, p. 93. )

[2]. ابن تيمية، الإمام أحمد بن عبدالحليم. بيان الدليل على بطلان التحليل، تحقيق: أحمد بن محمد الخليل، الدمام، دار ابن الجوزي، ١٤٢٥هـ/ ٢٠٠٤م. ل١٣٧.

[3]. بەیهەقی و ترمزی و ئەبوداود و لە ئەبو هورەیرەوە و حاکمیش لە(المستدرك)دا لە عائیشەوە (خوا لێی ڕازی بێت) ڕیوایەتیان کردووە. بڕوانە:

تــەنیا بریتــی بــوو لــە نەریتــەکان، پەیوەنــدی بــە پێداویــستییە بنەڕەتییەکانــەوە نــەبوو کــە ئیــسلام لــە ســەدەکانی پێــشوودا دایمەزرانـدبوون. بۆیـە بـە تـەنیا پەیکـەرێکی ئێـسك مایـەوە، بـەڵام ڕۆحەکەی لاواز بوو.

فێرکردنـی زانـست و هونـەر و زمـان لـە جیهـانی ئیـسلامیدا زینـدوو نەکرایــەوە، تــاوەکو کۆلێــژ و زانکــۆی عــەلمانی لەلایــەن هێــزە ڕۆژئاواییەکانەوە دامـەزرا، ئـەوەش دوای ئـەوەی زۆربـەی هـەرە زۆری وڵاتـە ئیـسلامییەکانیان داگـیر کـرد. ئەمـەش بـووە هـۆی هاتنەکایـەی سیستمێکی دووفـاقی لـە فێرکردنـدا، سیـستمێك گرنگـی بـە فێرکردنـی دەقە ئایینییە کۆنەکان دەدات، ئەویتریان گرنگی بـە زانـستە نوێیـەکان دەدات. ئاوێتــەکردنی ئــەم دوو سیــستمە، هــەر وەك چــۆن بــوو لــە ڕابردوودا، کارێك بوو دەبووایە بکرایە، بەڵام موسڵمانەکان لەبـەر چـەند هۆکارێك نەیانتوانی جێبەجێی بکەن، کـە گرنگییـان کـەم نـەبوو. کـاتێ زانایان ئامادە نەبوون ئەو زانستانە کە بە زانستی دونیاییان دادەنا، لـە

---

- البيهقي، أحمد بن الحسين. سنن البيهقي الكبرى، تحقيـق، محمـد عبـدالقادر عطـا، مكـة المكرمـة، دار الباز، ١٤١٤هـ/١٩٩٤م، بەش ١٠. ل١٩٢، فەرموودەی ژمارە ٢٠٥٧٢.
- السجستاني، سنن أبي داود، سەرچاوەی پێشوو، بەش ٢، ل٦٣٢، فەرموودەی ژمارە ٤٦٨٢.
- الترمذي، الجامع الصحيح، سەرچاوەی پێشوو، بەش ٣، ل٤٦٦، فەرموودەی ژمارە ١١٦٢.
- الحاكم النيسابوري، محمد بن عبدالله. المستدرك علـى الـصحيحين، تحقيـق: مـصطفى عبـدالقادر عطـا، بيروت، دار الكتب العلمية، ط١، ١٤١١هـ/ ١٩٩٠م، بەش ١، ل١١٩، فەرموودەی ژمارە ١٧٣.

خوێندنگا ئایینییەکاندا بخوێنرێن. بۆ ئەوەش مەودایەکی ڕۆحی بخرێتە ناو زانستە "عەلمانییەکان"ەوە، پێویست بوو کە کتێبی خوێندگاکان بە شێوەیەکی عەقڵانیی نێوەندگیر، کە عەقڵ و وەحی کۆبکاتەوە، ئامادە بکرێن. ئەم ئەرکەش زۆر قورس بوو، نەدەتوانرا لە ماوەیەکی کورتدا جێبەجێ بکرێت، بە تایبەتیش ئەو زانا موسڵمانانەی شارەزای هەردوو بوارەکە بوون، زۆر دەگمەن بوون. ئەم کەمتەرخەمییە لە چەند ڕوویەکەوە زیانی بە جیهانی ئیسلامی گەیاند:

- هاوکاریی کۆمەڵایەتی زۆر لاواز بوو، بەهۆی دروستبوونی دوو چینی جیاواز لە زانایان کە پەیوەندی لە نێوانیاندا نەبوو.

- لەبەر ئەوەی دەرچووانی زانکۆ دەتوانن پۆستی باڵا لە هەردوو کەرتی گشتی و تایبەت بەدەست بهێنن، دەرچووانی دەزگا ئایینییەکانیش بە کارێك هەڵدەستن کە داهاتی کەم بەدەست دەهێنن، و پلەی کۆمەڵایەتییان نزمترە، بۆیە خوێندنی ئایینی لە لایەنی داراییەوە سەرنجڕاکێش نییە، باوکەکانیش لە چینە کۆمەڵایەتی و سیاسییەکان، ئەگەر بڕوای ئایینیشییان هەبێت، منداڵەکانیان نانێرنە دەزگا ئایینییەکان، چونکە پۆستی باڵا لە حکومەتدا دەدرایە دەرچووانی زانکۆ بەدەر لەوانەی پسپۆڕی ئایینین، ئەمەش وا دەکات گەڕانەوەی شەریعەت بۆ بەڕێوەبردنی دەستەڵات زۆر قورس بێت.

ئەوەی جیهانی ئیسلامی پێویستی پێیەتی، ئاوێتەکردنی هەدوو خوێندنی ئایینی و عەلمانییە، لەگەڵ گرنگیدانێکی زۆر بە مەبەستەکان و

ڕەوشتی بەرز. لە نموونەکەی ئیسلامدا شتێك نییە ناوی خوێندنی عەلمانی بێت، چونکە هەموو ئەو زانستانەی یارمەتیدەرن بۆ بەدەستهێنانی ڕزگاربوونی مرۆڤەکان، زانستە ئایینییەکانن. خۆشبەختانە، بە تێکۆشانی زانایانی وەك جەمالەدینی ئەفغانی (١٣١٥ك/١٨٩٧ز کۆچی دوایی کردووە) و محەمەد عەبدە (١٣٢٣ك/١٩٠٥ز کۆچی دوایی کردووە) لە جیهانی عەرەبی و سەید ئەحمەد خان (١٣١٦ك/١٨٩٨ز کۆچی دوایی کردووە) و محەمەد ئیقبال (١٣٥٧ك/١٩٣٨ز کۆچی دوایی کردووە) لە نیمچە کیشوەری هیند و پاکستان، توانرا ئەو ئاوێتەبوونەی پێویست بوو، وردە وردە بەدەست بێت. بەڵام گۆڕینی خوێندنگە ئایینییەکان بە خێرایی ئەنجام نادرێت، ئەم پرۆگرامانە بەهۆی پابەندبوون بەو ڕێگایانە و چۆنیەتی پشتگیریکردنی خودییەوە، وەستێنراون، کارێکی ئاسانیش نییە لەو دۆخە دەربهێنرێن. ئەوەی بە شێوەیەکی ڕاستەوخۆ یارمەتیدەرە بۆ ئاوێتەبوون، دەرچووانی خوێندنگە ئایینییەکان خۆیانن، کە هەوڵ دەدەن پەیوەندی بە دەزگا نوێیەکانی خوێندنەوە بکەن، لە پێناو فێربوونی زمانی ئینگلیزی و زانستە نوێیەکان، هەروەها دەرچووانی زانکۆکان ئێستا زانستە ئایینییەکان دەخوێنن. سەرەڕای ئەمەش، ئەو خوێندکارانەی بڕوانامەی بەرز لە زانستە ئایینییە ئیسلامییەکان لە زانکۆکانی ڕۆژئاوا دەهێننەوە، مووچەی باشتر و پلەی بەرزتر وەردەگرن، هەروەها دەتوانن شیکاریی کێشەکان بە شێوەیەکی زانستییانەی زیاتر بکەن. ئەم ئاوێتەبوونەش، وردە وردە یارمەتیدەر دەبێت بۆ پێشکەوتنی (فیقه) و لە بەڕێوەبردنی دەستەڵات نزیکی دەکاتەوە.

## سێیەم: ڕۆڵی سۆفیگەری

گەندەڵی لـە کۆشـکە شـاهانەییەکاندا و نوقومبوونیـان لـە کاروبـاری دونیاییدا، ئـەنجامێکی دیکـەی لێکەوتـەوە، کـە ژمارەیـەك لـە زانایـانی لــەخواترس و خــاوەن ویــژدانی زینــدوو، پــەنایان بــۆ ســۆفیگەری و دونیانەویستی (الزهد) بـرد. سـەرەڕای نەیارییـەکی زۆر بـۆ سـۆفیگەری لەلایـەن زانایانـەوە، ئـەویش بـەهۆی هەنـدێك کـردار و چـەمك کـە بـە شێوەیەکی ئاشکرا دژی بیروباوەڕی ئیسلامە.[1] سۆفییەکان وردە وردە خــەڵکێکی زۆریــان بــۆ لای خۆیــان ڕادەکێــشا، دەســتەڵاتیان بەســەر گۆڕەپانی ئیسلامیدا لە زۆرێك لە وڵاتانی ئیسلامیدا هەبوو، ئەمـەش بـۆ کۆمەڵێك هۆکار دەگەڕایەوە: لەخواترسی، ژیانە ئاساییەکەیان، ڕاست و دروسـتی لـە هۆکارەکـانی ژیانیانـدا، گەیـشتن بـۆ لایـان بـە ئاسـانی و ئامادەبوونی زۆرێکیان بۆ بارمەتیدانی کەسانی تر، هەروەها هەستان بە ڕۆڵێکی مەزن بۆ بڵاوکردنەوەی ئیسلام لە بەشێکی گەورەی جیهاندا. بە ڕاستی لەخواترسەکانیان وەك زانایانی دەروونیی ئایینی هەڵسوکەوتیان

---

[1]. وەك: گۆشـەگیریی زانـا، دووپاتکردنەوەیـەکی گـەورە لەسـەر (کـار و کـردەوەی سـۆفییەکان) و پەردەلادان (پێشبینیی سۆفییەکان) لەسـەر شـەریعەت و وەحـی، پیرۆزکردنـی پێـشینەکان لـە کاتێکـدا ئیسلام باوەڕی بە پیرۆزکردن نییە، سۆفی وەك نێوەندگیرێك لە نێوان مرۆڤ و خوا کاری کردووە، لـەبری ئەو پەیوەندییە ڕاستەوخۆیەی ئیسلام دایمەزراندووە، ئەو باوەڕەی کە مردووانـی پێـشینان کاریگـەرییان لەسەر کاروباری جیهان هەیە و دەتوانن نزای شوێنکەوتووانیان جێبەجێ بکەن.

دەکرد، خەڵکیش پەنای بۆ دەبردن بۆ چارەسەرکردنی کێشەکانیان و دڵنەوایی ڕۆح و قایلبوونی عەقڵیان لای ئەوان دەست دەکەوت.

سەرەڕای هەوڵی ژمارەیەك لە زانایان وەك: غەزالی (٥٠٥ك/١١١١ز کۆچی دوایی کردووە)، شێخ ئەحمەدی سیر هیندی (١٠٣٤ك/١٦٢٤ز کۆچی دوایی کردووە)، بۆ پاککردنەوەی سۆفیگەری لەو پۆخەڵەواتانەی دووچاریان بوو بوو، بەڵام چاکسازییەکە مەرامی خۆی وەك پێویست بەدی نەهێنا، بۆیە سۆفیگەری لە دوو لایەنی گەورەوە زیانی بە ئیسلام گەیاند:

أ ـ شەریعەت، کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) بانگەوازی بۆ دەکرد، داوای دامەزراندنی سیستمێکی کۆمەڵایەتی ـ ئابووریی دادپەروەرانەی دەکرد کە لە چوارچێوەی ڕاستگۆیی تاك و کۆمەڵ و دامەزراندنی دامەزراوەکان بۆ بەئەنجامگەیاندنی ئەو مەبەستەدا بێت. شەریعەت لەسەر موسڵمانانی فەرز کردبوو کە بە ئازایەتییەوە ڕووبەڕووی بەربەرەکانێکان لە ژیانی سیاسی و کۆمەڵایەتی ئابووری ببنەوە و لێی ڕانەکەن. سۆفییەکان زۆر گرنگییان بە ڕاستگۆیی کۆمەڵایەتی بە مانا فراوانەکەی نەدەدا، کە پەیوەستە بە تێکۆشان لە پێناو بەدەستهێنانی دادپەروەری و مافی مرۆڤ، بەڵکو داوای خۆبەدەستەوەدانیان بۆ چارەنووسی سیاسی و کۆمەڵایەتیی ئەو ڕۆژگارە دەکرد.

ب ـ ئەو شەریعەتەی کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) بانگەوازی بۆ دەکرد، داوای یەکسانی لە نێوان کاروباری ماددی و ڕۆحیدا دەکات، بەڵام سۆفیگەری ئەو یەکسانییەی ڕووخاند، بەوەی کە تەنیا پشت بە خواپەرستیی تاك بە شێوەیەکی پەڕگیر دەبەستێت، کە بانگەشەی بۆ هەژاری و دونیانەویستی دەکرد. داوا دەکات بە دوای چێژێکدا بگەڕێن کە خودی مرۆڤ بسڕێتەوە. داوای تەرخانکردنی هەموو کات دەکات بۆ پەرستش و گوێنەدان بە ژیانی دونیایی، لە میانەی دوورخستنەوەی هەندێك لە زانایانی زۆر ڕاستگۆ و بە توانا — کە ڕێزێکی زۆریان هەبوو— و دەیانتوانی ڕێڕەوی مێژوو بگۆڕن. هەرچۆن پەیوەندی بە ڕاستییەکانی ژیانی ڕۆژانەوە هەبوو، یاخود تێکۆشانی سیاسیی کاریگەر بۆ دامەزراندنی سیستمێکی کۆمەڵایەتی – ئابووریی دادپەروەر— سۆفیگەری بە بێ مەبەست یەکێك بوو لەو هۆکارانەی کە یارمەتیی پەیکەرەکانی دەستەڵاتی ستەمکاری ئەو ڕۆژانەی بۆ بەردەوامبوونیان دەدا.

لەگەڵ ئەوەشدا سۆفییەکان هێشتا لە توانایاندایە ڕۆڵێکی گرنگ لە زیندووکرنەوەی ڕەوشت لە جیهانی ئیسلامیدا ببینن، ئەگەر بگەڕێنەوە بۆ ئەرکە ڕەسەنەکەی خۆیان کە پەیوەندی بە پاکژکردنەوەی ڕۆحەوە هەیە، هەروەها بەشداری لە تێکۆشانێکی درێژ خایەندا بکەن لە گەڕاندنەوەی دادپەروەری و مافی مرۆڤ، خۆ دوورخستنەوە لەو چەمکە نائیسلامییانەی لەم دواییانەدا هاتوونەتە ناو نەریتەکانیان. ئەو

کەسایەتییە کاریزماییانەی کە هەندێکیان ئێستاش هەیانە، سەرەڕای ژیانە ئاسایی و ڕەوشتە بەرزەکانیان، ڕەنگە بتوانێت خزمەتێکی گەورە بە چاکسازیی ڕەوشتی و ئابووری و سیاسی لە جیهانی ئیسلامیدا بکات. بەڵام ئەگەر سۆفییەکان هەر وا بە پەڕگیرییەکەیانەوە پابەند بن و ناڕەزایی بەرانبەر ئەوانە دەرببڕن کە خەریکی تێکۆشانی کۆمەڵایەتی و ئابوورین، ئەوا دەبنە هاوبەش بۆ ڕێگریکردن لە بزووتنەوەی چاکسازی کە ئێستا بەردەوامە، لە هەمان کاتدا خۆیان لەوە زیاتر پەراوێز دەخەن کە ئێستا تێیدان.

## چوارەم: نوشووستیی پلە و پایەی ئافرەت

لاوازبوونی حکومەتی ناوەندی و بڵاوبوونەوەی حاڵەتی نائارامی و دابەزینی عەقڵانییەت، کاریگەری لەسەر بارودۆخی ئافرەتیش لە کۆمەڵگای ئیسلامیدا هەبوو، ئەو ڕۆڵە گرنگەی پێشتر لە هەموو بوارەکانی ژیاندا دەیگێڕا، خەریکە بەرەو گلۆربوونەوە دەچوو. قورئان مافی هاوشان بە مافی پیاوانی داوەتێ.[1] هەروەها داوا لە پیاوان دەکات بە نەرم و نیانی و ویژدانەوە مامەڵە لەگەڵ ئافرەتەکاندا بکەن.[2]

---

1. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَهُنَّ مِثْلُ الَّذِي عَلَيْهِنَّ بِالْمَعْرُوفِ. .﴾ البقرة /٢٢٨.

2. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا يَحِلُّ لَكُمْ أَنْ تَرِثُوا النِّسَاءَ كَرْهًا وَلَا تَعْضُلُوهُنَّ لِتَذْهَبُوا بِبَعْضِ مَا آتَيْتُمُوهُنَّ إِلَّا أَنْ يَأْتِينَ بِفَاحِشَةٍ مُبَيِّنَةٍ وَعَاشِرُوهُنَّ بِالْمَعْرُوفِ فَإِنْ كَرِهْتُمُوهُنَّ فَعَسَى أَنْ تَكْرَهُوا شَيْئًا وَيَجْعَلَ اللَّهُ فِيهِ خَيْرًا كَثِيرًا﴾ النساء/ ١٩.

بەوەفاش بن بۆ ئەو ئەرکانەی بە شێوەیەکی دڵسۆزانە لەسەریانە.[1] بۆ ئـەوەی بتـوانن متمانەیـەکی بـەرز بـەدیبهێنن، سـەرەڕای دەربڕینـی خۆشەویستی و سۆز بەرانبەر یەکتر.[2]

پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەر) ئەم ئایەتانەی قورئان و ئایەتی تـریش دووپاتیدەکاتـەوە، کاتـێ دەفـەرموێت: "إن النـساء شـقائق الرجـال".[3] لـە وتارەکەشـیدا لـە حـەجی ماڵئـاوایی، پیـاوانی ئاگـادار کردەوە لە خوا بترسن لە مامەڵەیان لەگەڵ ئافرەتاندا، چونکە ئەوان بە ئەمانەتی خوا هێناویانن.[4] لە بۆنەیەکی تردا ئاگاداری کردوونەتەوە کە

---

1. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِنْ طَلَّقْتُمُوهُنَّ مِنْ قَبْلِ أَنْ تَمَسُّوهُنَّ وَقَدْ فَرَضْتُمْ لَهُنَّ فَرِيضَةً فَنِصْفُ مَا فَرَضْتُمْ إِلَّا أَنْ يَعْفُونَ أَوْ يَعْفُوَ الَّذِي بِيَدِهِ عُقْدَةُ النِّكَاحِ وَأَنْ تَعْفُوا أَقْرَبُ لِلتَّقْوَى وَلَا تَنْسَوُا الْفَضْلَ بَيْنَكُمْ إِنَّ اللَّهَ بِمَا تَعْمَلُونَ بَصِيرٌ﴾ البقرة /٢٣٧.

2. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أَنْفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ الروم/٢١.

3. لـە عائیـشەوە ڕەزای خـوای لەسـەر بێـت، دەگێڕێتـەوە کـە پێغەمبـەر (درودی خـوای لەسـەر) فەرموویەتی: "إن النساء شقائق الرجال". بڕوانە:

- السجستاني، سنن أبي داود، سەرچاوەی پێشوو، بەش ١، ل١١١، فەرموودەی ژمارە ٢٣٦.
- الترمذي، الجامع الصحيح، سەرچاوەی پێشوو، بەش ١، ل١٨٩، فەرموودەی ژمارە ١١٣.
- الشيباني، مسند الإمام أحمد بن حنبل، سەرچـاوەی پێـشوو، بـەش ٤٣، ل٢٦٤، فـەرموودەی ژمـارە ٢٦١٩٥.

4. پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) دەفەرموێت: "اتَّقُوا اللَّهَ فِي النِّسَاءِ، فَإِنَّكُمْ أَخَذْتُمُوهُنَّ بِأَمَانَةِ اللَّهِ، وَاسْتَحْلَلْتُمْ فُرُوجَهُنَّ بِكَلِمَةِ اللَّهِ". . . بڕوانە :

- الشيباني، مسند الإمام أحمد بن حنبل، سەرچاوەی پێـشوو، بـەش ٣٤، ل٣٠٠، فـەرموودەی ژمـارە ٢٠٦٩٥.
- البيهقي، سنن البيهقي الكبرى، سەرچاوەی پێشوو، بەش ٢، ل٣٢١، فەرموودەی ژمارە ٤٠٠١.

بە خراپ سوود لە بێهێزیی ئـافرەت وەرنـەگرن و بـە زۆرەملـێ مافیـان زەوت نەکەن.[1] ئەم فەرموودانە و ئەوانی تریش، وا ڕاڤەکراون کە پلە و پایەی ئافرەتان لەگەڵ پیـاوان وەك یـەکن (نـەك کـەمتر)، ڕوڵـی ئـەوان تەواوکەری ڕۆڵی پیاوانە لە باشترکردنی کۆمەڵگا. ئەمە وای لە خەلیفەی دووەم عومەر (خوا لێی ڕازی بێت) کرد کە بڵێت: "كُنَّـا فِـي الجَاهِلِيَّـةِ لاَ نَعُدُّ النِّسَاءَ شَيْئًا، فَلَمَّا جَاءَ الإِسْلامُ وَذَكَرَهُنَّ اللَّهُ، رِأَيْنَا لَهُـنَّ بِـذَلِكَ عَلَيْنَـا حَقًّا".[2]

لــە ســەردەمی پێغەمبــەر (درودی خــوای لەســەر) ئافرەتــان لــە چوارچــێوەی بەشــداریکردنیان لــە چــالاکی ئــایینی و کۆمەڵایــەتی و پەروەردەیی و ئابووری و سیاسـی، ڕۆڵـی گرنگیـان دەبینـی، هـەروەها "مافی موڵکایەتییەکی پێ بەخشین کە لە ڕۆژئاوادا تا سـەردەمی نـوێش هاوشـێوەی نـەبوو".[3] تەنانـەت ئافرەتـان لـە کـردەوە جەنگییەکانـدا

---

– ابن الخزيمة، محمد بن اسحاق، صحيح ابن الخزيمة، تحقيق: ممصطفى الأعظمي، بيروت، المكتب الإسلامي، ١٣٩٠هـ/ ١٩٧٠م،ج٤، ل٢٥١، فەرمووودەی ژمارە ٢٨٠٩.

[1]. ئەبو هورەیرە دەگێڕێتەوە کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) فەرموویەتی: (إني أحرج عليكم حق الضعيفين: اليتيم والمرأة) واتە من لە مافخواردنی دوو چین ئاگادارتان دەکەمەوەو لە هەمووتان توندترم تیایدا: ئافرەتـان و هـەتیوان. "حـاکم لـە مستدرەکەکەیدا ڕیوایـەتی کـردووە و ئـیبن ماجـەش لـە سـوونەنەکەیدا و ئەحمـەدیش لـە مەسنەدەکەیدا. بڕوانە:

– الحاكم النيسابوري، المستدرك على الصحيحين، سەرچاوەی پێشوو، بەش ١، ل١٣١، فەرمووودەی ژمارە ٢١١.

– القزويني، سنن ابن ماجة، سەرچاوەی پێشوو، بەش ٢، ل١٢١٣، فەرمووودەی ژمارە ٣٦٧٨.

– الشيباني، مسند الإمام أحمد بن حنبل، سەرچاوەی پێشوو، بەش ١٥، ل٤١٦، فەرمووودەی ژمارە ٩٦٦٦.

[2]. البخاري، صحيح البخاري، سەرچاوەی پێشوو، بەش ٥، ل٢١٩٧، فەرمووودەی ژمارە ٥٥٠٥.

[3] . Lewis, *The middle East: 2000 years of History* …, p. 72.

یارمـەتیی پێغەمبـەر (درودی خـوای لەسـەر)یـان دەدا.[1] لـە ئـەنجامی بەشـداریکردنیاندا لـە هـەموو چـالاکییەکان، هـەمووان دەربـارەی خێزانەکانی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) و کچەکانی و پوورەکانی و هـەروەها ئافرەتـانی نـاوداری تـر زۆریـان دەزانـی، دیـارە ئەگـەر ئـەو ئافرەتانە لە ماڵەوە بەندکرابن و پەیوەندییان بە پیاوانـەوە نـەکردبێت، بەو شێوەیە نەدەناسران.

هەنـدێ لـە ئافرەتـان پـێش پێغەمبـەر (درودی خـوای لەسـەر) دەموچـاویان دادەپۆشـی، بـەڵام ئافرەتـانی دوایـی ئەمـەیان نـەدەکرد، پێغەمبەریش (درودی خوای لەسەر) لە ئاست هەڵوێستی بەسۆزی خۆی توندیی بەکار نەهێنا تا بە زۆر دەموچاویان دەربخەن، بەڵام فەرزی کرد بەسەریاندا لە کاتی نوێـژ و عـومرە و حەجـدا دەموچـاویان دانەپۆشـن. هەندێ لە یاوەرانی دەیانویست چوونی ئافرەتـان بـۆ مزگـەوت قەدەغـە بکـات، بـەڵام ڕاشـکاوانە و بـە تونـدی ڕێگـەی لەوانـە گـرت ئـەو کـارە بکەن.[2] بەم پێیە حوکمی ژمارەیەك لە زانایانی ئیسلامی – ئەوانەی لە

---

[1]. أبو شقة، عبدالحليم محمد. تحرير المرأة في عصر الرسالة، الكويت، دار القلم، ۱۹۹۰م،بەرگ۳، ل۳۳۲–۳۳۳. هەروەها بڕوانە:

-Roded, Ruth. *Women in Islamic Biographical Collections from Ibn Sa'ad to Who's Who.* Boulder and London: Lynne Reinner Publishers, 1994, p. 35.

[2]. دەقـی فەرموودەکـە: "لا تمنعـوا إمـاو الله مـساجد الله" ئـیبن عومـەر هێناویەتیـەوە لـە سـەحیحی موسلیمدا، بەرگ ۱، ل۱۳٦:۳۲۷، "کتاب الصلاه، باب خروج النساو الی المسجد". لَـا تَمْنَعُـوا النِّـسَاءَ مِنْ الْخُرُوجِ إِلَى الْمَسَاجِدِ بِاللَّيْلِ.

ڕابـردوودا ڕێزیـان لـێ دەگـیرا، لـە ئایندەشـدا ڕێزیـان لـێ دەگـیرێ، لـە کاتێکدا کە پێویستە لەسەر ئافرەتان بە پێی شـەریعەت جلـی بـاڵاپۆش بپۆشـن، لەگـەڵ ئەوەشـدا مـەرج نییـە دەموچـاویان دابپۆشـن، یـان لـە ماڵەوە بمێننەوە و خۆیان بەند بکەن.[1]

ئافرەتـان، نموونەیـەکی باشـن لـە کتێبـەکانی مێـژوو و تەفـسیر و فـەرموودە و فیقهـدا. ژیاننامـەی یـاوەرانی پێغەمبـەر (درودی خـوای لەسەر) زیاتر لە ١٢٠٠ ئافرەتی تێدایە، واتە نزیکەی ١٠٪ تا ١٣٪ی کۆی بەندەکان (البنود) بوون.[2] لە هەردوو سەردەمی ئومەوی و عەباسـیدا، ئافرەتـان تـا ڕادەیـەك ئازادییـەکی هاوشـێوەی سـەردەمی پێغەمبـەر (درودی خوای لەسەر)یان هەبوو. ژمارەیەك لەوانە، وەك دایکی هاروونە ڕەشید و ژنەکەی و کچەکەی، ڕۆڵی گرنگیان لە کۆمەڵگاکانیاندا بینیوە. دوای خوێندنەوەی مێژووی هەزاران ئافرەت لە ٤٠ کۆمەڵەی بیبلۆگرافیدا کـە بـۆ سـەدەی نۆیـەم دەگەڕێتـەوە، ڕوث ڕۆیـد (Ruth Roded) وانەبێـژ لـە زانکـۆی قودسـی عیـبری، هـیچ بەڵگەیـەکی نەدۆزیوەتـەوە پشتگیریی ئەو ڕایە بکات کە ئافرەتـانی موسـڵمانان "پـەراوێز خـراون و ئازاد نەبوون"، بۆیە گەیشتە ئەوەی کە "زۆر جار وێنەیـەکی نـەرێنیی

---

1. أبو شقة، تحرير المرأة في عصر الرسالة، سەرچاوەی پێشوو، بەرگ٢، ل١٥ و ٨٣–١٣٧.

2. Roded, *Women in Islamic Biographical Collections*, p. 19.

ڕۆڵـی ئافرەتـان لـە کۆمـەڵگای ئیـسلامیدا پیـشان دراوە، کـە ڕاسـتیی مێژوویی قبووڵی ناکات".[1]

تاوەکو سەردەمی عوسمانییەکان، ئافرەت موڵکایەتی خۆی هـەبوو، تا لە ژیاندا مابوو پیاوەکەی نەیدەتوانی دەسـتی بـۆ بـەرێت. ئافرەتـان ئەوقافیان دادەمەزراند بـۆ پاڵپـشتیی خوێنـدن و شـتی تـر، وەك کـاری خێـر. ئەمـە بەڵگەیـە کـە ئافرەتـان موڵکیـان هـەبووە.[2] لـە لێکۆڵینەوەکەیدا لە حەلەب، ڕۆدیـد (Roded) تووشـی "سەرسـوڕمان بوو کاتێ بینیـی ٤١٪ ی ئـەوقاف ئافرەتـان دایانمەزرانـدووە، ئـەوقافی ئافرەتانیش جیاوازییەکی ئەوتۆی لەگەڵ ئـەوقافی پیـاوان نـەبووە".[3] ئافرەتـان کـاری کـشتوکاڵ و بازرگـانی و پیـشەی دەسـتییان دەکـرد و خاوەن زەویوزار بوون.[4] دادگاکانیش بە تەنگەوە بـوون بـۆ پاراسـتنی مافی ئافرەتان، بە تایبەتیش مـافی میراتـی، بـە پێـی شـەریعەت.[5] وەك دەردەکەوێت، ئافرەت دووچاری شوورەیی نەدەبوو کاتێ خـودی خـۆی لە دادگا ئامادە دەبوو، زۆرێکیان کاروبـاری خۆیـان بـەڕێوە دەبـرد بـێ ئـەوەی پـەنا بـۆ پیـاوان ببـەن. شـانزمیلەر (Schatzmiller) لـە چوارچـێوەی نووسـینی دەربـارەی جیهـانی ئیـسلامی لـە سـەدەکانی

---

1 . Ibid. , p. viiiand ix.
2 . Ibid. , p. 123.
3 . Ibid. , p. vii.
4 . Faroghi, "Crisis and Change. ", p. 599and 605.
5 . Schatzmiller, *Labour in the Medieval Islamic World*, p. 362.

ناوەڕاستدا، دەڵێت: "ڕاوەستان و دوورکەوتنەوە لە کاری دەستی و هاوبەشییەکی سنوورداری ئافرەتان لە چالاکییە ئابوورییەکان و هێزی کاردا، هیچ پشتگیرییەکی لێ ناکرێت".[1]

ئەو وێنەیەی لەوێدا دەردەکەوێت، زۆر زۆر جیاوازە لەوەی ئێستا لە زۆربەی وڵاتە ئیسلامییەکاندا دەبینرێت، چونکە ئێستا ئافرەتان نەخوێندەوارن و دوورخراونەتەوە و بێبەش کراون لەو مافانەی کە ئیسلام پێی بەخشیون، لە کۆمەڵگاکانیاندا هیچ ڕۆڵێکی ئەوتۆیان نییە. لە هەندێ کۆمەڵگای ئیسلامیدا دەبینین بێ بەش کراون لە میراتگریی موڵك و ماڵ، بەدەر لە حەرەمی مەککە و مزگەوتی پێغەمبەر، بە دەگمەن ئافرەت لە مزگەوتەکاندا دەبینرێت، لە مانگی ڕەمەزاندا نەبێت، ئەمەش تەنیا لە هەندێ وڵاتاندا. بۆیە مرۆڤ پرسیار لە هۆکارە مێژووییەکان دەکات بۆ ڕوودانی ئەم گۆڕانکارییە. وا دیارە تا ئێستا هیچ ڕاڤەیەکی سۆسیۆلۆژی پێشکەش نەکراوە، گرنگ ئەوەیە ئەگەر یەکێك لە هۆکارە گرنگەکان ئەگەر بدۆزرێتەوە، ئایا دەگەڕێتەوە بۆ نەبوونی ئاسایشی ژیان و ماڵ و موڵك، کە لە ئەنجامی هەژانی سیاسییەوە دروست بووە و لاوازی جێبەجێکردنی یاسا و ڕێنماییەکانە، کە بە شێوەیەك لە ماوەی چەند سەدەیەکدا لە سەرەتای بەشی کۆتایی سەردەمی عەباسییەکان، تاوەکو سەردەمی بوەیهییەکان (٣٣٤–

---

[1] . Ibid. , 399.

٤٤٧ك/٩٤٥–١٠٥٥ن) و ســـەلجوقییەکان (٤٤٧– ٥٩٠ك/ ١٠٥٥–١١٩٤ن) بڵاوبووبووەوە.

لەوانەیە داگیرکردنی دڕندانەی مەغۆل (٦٥٦– ٧٥٦ك/ ١٢٥٨–١٣٥٥ن) و داگیرکردنــی دڕندانــەی تــەیموور لــەنگ (٧٣٦– ٨٠٧ك/ ١٣٦٦–١٤٠٥ن) بووبنە هۆکار بۆ دوورخستنەوەی ئافرەتان بەمەبەستی ڕزگارکردنیـان لـە دەسـت بـۆ بـردن و یەخـە گرتنیـان.[1] لـە کـاتی تێکـچوون و گەنـدەڵی و شێواندنی بارودۆخدا، (فیقھ) ڕێگەی بە گرتنەبەری ڕێوشـوێنی پێویسـت و بەربەست بۆ بەرگرتن بە کێشە و ئازاردان داوە، بـەڵام لـە کـاتی ئاسـاییدا شــەریعەت ڕێگــە بــەو ڕێوشــوێن و بەربەســتانە نــادات.[2] لەبەرئــەوەی تێکچوون و شڵەژان چەند سەدەیەك بەردەوام بوو، ئەو ڕێوشوێنە توندانـە لەوانەیـە بـۆ ماوەیـەکی کـاتی قبـووڵکراو بێـت، بـەڵام چەسـپان و بوونـە هەمیــشەیی، بوونــە تایبەتمەندییــەکی کۆمــەڵگای ئیــسلامی. ســەرەڕای ئەمەش، دابونەریتە ناوخۆییە باوەکان یامەتیدەر بوون بـۆ درێـژەدان بـەو ڕێگرییانە و خەڵکیش بەردەوامبوون لەسەر ڕێوشوێنی خۆیان. زۆرێـك لـەو نەریتانە نەمان کە ئیسلام بۆ ئەوە هات قەدەغە یان چاکیان بکات، بـەڵام هەندێکیان بوونە نەریتێك کە بە ئیسلامەوە لکان، کە ڕێوشوێنێکی وا نییە بۆ ئەوەی جەماوەر فێری بەهاکانی ئیسلام بکرێت.

---

[1]. بۆ زانین دەربارەی دڕندایەتیی تەیموور لەنگ، بڕوانە:
- *Hodgson, The Venture of Islam*, Volume 2, p. 433.

[2]. بڕوانە: أبو شقة، تحرير المرأة في عصر الرسالة، سەرچاوەی پێشوو، بەرگ٣، ل١٨٣و١٩٩.

لە هەندێ وڵاتـانی ئیـسلامی، جیاکردنـەوەی ئافرەتـان زۆر بـە تونـدی دەکرێت، بە ڕادەیـەك کـە پیـاوان و ژنـان لـە دوو جیهـانی تـەواو جیـاوازدا دەژین، هیچ کارلێکردنێك لە نێوانیاندا ڕوو نادات بێجگـە لـەناو خێزانەکـەدا نەبێت. ئەمە بووەتـە هـۆی ئـەوەی کـە پیـاوان و ژنـان نـەتوانن بـە ڕۆڵـی خۆیان هەستن و هاوکاری یەکتر بن. ئافرەتان بێ بەش کراون لـە خوێنـدن و سەربەخۆیی ئابووری. لە ناوچە گوندنـشینەکاندا ئافرەتـان دەتـوانن بـە لای کەمەوە لە کێڵگەدا کار بکەن، بەڵام لە ناوچە شارنـشینەکاندا نـاتوانن هیچ ڕۆڵێکی گرنگ ببینن، بێجگە لە کاری ناومـاڵ نـەبێت. نەخوێنـدەواریی ئـــافرەت و بەنـــدکردنیان لـــە ماڵـــەوە و پـــشتبەستنی تـــەواویان بـــە هاوسەرەکانیان بۆ دابینکردنی هەر پێداویستییەکی ڕۆژانـە، دەبێتـە هـۆی ئەوەی نەتوانن پشت بە خۆیـان ببەسـتن و مـافی خۆیـان کـە ئیـسلام پێـی بەخشیون، وەربگرن. ژمارەیەك لە زانایان هەستاونەتەوە بۆ بـەرگریکردن لێیــان، هــەوڵیان داوە هەڵوێــستی ڕاســتەقینەی ئیــسلام لــەبارەی ئــەم بابەتەوە ڕوونبکەنەوە.(1) هـەر کۆمەڵگایـەك نیـوەی دانیـشتووانی پـەراوێز بخرێت و نەتوانن ڕۆڵی تەواوی خۆیان ببیـنن، حـەز و ئارەزووەکانیـان کـە خوا پێی بەخشیون، وەبەرنەهێنرێن، بێگومان ئەو گەشەکردنە ناتەواوە.

---

[1] . لەو کارانەی کە گرنگیی تایبەتییان هەیە، کتێبی (تحرير المرأة في عصر الرسالة) لـە شـەش بەرگـدا، دانانی کۆچکردوو (أبو شقه)یە لە ساڵی (١٩٩٠) کـە سـەرکردەیەکی بـەناوبانگی ئیخـوان موسـلیمینە لـە میسر.

# بەشی حەوتەم

# هەندێ پەند و ئامۆژگاری لە مێژووی ئیسلامەوە

مێــژووی ئیــسلام ڕوونیدەکاتــەوە کــە هــەموو بنــەماکانی هــەر شارستانییەتێك، لەناویدا گـەل و تێڕوانینـی پێکهاتـەی و بیروبـاوەڕی و بـەهاکانی، حکومـەت و ئـابووری و دادپـەروەری و گەشـەپێدانی، هـەر هـەموویان ڕۆڵێکـی تەواوکـەری پێکەوەگرێـدراو لـە گەشـەکردنی یـان داڕمـانی شارسـتانییەتەکەدا دەبیـنن. لەوانەیـە یـەکێك لەمانـە ببێتـە ئامێری دەستپێك، لەوانەیە بنەماکانی تر لەگەڵ کاتدا و لە چوارچێوەی هۆکاری کرداری خولاویدا کاریگەرییان هەبێت. هـەر وەك دەردەکـەوێت مرۆڤـەکان خۆیشیان ڕۆڵی یەکلاییکەرەوە لەم کردارەدا دەبینن، چونکە ئەوان تەنیا ئامانجی گەشەپێدان نین، بـەڵکو هـەر خۆیـان هۆکاریـشین. لەبـەر ئـەوەی ئـەوان ئامـانجن، پێویـستە خۆشـگوزەرانییان بـۆ دابـین بکرێت، ئەگەر ئەمە نەکرا، هەست بە هاندەرێك ناکەن کە کـاری بـاش و

ڕێکوپێك بکەن، ناشتوانن داهێنـان بکـەن. ڕەنگـە لـە توانایانـدا نـەبێت باشـتر لـەوەی دەیتـوانن پێـشکەشی بکـەن، لـە پێنـاو گەشـەپێدانێکی سەرتاسەری بۆ کۆمەڵگا و مرۆڤایەتی، ئەگەر شتە سەرەتاییەکانیان بـۆ دابین نەکرێت کە بریتین لەمانەی خوارەوە:

- پێگەیاندنی گەل بە پێگەیاندنێکی ڕەوشتی و فێرکاریی ڕاسـت، بـە تایبەتی نەوەی نوێ، لە پاڵ ڕاهێنان لەسەر ئەو کارانەی پێویستن.

- بڵاوکردنەوەی دادپەروەری و یاسا و سیستم، دابینکردنی ئاسایشی ژیان و موڵك و ماڵ، پارێزگاری لە ئابڕووی هەموو تاکێك.

- دابینکردنی هەلی کاری گونجاو و کاری تایبەتی، بۆ ئەوەی هەموو کەس تواناکانی خۆیان بە ڕێگەیەکی بەرهەمهێنەرانـە بـەکار بهێـنن، بـە مەبەسـتی چـاککردنی بـار و گوزەرانیـان، سـەرەڕای خۆشـگوزەرانیی کۆمەڵگاکە.

ڕەنگە نەتوانرێت ئەم هەموو داواکارییانە بە بێ تێڕوانینێکی پێکهاتـەی گونجاو جێـەجێ بکرێـت کـە بـەهاکان و ڕێنماییـەکانی ڕەفتـار دەسـتەبەر بکات، هەروەها بە ڕوونی مافەکانی تاکەکانی کۆمەڵگا و بەرپرسـیارێتییان دیاری بکات. ئەم بەهایانەش لە ڕێی خۆیەوە لەوانەیە مانای نەبێت، ئەگەر بە یەکسانی و بێ لایەنانە جێبەجێ نەکرێن، کە ئەمەش سوودی هەموانی تێدایـە، لـە چوارچـێوەی حکومـەتێکی کاریگـەر و دڵـسۆز و بـەهێز و بەرپرسیار لەبەردەم گەلدا. لە کاتێکدا بەرزیی ڕەوشتی هەموو تاکەکان بۆ خوشـگوزەرانیی مرۆڤـەکان دەسـتی لێهـەڵناگیرێ، چـونکە گەشـەپێدان

سامانی کۆمەڵگایـە و ئـەویش گرنگیـی خـۆی هەیـە، لـە پێنـاو چـاککردنی خۆشـگوزەرانیی مـاددی بـۆ گـەل، تـا هانبـدرێن کـە چـی لـە توانـا بێـت پێشکەشی بکات، هـەروەها بـۆ دەسـتەبەرکردنی داهـات بـۆ دەوڵـەت، بـۆ ئەوەی بە شێوەیەکی کاریگەر ئەرکەکانی خۆی جێبەجێ بکات. سـامان و گەشەپێدانیش لەگەڵ تێپـەڕینی کـات و زۆربـوونی ژمـارەی دانیـشتووان و ئـەو بەربەرەکانێیانـەی ڕووبـەڕوویان دەبنـەوە، گرنگییـەکی گـەورەتریان دەبێـت، ئـەرکی دەسـتەڵاتیش زۆر قورسـتر دەبێـت، بـەڵکو زیـاتر ئـاڵۆز دەبێـت. لەوانەیـە کۆمەڵگایـەك سـەرەڕای لاوازیـی ئـەو بنەمایانـەی ئـیبن خەلدون لە نموونەکەیدا ئاماژەی پێ دابوو، بۆ ماوەیەکی کورت پێشکەوتن بەخۆوە ببینێت، بەڵام ناتوانێت بۆ ماوەیەکی دوورودرێـژ پێـشکەوتنەکەی بـەردەوام بێـت، چـونکە لاوازیـی یـەکێك لـە بنـەماکان، کاریگـەری لەسـەر بنەماکانی تر و لاوازکردنیشیان دەبێت.

موسڵمانەکان توانییان تا ئاستێکی بەرز هەموو بنەماکان بەهێز بکـەن، بەڵام دوای ئەو دەستەڵاتی سیاسی کەمتەرخەمی لە ئەرکەکانیـدا دەکـرد، سـەرکەوتوو نـەبوو لـە جێبـەجێکردنی لایـەنی گـرنگ لـە شـەریعەت و دابینکردنی دادپەروەری و ئاسایشی ژیان و موڵك و ماڵ و ئابڕوو، هەروەها دابینکردنی دامودەزگای فێرکـردن و تەندروسـتی و بنـەما سـەرەکییەکان، کـە گـەل پێویـستی پێیـەتی بـۆ بەدەسـتهێنانی هـەموو تواناکانیـان. لـە ئـەنجامی ئەمـەدا، گەشـەپێدان دووچـاری نوشوسـتی هـات، لەگـەڵ ئـەو سامانەی کە بۆ گـەل و هێـزی سـەربازی و سیاسـیی حکومـەت بەردەسـت بوو.

## پەندی یەکەم

ئــەو پرســیارەی دێتــە ئــاراوە، ئەوەیــە: بۆچــی دەســتەڵاتداران لــە ئەرکەکانیاندا کەمتەرخەم بوون؟ وەڵامەکە لە پەندی یەکەمدایە کە لـە مێژووی ئیسلامییەوە وەرگیراوە، ئەویش بەرپرسـیارێتییە بەرانبـەر بـە گەل و نابێت نکوولّیی لیّ بکرێت، کە پێویستە لەسەر دەسـەڵاتداران لـە پێناو خۆشـگوزەرانیی گەلـدا بـە باشـی ئەرکـەکانیان جێبـەجیّ بکـەن، لەبەر ئەم هۆیەش ئیسلام سیستمی خیلافەت و شوورای داناوە. ئەگـەر رێگــە بــدرێت بــەم دوو دامەزراوەیــە بــۆ ماوەیــەکی درێژخایــەن بــە شــێوەیەکی بــاش و رێکوپێــك کــار بکــەن، ئــەوا چوارچــێوەی ئــەو کۆرپەلەیەی لـە سـەردەمی خەلیفـەکانی ڕاشـیدیندا پـەروەردە بـوو بۆ هەردووکیان و بۆ کاری باش و رێکوپێکی حکومـەت، ئـەوا هـەردووکیان وردە وردە پــێش دەکــەون _ لەگــەڵ هــەبوونی هەنـدێ نوشوسـتی و کەوتنی ناوبەناو – دەبوونە چوارچێوەیەکی دەسـتووری و یاسـایی زۆر پێشکەوتوو و ئالۆزتر لەوەی کە لە ڕۆژئاوا چەسپا. ڕەنگە ژینگەی لـەو ڕووبەرە جوگرافییە فراوانەی کۆمەڵگا جیاوازەکاندا — لەو ڕۆژانەدا — بۆ ئــایین گونجــاو نــەبووبێت، کــە پێــشینەیەکی ڕۆشــنبیری و سیاســیی هەمەجۆریان هەبووە. بۆیە موعاویە کە لـە ٤١ك/ ٦٦١ز، دوای ٣٠ سـاڵ لە کۆچـی دوایـی پێغەمبـەر، بـووە خەلیفـە، لـە ڕێگـەی بـەمیراتکردنی خیلافەتەوە بۆ کوڕەکەی پاش ٢٠ ساڵ توانیی ئەو سیـستمە ڕابگرێـت. لە ئەنجامی ئەمەشدا چـەندین شـۆڕش ڕوویـان دا، بـەڵام ڕێکخـستنێکی

ڕێکوپێك نەبوو کە زۆرترین جەماوەر دژی ئەم هەڵسوکەوتە بوروژێنێت و بگرێتە خۆ، بە تایبەتیش بە هۆی سستیی هۆیەکانی گواستنەوە و پەیوەندیکردن لەو ڕۆژانەدا.

نەدەتوانرا سیستمی خیلافەت و شوورا، مۆرکی دامەزراوەیی وەربگرن، لەبری ئەوەی گواستنەوەی دەستەڵات بە شێوەیەکی ڕێکوپێك پشت بە توانا و ڕەوشت ببەستێت و کۆمکاری کۆمەڵگای لەسەر بێت، هەر وەك شەریعەت دەیەوێت، چونکە گۆڕینەوەی دەستەڵات بە ڕێگەی میراتی و هێزەوە دەکرا. ئەمەش بووە هۆی زیادبوونی شەڕی خیلافەت و پەرتبوون و لە یەك جیابوونەوە و نەبوونی لێپرسینەوە و کەمتەرخەمیی حکومەت لە ئەرکەکانیدا. ئەنجامەکەشی ڕوودانی قورسترین لەتبوون بوو لە مێژووی ئیسلامیدا. کریمەر (Kramer) ڕاستی پێکاوە کە دەڵێت: "هۆیەکانی داڕمان بۆ دەستەی سیاسی دەگەڕێتەوە".[1]

لەگەڵ ئەوەشدا دەستەڵاتی سیاسی لەگەڵ نەمانی خیلافەتدا نەڕووخا تاوەکو ببێتە زۆرداری، ئەمەش لە گۆمەڵگایەکدا گونجاو نەبوو کە پێغەمبەر(درودی خوای لەسەر) گیانی بەهای ئیسلامی تێدا چاندبن. شەریعەتیش هەر بە سەرچاوەی سروشیی گەل مایەوە، بە لای کەمەوە بۆ بەدەستهێنانی بەربەستێکی ڕەوشتی لەبەردەم حکومەتدا، کە

---

[1] . Kramer, J. H. "Othmanli. " *The Encyclopedia of Islam*, Leiden: Brill, Vol. 8, p. 1995. , p. 197.

ئامـادە نـەبوو خـۆی دووربخاتـەوە لـە پۆشـینی عـەبای شـەریعەت، سـەرەڕای ئـەوەی زۆر گـوێی بـە جێبـەجێکردنی هـەموو ڕێنماییـەکانی نـەدەدا. هـەروەها لـەناو زنجـیرە دەسـتەڵاتدارەکاندا، هەنـدێ دەستەڵاتداری بەتوانا و خاوەن ویژدانی زینـدوو هـەبوون، کـە هـەوڵیان دەدا چاکسازی بکـەن، ئەگـەر کـەمیش بـووبن، ئەمـەش لـە ئـەنجامی ڕێنماییی دامەزرێنەرانی دەستەڵاتی سیاسییەوە نەبوو، بەڵکو هـاوڕابوو لەگەڵ ئەوەی سیستمی خیلافەت و شوورا دەیانەوێت.

## پەندی دووەم

نـەبوونی لێپرسـینەوەی سیاسـی، وردە وردە بـەرەو ژمارەیـەك کەموکووڕی دەڕوات کە زیان بـە دادپـەروەری و گەشـەپێدان وەك یـەك دەگەیەنێت. یەکێك لەو کەموکووڕییانە نەبوونی ئازادیی بیروڕا بوو، کـە گەیشتبووە ئەوەی گەل نەیدەتوانی بە شـێوەیەکی ئاشـکرا ڕەخنـە لـە دەستەڵات بگرێت و قـسە لەسـەر سیاسـەتی حکومـەت بکـات. ئەمـەش بووە هۆی زەمینە خۆشکردن بۆ یەکسان نەبوونی لەبەردەم یاسادا، کە سەرپێچییەکی تەواوی شەریعەتە.[1] لە ئـەنجامی ئـەوەدا، خـەریك بـوو هۆکاری چاکسازیی سیاسی لەناو دەچوو. پاشان ئەگەری چاکسازی بـە شێوەیەکی زۆر پاشەکشێی کـرد، گەنـدەڵی زۆر بـوو و لێپرسـینەوە لـە

---

[1]. دکتۆر ئەنەس زەرقا باشی پێکاوە لە سەرنجە بەهادارەکانی لەسەر ئەم کتێبە بە دەستنووسـی، کـە دەڵێت: ئەم شتە، هەتاوەکو ئەم ماوانەی دواییش بەسەر هەموو کۆمەڵگاکاندا جێبەجێ دەکرا.

ستەم نەما، داهاتی گشتی – بە شێوەیەکی بەرفراوان– لە پێناو ڕابواردن و خۆشیی کۆشکی شاهانە بەکاردەهێنرا، بەردەوامی هەڵمەتی سەربازی بە مەبەستی فراوانکردنی هەرێمایەتی، بە تایبەتی لە سەردەمی عوسمانییەکاندا. لە ئاستێکی زۆر نزمدا گرنگی بە بنیاتی ئومەت دەدرا، وەك فێرکردن و تەندروستی و لێکۆڵینەوەی زانستی و دامەزراندنی بنیاتی سەرەکی، بەم شێوەیە تۆوی دواکەوتنی ڕەهای موسڵمانان چێنرا، بە تایبەتیش لە بواری تەکنۆلۆژیای شارستانی و سەربازیدا.

گەشەپێدانە لەسەرخۆکە ئەوەندە نەبوو کە بتوانێت داهاتێکی تەواو بۆ حکومەت بهێنێتەوە. سەرەڕای ئەوەش خەرجی بە بەردەوامی زیادی دەکرد و هاوسەنگیی بودجەش زیاتر تێکدەچوو. بۆ قەرەبووکردنەوەی زیاتر، پەنا بۆ سەپاندنی باجێکی زۆر برا، سەپاندنی باجیش ئاستی توانای خەڵکی تێپەڕاندبوو و بووە هۆی کەمیی پارە و فرۆشتنی پلە و پایەی گشتی، ئەوەش بووە هۆی دامەزراندنی کەسانی بێ توانا لە پلە و پایەی باڵادا و زیادەڕۆیی لە قەرزکردندا. دادپەروەریی کۆمەڵایەتی – ئابووری، کە مەبەستی ئیسلامە و مەرجێکی بنەڕەتیی گەشەپێدانە، دووچاری نوشوستییەکی گەورە هات. کشتوکاڵیش تووشی وەستان بوو، جووتیار و خاوەن پیشە و دارتاشەکان هەژار کەوتن. هاوکاریی نێوان گەل و دەستەڵات لاواز بوو، خەڵکی باش کەمبووەوە. ئابووری نەیدەتوانی پێداویستییە زۆرەکانی گەل و حکومەت دابین بکات. لە

ئەنجامی ئەمەشەوە جیهانی ئیسلامی کەوتە حاڵەتێکی دواکەوتوو لە بواری گەشەپێدانی گشتگیردا. ئەمەش وای لێکرد نەتوانێ ڕووبەڕووی بەربەرەکانێ ئابووری و سەربازییەکان ببێتەوە، کە دەرئەنجامی ڕابوونی خێرای شارستانیی ڕۆژئاوا بوو.

## پەندی سێیەم

دەستەڵاتی سیاسی ناتوانێت تێڕوانینی پێکهاتەی خۆی بەسەر گەلدا بسەپێنێت. ئەم هەوڵانە هاوکاریی نێوان گەل و حکومەت دەپچڕێنێت، تووڕەبوونی کۆمەڵایەتی زۆرتر دەکات و بارودۆخی گەشەپێدانیش تێك دەدات. هەوڵەکەی مەئمون بۆ سەپاندنی تێڕوانینی پێکهاتەی موعتەزیلە بە هێزێکی زۆردار بەسەر گەلدا، بووە هۆی دوورکەوتنەوەی زانا لەخواترسەکان کە ڕێزێکی زۆریان لێ دەگیرا، ئەوانەی پاش هاتنی ناشەرعییەتی سیاسی و زۆربوونی ڕابواردنی کۆشکی شاهانە و ستەمی کۆمەڵایەتی – ئابووری، دەستەڵاتدارانیان خراپ کرد. لەبەرئەوەی گەل متمانەی بە زانا لەخواترسەکان هەبوو، بۆیە ڕێکنەکەوتنی زانایان و دەستەڵات، بە شێوەیەك لە شێوەکان ڕەنگدانەوەشی لەسەر کزبوونی پەیوەندیی نێوان دەستەڵات و گەل هەبوو، وردە وردەش حاڵەتی گرژی و ناکۆکی زیاتر دەبوو، ئەمەش لە کۆتاییدا بووە هۆی کەوتنی عەباسییەکان.

هاوشـێوەی تاقیکردنەوەکـەی مـەئمون، لـە یـەکێتیی سـۆڤیەت و ئـەورووپای ڕۆژهـەڵات و چـین و تورکیـا و جـەزائیر و تـونس، دەبیـنین پـشتگیریی لـێ کـرا. هـەموویان ئامـاژەن کـە بێـزاری و تێکـچوون لـە ئـەنجامی پەنابردنــە بــەر هێــز بــۆ ســەپاندنی تێڕوانینــی پێکهاتــە ناپەســەندەکەیان لەلایـەن گەلـەوە، ئـەم دووانـە هـەر وا لـە حاڵـەتی هەڵـچووندا دەمێننـەوە، دەبنـە هـۆی ڕووخانـدنی ئـەو بـە یەکـەوە نووسانەی نێوان گەل و حکومەت و زیادبوونی نائارامی و ناکۆکی.

زەبروزەنگ، هیچ کات سـەرکەوتوو نـەبووە و نابێـت، چـونکە کـاتی خـۆی بـەکارهێنانی زەبـروزەنگ لەلایـەن کەنیسەوە، تـا ئاسـتێکی زۆر هۆکاربوو بۆ سەرکەوتنی بزووتنەوەی ڕووناکبیری، کە لە شێوەدا دژ بە ئایین بوو. ئەگەر کەنیسە پـشتی بـە نزیخـستنەوەیەکی زیـاتر عـەقڵانی ببەستایە، ئایین دووچاری ئەو نوشوستییە نەدەهات کە لە ڕۆژئاوا ڕووی دا. ئەگەر موعتەزیلەش هێزیان بەکارنەهێنایە، عەقڵانییەتیش دووچاری ئــەو نوشوســتییە نــەدەهات کــە لــە جیهــانی ئیــسلامیدا ڕووی دا. ئاوێتــەبوونێکی ئــازاد بــۆ بــیروڕا عــەقڵانی و تەقلیدییــەکان، ڕەنگــە بارودۆخێکی گونجاوتری بهێنایەتە ئاراوە. لە ئەنجامی بەکارهێنانی هێز بـۆ سـەپاندنی ئـەو بیروڕایانـەی گـەل قبـووڵی نـەبوو، کاردانەوەیـەکی پەڕگیرانە دژی عەقڵانییەکان ڕووی دا، بـووە هـۆی گـرژی و ئـاڵۆزی لـە جیهانی ئیسلامیدا، هەر ئەمەش بووە هۆی — لە کۆتاییدا — نەخوێندنی بابــەتی زاســتی لــە خوێنــدنگا ئایینییەکانــدا. ســەرەڕای ئــەوەش،

دابیننــەکردنی دارایــی لــە پێنــاو فێرکردنــی زانــستدا، وای لــە زانــست و تەکنۆلۆژیا کرد پاشەکشێ بکەن، هەر ئەمەش وای لە جیهانی ئیـسلامی کـرد، دەستەوەسـتان بێـت لـە ڕووبەڕووبوونـەوەی ئـەو کێبڕکێیانـەی هەبوون. لە ئـەنجامی گـرژی و ئاڵۆزییـەکان و گومـان، خوێنـدکارەکانی خوێندنگا ئایینییەکان لە کەرەستەکانی شیکردنەوە بێبەش کران، لە بۆ پێشخستنی (فیقه) و زانستە ئایینییەکانی تر پێویستیان پێی بوو.

## پەندی چوارەم

کاتـــێ گـــەل بـــە شـــێوەیەك لـــە تاقیکردنەوەکـــەی مـــەئمون دووردەکەوێتەوە، حکومەت پـشتگیریی گـەلی نامێنێـت، بـۆ ئـەوەی لـە دەستەڵاتدا بمێنێتەوە، پشت بە پاسەوانی دەرەکی دەبەستێت. ئەمـە وا دەکات دەستەڵاتدارەکان بە بـارودۆخی خۆیـان ڕازی بـن و زیـاتر لـە گەل دوور بکەونەوە، ناکۆکییەکانیش بە بێ چارەسەر بمێننەوە. تا وای لێ هات گرژی و ئاڵۆزی زیاتر بوو و گەشەپێدان دابەزی، هەروەها بێگانە دەستی بەسـەر وڵاتـدا گـرت و پاسـەوانە بیانییـەکانیش لـە دەسـتەڵات هەڵگەڕانـەوە. ئەگـەر حکومـەت لـەبری ئـەوە سـتراتیژییەتی گفتوگـۆی بگرتایەتـــە بـــەر و دەســـتەڵاتی دابـــەش بکردایـــە و ناکۆکییـــەکان و گیروگرفتەکانی میللەتی چارەسەر بکردایە، ئەوکات بێ ئەوەی پشت بە هێزی دەرەکی ببەستێت، بنکەی دەستەڵاتی فراوان دەکرد و وڵاتیـشی لە وێرانکاری دەپاراست.

## پەندی پێنجەم

ئیسلام هۆی دارمانی موسڵمانان نییە. لە ڕاستیدا ئیسلام پێشتر و ئێستاش، قوربانیی لێنەپرسینەوەی سیاسی و گەندەڵی و توندوتیژییە. حەز و ئارەزووی دەستەڵاتی سیاسی لە بەکارهێنانی ئیسلام لە پێناو بەرژەوەندییە تایبەتییەکان، لە ڕێگەی بە زۆر دەرکردنی فەتوا کە لەگەڵ شەریعەتدا یەکناگرنەوە، یەکێك بوو لە هۆکارە گرنگەکانی داخستنی دەرگای ئیجتهاد و وەستانی فیقهـ، هەتاوەکو وای لێهات نەتوانێت ڕووبەڕووی کێبەرکێ نوێیەکان ببێتەوە. هەروەها پاڵی بە زانایانی لەخواترس و بەتواناوە نا کە خۆبەزلزانینیان ڕێگر نەبێت لە هاتوچۆکردنی کۆشکی شاهانە، لە پێناو خۆپاراستنیان لە گەندەڵی و پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤ، ئەمە وای لێکردن دووربکەونەوە لە ڕاستییەکانی ژیانی ڕۆژانە، بۆیە کەمتر کارا بوون لە بەجێهێنانی ڕۆڵی ئاسایی خۆیان لە هاوکاریکردن و چاکسازیی گەل و حکومەت و پشتگیریکردنی پێشکەوتنی (فیقهـ)، بە مەرجێك بتوانێت بە دەنگ ڕاستییە گۆڕدراوەکانی ژیانەوە بێت.[1]

---

[1]. ڕۆبیرت وابلز (Robert Whaples) باشی پێکاوە لە لێدوانە بەهادارەکانی لەسەر ئەم دەستنووسە، کە دەڵێت: پەندی وەرگیراو لە مێژووی ئیسلامی دەتوانرێت وا دابنرێت کە لە مێژووی مرۆییدا ڕۆیشت، چونکە ئەم هێزانە هەر خۆیان ئەڵقەی کراوەن، کە ڕۆڵیان نزیکەی لە هەموو کۆمەڵگادا هەبووە.

## دابەزین لەسەرەخۆ

هۆکارە بازنەییەکە پێویستی بە چەند سەدەیەك بوو بۆ ئەوەی تەواو ببێت، چونکە هەندێ دامەزراوەی کۆمەڵایەتی و سیاسی ئەرکی دەستەی سیاسییان جێبەجێ دەکرد، ئەمە بووە یارمەتیدەر بۆ سووککردنی ڕێڕەوی گلۆربوونەوەکە. گرنگترینی ئەو دامەزراوانەی هاوتەریبی گلۆربوونەوەکە بوون، خودی ئیسلام خۆی بوو، کە هەر – سەرەڕای ونکردنی ژیاری– سروشە بۆ خەڵکی و هەندێ کەرتە حکومییەکان لە زنجیرە جۆراوجۆرەکانی دەستەڵات. ئەمە یارمەتیدەر بوو بۆ پارێزگاریکردن لە شێوازی دادپەوەری و هەژاریی بەشێك لە دانیشتووانی سووك کرد، هەروەها هاوکاریی خێزانی و کۆمەڵایەتیی تا ڕادەیەك دابین کرد، ئەگەر ئیسلام نەبووایە ئەوا ڕووخانی موسڵمانان خێراتر دەبوو.

گەل هەر خۆی هەوڵی دا، بە تایبەتیش ئەو کەسانەی ویژدانێکی زیندوو و داراییان هەبوو، زانا لە خواترسەکان بەسەر کەمتەرخەمیی دەستەڵاتداراندا سەربکەون. زۆرێك لەو خزمەتگوزراییانەی دەبوایە حکومەت دابینی بکردایە، لایەنی خێرخۆزایی تایبەت دابینی دەکرد، بە تایبەتیش لە ڕێگەی دامەزراوەی ئەوقافەوە. لەو خزمەتگوزارییانەش: دروستکرنی خوێندنگا و نەخۆشخانە و بازاڕ، دابینکردنی ژمارەیەك کالا و خزمەتگوزاریی گشتی. سەرەڕای ئەمەش، زەکات و خێرەکان دەخرانە وەبەرهێنانەوە بۆ دابینکرنی خۆشگوزەرانی بۆ هەژار و نەدارەکان. ئەمەش – بە پلەی یەکەم – بۆ دووپاتکردنەوەی بەهاکانی ئیسلامە لەسەر گرنگیدان بە کاری چاکە و مانای برایەتی و گرنگیدان بە

نەدارەکان. ئەگەر ئەو کارە خێرخوازییانە نەبووایە، لەو ماوەی شپرزەیی و تێکـچوونی بـارودۆخ و نـەبوونی یاسـا و دارِمـانی ئابوورییـەدا، لەوانـەبوو بارودۆخی هەژاران و بێ دەرەتانـەکان لـە ئـەنجامی گـۆڕانی شارسـتانیدا، لەوپەڕی خراپیدا بووایە.

زانایان بـەردەوامبوون لـە بـەکارهێنانی مزگـەوت و خوێنـدنگاکان، بـەو سیفەتەی مەڵبەندی فێرکردنی ئایینی بـوون، لەگـەڵ ئەوەشـدا مزگـەوت و خوێندنگا ئایینییەکان و وتـاری هـەینی، تـەنیا بەشـی ئـەم کـارە گـرنگ و مەزنـەی کـە پـەیوەنـدیی بـە فێرکردنـی خـەڵك و چاکـسازییانەوە هـەبوو، نەدەکرد. لە یـەك بـە دوای یـەکی ئەندازەییـدا زۆر دەبـوون، لـە ئـەنجامی هاتنی جەماوەرێکی زۆری خەڵکی بۆ ڕیزی ئیسلام. ئەوانەی خوا هیدایەتی دابوون و هاتبوونە ڕیزی ئیسلامەوە، پێویستیان بە سیستمێکی فێرکردنی زیاتر ڕێکخەر و بڵاوتر هەبوو، بۆ ڕێنمایکردنیان بۆ تێڕوانینێکی پێکهاتەیی و بەها ئیسلامییەکان. ئەگەر ئەوە نەبووایـە، گۆڕانیـان زەحمـەت دەبـوو. لەبەرئـەوەی ئەمـە ڕووی نـەدا، خـەڵکی بـەردەوامبوون لەسـەر ڕێگـەی تایبـەتی خۆیـان، ئـەو کـارە زۆرانەشـی کـە ئیـسلام قەدەغـەی کردبـوون، بـەردەوام نـەبوون، یـاخود چاکـسازییان تێـدا کـرا و نـەك هـەر بـە بـێ گیروگرفت، بەڵکو پەیوەستبوو بە ئیسلامەوە. نـەدەکرا زانایـان داهـاتێکی تەواو بۆ ئەم ئەرکە کۆبکەنەوە، بە تایبەتیش کـە ئـابووری لـە حاڵـەتێکی سست و لاوازدا بوو.

# بەشی هەشتەم
# شکستهێنان لە سوودوەرگرتن لە پەندەکان

شەشسەد ساڵ بەسەر نووسینی پێشەکییەکەی ئیبن خەلدوندا تێپەڕی. وا چاوەڕوان دەکرا شیکردنەوەکەی ئەو پیاوە کە لە پلە و پایەیەکی ڕەوشتی و فیکریی ئاوادا بوو، لەلایەن دەستەڵاتدارانەوە گرنگییەکی باشی پێ بدرێت، کە هاندەریان دەبوو بۆ ئەوەی لە دەستەی سیاسیدا چاکسازی بکەن، کە ئیسلام لە پێناو لێپرسینەوەی سیاسی و دادپەروەری و گەشەپێداندا ڕایگەیاند، بەم شێوەیە توانستیان بە پێچەوانەی هۆکارە بازنەییەکە و ئاراستەکردنی بەرەو لایەنی ڕاستەقینە، جێبەجێ دەبوو، بەڵام ئەمە ڕووی نەدا. دارمانی تێکڕای موسڵمانان لەگەڵ ئەوەی دیاردەیەك نەبوو لەسەر هێڵێکی ڕاست بڕوات، بارودۆخی هەندێ وڵاتی ئیسلامی لە هەندێ وڵاتی تر باشتر بوو. هۆی سەرەکیش بۆ ئەم دارمانە گشتییە، ئەوەیە کە جیهانی ئیسلامی سوودی لە پەندەکانی مێژوو وەرنەگرتووە. نەبوونی

لێپرسینەوەی سیاسی کە دەستپێکی دارمان بوو، تا ئەمڕۆش بەردەوامە. جیهانی ئیسلامی، تا ئێستاش نەیتوانیوە ڕێوشوێنی گۆڕینەوەی دەستەڵات بە شێوەیەکی ڕێکوپێك بۆ دەستەڵاتێکی باشتر و بەتواناتر لەبەرچاوی خەڵکیدا دابنێت، هەر وەك ئەوەی کە قورئان بڕیاری لەسەرداوە.[1] هەروەها نەیتوانی بە شێوەیکی کاریگەر و دادپەروەرانە داهاتی گشتی بە پێی شەریعەت بەکاربهێنێت، ماوەش بدرێت بە بێ ترس و بە ئازادی ڕەخنە لە سیاسەتەکانی حکومەت بگیرێت.

## یەکەم: بارودۆخی ئێستا و نەبوونی دیموکراتییەت

دیموکراتییەت تەنیا لە سیازدە دەوڵەتدا هەیە، یان بە لای کەمەوە لە ٢٣٪ ی کۆی گشتیی پەنجا و حەوت وڵاتی ئەندام لە ڕێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامی، لە کاتێکدا لە چل و چوار دەوڵەتدا، یان لە ٧٧٪ یان دیموکراتییەتیان تێدا نییە. لەناو ئەو چل و چوار دەوڵەتەشدا، دیموکراتییەتێکی ساختە لە سی و یەك دەوڵەتیاندا هەیە، لە پێنج دەوڵەتیشیاندا دەستەڵاتی شاهانەی ڕەها هەیە، دیکتاتۆرییەتیش لە سیانیاندا، هەروەها پێنج دەوڵەتیشیان لە قۆناغی گۆڕانکاریدان.[2]

---

[1] . خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿إِنَّ أَكْرَمَكُمْ عِنْدَ اللَّهِ أَتْقَاكُمْ إِنَّ اللَّهَ عَلِيمٌ خَبِيرٌ﴾. الحجرات/١٣

[2] . پشتبەست بەو بەیاننامانەی کە پەیوەستە بە ساڵی ٢٠٠٢ز کە لە ڕێکخراوی جیهانی هەڵبژاردنەوە (Electionworld org) هاتووە. پێناسەی دیموکراتییەت کراوە، بریتییە لەو وڵاتەی پەیکەرەکانی

تەنانــەت ئــەو وڵاتــە ئیــسلامییانەی کــە دیموکراتییــەتیان تێدایــە، دیموکراتییەتێکـەیان بـە شـێوەیەکی ڕووکەشـە، هەڵبـژاردن دەکـات، پەیکەری دیموکراتییەتیش بۆ گۆڕینـەوەی دەسـتەڵات ئامـادە دەکـات، لەگەڵ ئەوەشدا بەرژەوەندیی تایبەت کە دەستێکی زۆری دەڕوات، جار لەدوای جار لە هەڵبژاردنەکەدا سەردەکەوێت. هەژاران و بەشخوراوەکان کــە زۆر جــار وەك ئــەوەی خۆیــان دەیانــەوێت نابێــت و ئــازادیی هەڵبــژاردنیان لێ زەوت دەکرێــت، بۆیــە نوێنەرایــەتییان لــە بنیــاتی دەستەڵاتدا لاوازە.[1] بەم شێوەیە دیموکراتییەت بە مانا ڕاستەقینەکەی نەچەسپاوە. لە کاتێکدا کرداری دیموکراتییـەتی کاریگـەر لـە جیهـانی ڕۆژئاوادا، هەنگاوێکی باشی بڕیوە لـە دابینکردنـی دەسـتەڵاتی کامـڵ و پێگەیـشتوو و بــەکارهێنانێکی کاریگــەری داهــاتی گــشتی لــە پێنــاو گەشــەپێدان، جیهــانی ئیــسلامیش لەســەرخۆ و بــە هێواشــی لەگەڵیــدا دەڕوا، بە هـۆی نـەبوونی لێپرسـینەوەی دەسـتەڵاتداران و دەسـتەڵاتی تەواو و پێگەیشتوو، کە ئەمانە دیموکراتییەت بەدییان دەهێنێت.[2]

---

دیمواکراتییەت و ئاڵوگۆڕی دەستەڵاتی تێدا بێت. دیموکراتییـەتی سـاختەش وا پێناسـە کـراوە کـە ئـەو وڵاتەیە کە پەیکەرەکانی دیموکراتییەتی تێدایە و ماوەی ئاڵوگۆڕی دەستەڵاتی تێدا نە بێت.

1 . Besley, Timothy and Robin Burgess. "Halving Global Poverty. " *Journal of Economic Perspectives*, 17:3, summer, 2003, p. 17

2 . ئێستا ژمارەیەکی زۆر لە ئەدەبیاتی بەردەست هەیە دەربارەی کاریگەریی ئەرێنیی دیموکراتییەت لـە "دەستەڵاتی تەواو و پێگەیشتوو"دا، دەستەڵاتی تـەواو و پێگەیـشتوویش لـە گەشـەپێداندا، بـۆ نموونـە بڕوانە:

## دووەم: کاریگەریی نەبوونی دیموکراتییەت لەسەر کۆمەڵگا و ئابووری

نـەبوونی دیموکراتییـەت، بـووە هـۆی ژمارەیـەك کـاری نابـەجێ لـە میانـەی کـاری هۆکـاری خولاوەییـەوە، یـەکێکیان بریتییـە لـە نـەبوونی ئازادیی ڕۆژنامەگەری. تـەنیا چـوار وڵاتـی ئیـسلامی ئـازادیی تێدایـە.[1]

---

- Mulligan, Casey, Richard Gil and Xavier Sal-i-Martin. "Do Democracies Have Different Public Policies than Non-democracies ?" Journal of Economic Perspectives, winter, 2004, p. 51-74.
- Kaufmann, Daniel, and Aart Kraay. "Growth without Governance. " World Bank, Policy Research Paper No. 2928, Washington, DC, 2002. (http://www. worldbank. org/wbi/governance/pubs/growthgov/html).
- Hall and Jones. "Why Do Some Countries Produce So Much MoreOutput per Worker Than Others?" *Quarterly Journal of Economics*, 114(1), 1999, P. 83-116.
- Kaufmann, Daniel, Aart Kraay, and Pablo Zoid-Lobaton. "Governance Matters. " World Bank, Policy Research Working Paper No. 2096, Washington, DC, 1999. , (http://www. worldbank. org/wbi/governance/pubs/growthgov/html).

- هەندێ نووسەریش مشتومڕیان لەسەر ئەوە کرد کە گوایە دیموکراتییەت ڕێگرە لـە گەشـەی ئـابووری، بە تایبـەتیش لـە وڵاتـە تـازە پێگەیـشتووەکاندا، چـونکە حکومەتـە دیموکراتییـەکان بـە شـێوەیەکی کاریگەر ناتوانن سیاسەتی پێویست بۆ خێراکردنی گەشەپێدان جێبەجێ بکەن. بڕوانە:

-Sirowy, Larry, and Alex Inkles. " The Effects of Democrasy on Growth and Ineqyality: A Review. " Studies in Comparative International Development, 25, 1990, P. 125-126.

-Johnson, John W. The Military and Society in Latin America. Stanford: Stanford University Press, 1964.

-MacIntyre, Andrew. "Democracy and Markets in Southeast Asia. " In Constructimg Democracy and Markets: East Asia ad Latin America, (ed. ), Los Angeles: International Forum for Democratic Studies and Pacific Council on International Policy, Pacific Council, 1996, P. 39-47.

ئەم جۆرە بیرکردنەوانە کاتێ دەرکەوتن کە یەکیەتیی سۆڤیەت لە ئەوپەڕی هێزیدا بوو، بازدانی گەورەی چینی گەورەش بەرەو پێشەوە، بەڵام وا دیارە ئێستا شوێنکەوتووانی ئەم بیروڕایە لە جاران کەمترن.

[1]. کاتێ چەمکی وڵاتە ئیسلامییەکان لەم بەشەدا بەکاردێت، ئاماژەیە بۆ پـەنجا و حـەوت ئەندامەکـە لـە ڕێکخراوی کۆنگرەی ئیسلامی، کە بۆ وڵاتە ئیسلامییەکان هاوشێوەی نەتەوە یەکگرتووەکانە.

چوارده وڵاتیش نیمچه ئازادی و سی و نۆ وڵاتیش تێیدا نییه.[1] نەبوونی توانای ڕەخنەگرتن لە حکومەت لە میدیاکان یاخود لە مینبەرەکانی دیکەی وەك پەرلەمان (شوورا)وە، یان لە ڕێگەی خۆپیشاندنی ئاشتییانەوە، دەبێتە هۆی لاوازکردنی (دەستەڵاتی تەواو و پێگەیشتوو) و نەبوونی ڕوونی و پەیڕەوکردنی سیاسەتی نادروست. هەروەها هاندەر دەبێت بۆ گەندەڵی و خراپ بەکارهێنانی داهاتی گشتی لە پێناو سوودی دەوڵەمەند و خاوەن دەستەڵاتەکان. گریمان ئازادیی ڕۆژنامەگەری لە هەندێ وڵاتاندا هەبوو، بەڵام ڕەخنەی گشتی کاریگەریی نابێت، چونکە دەستەڵاتدار دەتوانێت هەموو فڕوفێڵێك لە پێناو مانەوەی لە دەستەڵاتدا بەکاربهێنێت. لێکۆڵینەوە شیکارییەکان بە کۆدەنگ سەلماندوویانە، لە ئەدەبیاتی ئابووریدا گەندەڵی و دەستەڵاتی لاواز کاریگەریی نەرێنیی گەورەی لەسەر گەشەپێدان دەبێت.[2]

---

[1]. پشتبەست بەو بەیاننامانەی لە "ئازادیی ڕۆژنامەگەری ٢٠٠٤"دا هاتووە (www. freedomhouse. org) پێناسەی "ئازادی" و "نیمچە ئازادی" و "ئازادی نییە"ی کردووە، کە "بیت الحریه– freedomhouse" بەکاریهێناوە، کە ژینگەی یاسایی پەیڕەوکراو لە هەموو وڵاتێکدا (٠–٣٠ خاڵ)، سیاسەت (٠–٤٠ خاڵ)، ئابووری (٠–٣٠ خاڵ)ە، کە کاریگەریی لەسەر ڕۆژنامەگەری هەیە. تاوەکو کۆتوبەند زیاد بێت، ژمارەی خاڵەکان بەرزدەبێتەوە کە پەیوەستە بەو وڵاتەوە. هێمای کۆتایی هەر وڵاتێك پشت دەبەستێت بەم سێ پێوانەیە. هێمای سفر تا ٣٠، وڵات دەخاتە خانەی ڕۆژنامەگەریی ئازادەوە، ٣١ تا ٦٠ دەیخاتە نیمچە ئازادەوە و تا ١٠٠ دەچێتە خانەی نائازادییەوە.

[2]. Kaufmann etal. , "Governance Matter. ";Knack, Stephen and Philip Keefer. "Institutions and Economic Performance: Cross-Country Tests Using Alternative Institutional Measures. " Economic and Politics, Vol.

"ئاماژەکەری هەستکردن بە گەندەڵی" – کە دامەزراوەی "ڕوونیی نێودەوڵەتی" ئامادەی کردووە و بارەگاکەی لە بەرلینە – دەڵێت: ١٥٩ وڵات، نزیکەی لە نێوان دە نمرە (گەندەڵی کەمترە) تاوەکو سفر (گەندەڵی زۆرترە)ی تێدایە.[1] نیشانەی (٥) لە ئاماژەکەرەکەدا مانای بارودۆخەکە دەدات کە مامناوەندە. تەنیا شەش وڵاتی ئیسلامی هەیە لە سەروو ئەم مامناوەندەوە بن، هێماکان نزیکەی لە نێوان ٥,١ تا ٦,٣ دایە، چلودوو دەوڵەتیش لە خوار ئەم مامناوەندەوەن، بەڵام بەیاننامەی تر دەربارەی وڵاتانی دیکە لەبەردەستدا نییە. لەوانەیە زۆربەی ئەو وڵاتانەی دەربارەیان بەیاننامە لەبەردەستدا نییە، ئەوانیش لە خوار ئەم مامناوەندەوە بن. ئەوەی وات لێ دەکات کە هەست بە بێ ئومێدی بکەیت، تێبینی دەکەین شەش وڵات زیاتر لەو دە وڵاتەی گەندەڵییان تێدایە، وڵاتانی ئیسلامین، ئەو سێ دەوڵەتەشی زۆرترین گەندەڵییان تێدایە، هەر ئیسلامین. سەرەڕای ئەوەی کە قورئان دەستکەوتنی سەروەت و سامانی بە ستەم و دەستدرێژی حەرام کردووە،

---

7, No. 3, 1995, P. 207-27; Mauro, Paolo. "Corruption and Growth. " Quarterly Journal of Economics, Vol. 110, No. 3, 1995, p. 1.

[1]. بەیاننامانەکە بۆ ساڵی ٢٠٠٥ ز دەگەڕێتەوە و "ڕوونیی نێودەوڵەتی/ الشفافية الدولية Transparency International" گەندەڵی پێناسە دەکات بە: "خراپ بەکارهێنانی پۆستی سیاسی لە پێناو دەستکەوتێکی تایبەتی". هێماکە هەوڵ دەدات نمرەی ئەو گەندەڵییە باوەی تێدا ببینێت کە لەناو لێپرسراوانی حکومەت و سیاسییەکاندا هەبوو.

**هۆشدارییش دەدات لە قبوولکردنی سوو، کەچی ئەوە بارودۆخی وڵاتانی ئیسلامییە !**[(١)]

**گەندەڵیی پەیوەست بە نەبوونی ئازادیی بیروڕا، دەبێتە هۆی گەندەڵکردنی دادگاکانیش. لەم حاڵەتەدا، هیچ شتێکی تر لەبەردەستدا نییە جگە لە ئەگەرێکی کەم، ئەویش ئەوەی کە سەرانی دەستەڵات دووچاری سزادان ببنەوە. لە کاتێکدا تاوانباران سزای خۆیان وەرنەگرن، بێئابڕوویی دەبێتە نێرەو خۆی بۆ تەرخان دەکات، بە ڕێژەیەك کە گۆڕانی بارودۆخەکە زەحمەت دەبێت، دواتریش ڕیشەکێشکردنی شەڕخواز. ئەگەر تەنیا هەر هەژارەکان سزا وەربگرن، ناڕەزایی بەرز دەبێتەوە و پەیوەندیی نێوان حکومەت و گەل کەمدەبێتەوە، ئەوەش هاوکار دەبێت بۆ تێکچوونی بارودۆخی کۆمەڵایەتی و سیاسی، ئەمەش یەکێکە لەو هۆکارە سەرەکییانەی کە زیان بە گەشەپێدنی ئابووری دەگەیەنێت.**

**لە ئەنجامی گەندەڵی، سەرانی دەستەڵات بەشێکی زۆری داهاتە کەمەکە بۆ دروستکردنی کۆشك و بەردەوامیی ڕابواردن و خەرجکردنی بێ مانا و دوور لە بەهاکان بەکاردەهێنن، ئەمە وا دەکات حکومەت نەتوانێ خەرجیی تەواو بۆ فێرکردن و تەندروستی دابین بکات، هەروەها بنیاتی بنەڕەتی دابمەزرێنێت و خزمەتگوزاریی گشتیی پێویست لە**

---

[1]. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿يَا أَيُّهَا الَّذِينَ آمَنُوا لَا تَأْكُلُوا أَمْوَالَكُمْ بَيْنَكُمْ بِالْبَاطِلِ إِلَّا أَنْ تَكُونَ تِجَارَةً عَنْ تَرَاضٍ مِنْكُمْ وَلَا تَقْتُلُوا أَنْفُسَكُمْ إِنَّ اللَّهَ كَانَ بِكُمْ رحِيمًا﴾. النساء/٢٩.

پێنــاو گەشــەپێدانێکی خێـرا دابـین بکـات. هــەروەها گەنـدەڵی ڕێـژەی تێچوونی کەرتی تایبەتیش بەرزدەکاتەوە، بـەم شـێوەیەش کاریگـەریی نەرێنیی لەسەر ڕێـژەی قـازانج دەبێـت. بۆیـە پاشـەکەوتەکان دەچـێتە دەرەوە و وەبەرهێنانی ناوخۆییش بەرەو کەمبوونەوە دەچێت. ئەمەش بێگومان کاریگـەریی لەسـەر گەشـەکردن دەبێـت. لەگـەڵ ئـەوەی کـۆی دانیشتووانی وڵاتانی ئیسلامی کـە پـەنجا و حـەوت دەوڵـەتن و دەگاتـە (١٤١٥) ملیـۆن کـەس، ٢٢٪ ی دانیـشتووانی جیهـان پێکـدەهێنن کـە بریتییە لە (٦٤٣٨) ملێون کـەس.[1] کـۆی بەرهـەمی نـاوخۆیی گشتیی ڕاستەقینەیان (١٨٩١) ملیارە کە بە نرخی دۆلاری ساڵی ٢٠٠٠ز جێگیر کــراوە. ئەمــە تــەنیا ٢,٥٪ ی کــۆی بەرهــەمی نــاوخۆیی گــشتیی ڕاستەقینەی جیهانە کە دەکاتـە (٣٦٤١١) ملیـار دۆلار. ڕێـژەی توانـای کڕین و فرۆشتنی ئەم وڵاتانە لەسەر بنەمای کۆی بەرهەمی ناوخۆیی بـۆ هەر تاکێـك (٣٣٨١) دۆلارە، ئەمـەش ٤٠٪ی توانـای کـڕین و فرۆشـتنی کۆی بەرهەمی ناوخۆییە بۆ هەر تاکێك (٨٤٧٧) دۆلارە لە جیهاندا. ١٢٪

---

[1]. ئەم بەیاننامانەیە دەگەڕێتەوە بـۆ سـاڵی ٢٠٠٥ز کـە بـانکی گەشـەپێدانی ئیـسلامی لـە سـاڵی ٢٠٠٧ز ئاماژەی پێ داوە، بڕوانە: خشتەی ١-١ ل٩ لە:

-Islamic Development Bank (IDB). Statistical Monograph No. 27, Jeddah: Islamic Development Bank, May, 2007, p. 43.

لەو وڵاتانەی ئیسلامی نین موسڵمان هەن، هەروەها ناموسـڵمانیش لـە وڵاتـە ئیـسلامییەکاندا هـەن. بۆیە ئەم ژمارەیە، ژمارەی گشتیی موسڵمانان لـە نێـوان ١,٥ و ١,٨ ملیـاردا لـە هـەموو جیهانـدا پیـشان نادات.

ی توانـای کـڕین و فرۆشـتنی کـۆی بەرهـەمی نـاوخۆیی بـۆ هـەر تاکێـك (٢٩١٤٤) دۆلارە، بۆ ئەو وڵاتانەی داهاتەکەیان بەرزە. تەنیا چوار وڵاتی ئیسلامی هەن کە هەموویان بەرهەمهێنەری نەوتن، دەتوانن بچنە ڕیـزی ئەوانەی داهاتەکەیان بەرزە، تەنیا شەش وڵاتیش دەچنە ڕیـزی چـینی داهاتی لە سەروو ناوەندەوە، هـەژدە دەوڵـەتیش دەچـنە ڕیـزی چـینی داهاتی لە خوار ناوەندەوە، بیست و نۆ دەوڵەتیش دەچـنە ڕیـزی چـینی داهاتی نزمەوە.[1]

فێرکردن – لە سەردەمی ئیسلامیی پێشوودا، گرنگییەکی سەرەکیی پێ دەدرا و یەکێك بوو لە هۆیەکانی ڕابوون – ئەو گرنگییەی پێ نـەدرا کە پێویست بوو بۆ بودجـەی حکومەتـەکان، بۆیـە ڕێـژەی مامناوەنـدی نەخوێندەواری لەم وڵاتانەدا لە ساڵی ٢٠٠٤زدا ٣٠٪ بـوو.[2] ئەمـە ئـەوە دەگەیەنێت کە ٤٢٥ ملیۆنی دانیشتووانەکە نەخوێندەوارن و ناتوانن بـە تواناکانیان هاوبەشییەکی تەواو لە گەشەپێداندا بکـەن. لـە هـەموو ئـەم وڵاتانە، تەنیا ٦٠٠ زانکۆ هەیە، لە کاتێکدا ویلایەتە یەکگرتووەکان زیاتر لە ١٩٧٥ زانکۆیان هەیە، واتە سێ هێندەی وڵاتـانی ئیـسلامی زانکۆیـان هەیە، لەگەڵ ئەوەی ژمارەی دانیشتووانیان لە پێنج یەك کەمترە.[3] لـە

---

1 . World Bank. Economic Growth in the 1990s: Learning from a Decade of Reform. Washington, DC: World Bank, 2005, p. 251.

2. Islamic Development Bank (IDB). Statistical Monograph No. 27, Jeddah: Islamic Development Bank, May, 2007, Table 1. 5, p. 15.

3) پشتبەست بەو بەیاننامانەی لەمانەدا هاتوون:

جیهانی ڕۆژئاوادا، هەر یەك لە دیموكراتییەت و فێركردن و گەشەپێدان، پاڵپشتی یەكتری بوون، چونكە فێركردن پاڵشت بوو بۆ گەشەپێدان، گەشەپێدانیش هۆكار بوو بۆ خواستی زیاتر لەسەر فێركردن، دەتوانرا ئەم خواستەش بە هۆی پشتگیریكردنی دەوڵەتەوە و لە ئەنجامی بەرزبوونەوەی داهاتی حكومەت جێبەجێ بكرێت. فێركردن و گەشەپێدانیش، هەردووكیان هاوكار بوون بۆ پاڵپشتیكردنی دیموكراتییەت.

## سێیەم: هێمای گەشەپێدانی مرۆیی

جێی سەرسوڕمان نییە كە تەنیا حەوت وڵاتی ئیسلامی پلەیەكی باڵایان لە هێمای گەشەپێدانی مرۆییدایە هەبێت، كە بەرنامەی گەشەپێدانی تایبەت بە نەتەوە یەكگرتووەكان دایناوە، لە كاتێكدا بیست و هەشت وڵات نمرەی ناوەند و هەژدە وڵاتیش نمرەی نزم وەردەگرن.[(١)] كێشەی هێمای گەشەپێدانی مرۆیی لەوەدایە كە تەنیا

-Islamic Development Bank (IDB). Statistical Monograph No. 27, Jeddah: Islamic Development Bank, May, 2007.
- International Monetary Fund (IMF). International Financial Statistics. April, 2007.
- http://univ. cc/ (worldwide universities).

[1]. بە پێی ئەو بەیاننامانەی دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ٢٠٠٤ كە بانكی گەشەپێدانی ئیسلامی ساڵی ٢٠٠٧، خشتەی ٨. أب، ل٢٠ بڵاویكردووەتەوە. بەیاننامانەی دەربارەی چوار وڵات تێدا نییە. بۆیە بەیاننامەكانی تایبەتن بە گانا كە ئەندامە لە ڕێكخراوی كۆنگرەی ئیسلامی، بەڵام لە بانكی گەشەپێدانی

سێ گۆڕانکاریی تێدایە: تەمەنی ناوەندی چاوەڕوانکراو لە کاتی لەدایکبوون، زانینی خوێندنەوە و نووسین، ڕێژەی کۆی بەرهەمی ناوخۆیی تاکێك لە پێناو بەرامبەرکردنیدا لەگەڵ بەهای کڕین. بۆیە ڕەنگدانەوەی چوارچێوەی دیاریکراوی ئابووری، گەشەپێدانە، پێش ئەوەی باوەڕ بە ڕۆڵی یەکلاکەرەوەی دامەزراوە کۆمەلایەتی و ڕۆشنبیری و سیاسییەکان بهێنرێت، کە ئیبن خەلدون لە نموونەکەیدا دووپاتی دەکاتەوە، ئابووریی گەشەپێدانیش لە دوا وەختدا دووپاتی کردەوە.

بۆیە لێرەدا گرنگە هێمایەك ئامادە بکرێت کە زیاتر گشتگیر بێت. ئەمە دەبێتە هۆی زیادکرنی ژمارەیەك گۆڕانکاری تر، لەوانەش: دادپەروەری، پەیوەندیی خێزان، گونجانی کۆمەلایەتی، ئاسوودەیی فیکری (عەقڵی)، خەلاتکردنی بەتواناکان، کاری نموونەیی، کەمبوونەوەی تاوان و توندووتیژی، نەبوونی پێوانەی ڕەوشت. گرنگیشە دیموکراتییەت و ئازادیی بیروڕا و دادوەری لە دابەشکردنی داهات و سامان و بوونی دەستەیەکی دادوەریی پاك و کاریگەر بە هەند وەربگیرێن. لەوانەیە بەیاننامە لەسەر ئەم هەموو بابەتە دەست نەکەون، بۆیە لێرەدا گرنگە هێمایەکی گشتگیر دابنرێت بە پێی توانا، هەروەها هەوڵدان بۆ کۆکردنەوەی ئەو زانیارییانەی هێشتا لەبەردەستدا نین.

---

ئیسلامیدا ئەندام نییە، دەگەڕێتەوە بۆ ساڵی ٢٠٠٢ و لە بەرنامەی گەشەپێدانی نەتەوە یەکگرتووەکانی ٢٠٠٣. ل٢٣٧–٢٤٠ وەرگیراوە.

شـتێکی نـامۆ نییـە ئەگـەر بۆمـان دەرکـەوت وڵاتـانی ئیـسلامی – ئەوانەی نمرەی بەرز لە هێمای گەشەپێدانی مرۆیـی ئێـستادا نـاهێنن – لەوانەیە خراپتر بن لەوەی کـە ئێـستا تێیدایـە، گـەر پێوانـە بکرێـت بـە هێمایەکی ئامارژەپێکراوی گشتگیرتر، ئەمەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە دوای جێبەجێکردنی نموونەکەی ئیبن خەلدون، ناشەرعییەتی سیاسی کێشەی یەکەم نییە کە کۆمەڵگا ئیـسلامییەکان دووچـاری بـوون، بـەڵکو ئێـستا هـەموو دامـەزراوە کۆمەڵایـەتی – ئـابووری و سیاسـییەکان وردە وردە گەندەڵییان تێکەوتووە، لە ئەنجامی کاری هۆکـارە خولاوەکـان، ئێـستا زەحمەتـە بتوانرێـت جیـاوازی لـە نێـوان هـۆ و ئەنجامـدا بکرێـت. بۆیـە پێویـستە چاکـسازییەکی گـشتگیر بکرێـت، بـۆ گەڕاندنـەوەی ڕێـڕەوی بازنـەیی دارمـان، تـەنیا گرنگیـدان بـە گۆڕاناکارییـە ئابوورییـەکان و تەنانەت سیاسییەکانیش داد نادات.

# بەشی نۆیەم
# پێویستی بە چاکسازی
# لەکوێوە دەستپێبکەین؟

بانگەشــە بــۆ چاکــسازیی گــشتگیر لــە وڵاتــانی ئیــسلامیدا بــۆ گەڕاندنەوەی بازنەی هۆکارە خولاوەکان، کە دەستپێکی کۆتایی هێنـان بــوو بــە لێپرســینەوەی سیاســی و بــەهێزبوونی دەســتەڵاتی زۆرداری، لــەخۆوە پرســیارێکی گــرنگ دەوروژێنێــت: لــەکوێوە دەســتپێبکەین؟ باشترین شوێن کە لێوەی دەستپێبکەین کـە پێغەمبـەر (درودی خـوای لەسەر) خۆی دەستیپێکرد، ئەویش چاکسازیی مرۆڤەکانە. ئەوان ڕوڵـی بزوێنەر لە ڕابوون یان ڕووخانی هەر شارستانییەتێك دەبینن. سەرەڕای پێویستی بە گرنگیدانی یەکەم بەوان، بەڵام ئەمـە ئـەوە ناگەیـەنێت کـە پێویستیی کاریگەرییە کۆمەڵایەتی – ئـابووری و سیاسـییەکان، کـە لـە چوارچــێوەی کــرداری بازنــەی هۆکــارە خولاوەکانــەوە لــە مــاوەی سەدەکاندا دووچاری گەندەڵی بوون، پێویستیان بە گرنگییەکی هاوکات لەگەڵ چاکسازیی مرۆڤەکاندا نییە.

## یەکەم: چاکسازیی ڕەوشتی

کرۆکی کێشەکە ئەوەیە، چۆن بتوانین تاکەکان چاك بکەین، بە شێوەیەك ببنە مرۆڤێکی باشتر و سەرچاوەی خێر و بەرەکەت بۆ کۆمەڵگاکەیان و بۆ هەموو مرۆڤایەتی، کە هاوتا بێت لەگەڵ پەیامەکەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) کە لە قورئاندا هاتووە، خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمَا أَرْسَلْنَاكَ إِلَّا رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ﴾. الأنبياء/١٠٧. بۆ ئەم مەبەستە، پێویستە کەسایەتی و توانا و هۆکار و تێڕوانینی فیکرییان بگۆڕێت، ئەویش بە زۆرترین ڕێژەی گرنگیدان بە پەروەرکردنی ڕەوشتییان و فێرکردنیان. ئەمە هەوڵی هەموو پێغەمبەرانی خوا بوو کە بیکەن، لەوانەش: ئیبراهیم و موسا و عیسا و محەمەد... (دروودی خوایان لەسەر بێت).[1]

ئەم پێداگرتنە لەسەر پەروەردەکردنی ڕەوشتی، وا دەردەکەوێت نامۆ بێت و لە ژینگەی ئەمڕۆی عەلمانی و لیبراڵیدا پێویست نەبێت، بەڵام ڕاستییەك هەیە نکوولی لێ ناکرێت، ئەویش ئەوەیە کە تێڕوانینی

---

[1] . قورئان باسی هیچ پێغەمبەرێك ناکات، تەنیا ئەو پێغەمبەرانە نەبێت کە بۆ گەلانی ڕۆژهەڵاتی ناوەڕاستی ناردوون. ناوەکانیان لای خەڵکی ئەوێ ناسراو نەبوون. خوای گەورە بە ڕوونی دەفەرموێت: ﴿وَلَقَدْ بَعَثْنَا فِي كُلِّ أُمَّةٍ رَسُولًا﴾. النحل/٣٦، ﴿وَلَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلًا مِنْ قَبْلِكَ مِنْهُمْ مَنْ قَصَصْنَا عَلَيْكَ وَمِنْهُمْ مَنْ لَمْ نَقْصُصْ عَلَيْكَ﴾. غافر/٧٨. لە فەرموودەیەکی (ضعیف)ی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر)دا هاتووە: نزیکەی ١٢٤٠٠٠ پێغەمبەر بۆ وڵاتە جۆراوجۆرەکان لە کاتی جیاوازی مێژوودا نێردراون. (مەودودی لە تەفسیری ئایەتی ٥١ی سورەتی "مریم". بەرگ ٣، ل٧٢). بڕوانە:
- Mawdudi, Sayyid Abul A'la. *Tafhim al Quran*. Lahore: Maktabah Ta'mir-e-Insaniyat, 1962, Volume 3, p. 75.

پێکهاتەیی ئایینی، وا دەخوازێ بۆ پشتگیریکردن لە هەموو سیفاتە کەسێتییە پێویستەکان یارمەتی هەبێت، لە پێناو بەدەستهێنانی گەشەپێدانێکی بەردەوام لەگەڵ تێڕوانینێکی ئیسلامییانە بۆ دادپەروەری و برایەتی و خۆشگوزەرانیی هەمووان. لەوانەیە دابینکردنی خۆشگوزەرانیی هەمووان زەحمەت بێت، ئەگەر هاتوو هەموو کەسێك خزمەت بە بەرژەوەندیی تایبەتی خۆی بکات و ئامادە نەبێت لە پێناو بەرژەوەندیی گشتیدا قوربانی بدات.(١)

تێڕوانینی پێکهاتەیی ئایینی، کە پەیوەستە بە ڕۆژی دوایی و پیرۆزیی بەها ڕەوشتییەکانەوە، ئەوەیە کە دەتوانێت تاکەکان بۆ قوربانیدانی پێویست هان بدات. ئەو شتەی کە تێڕوانینی پێکهاتەیی ئایینی بەدەستی دەهێنێت لە چوارچێوەی پێشکەشکردنی خزمەتی بەرژەوەندیی تایبەتی و تێڕوانینێکی قووڵ لەم دونیایە و لە ڕۆژی دواییشدا. تاوەکو تاکەکان قوربانی بە بەرژەوەندیی تایبەتییان بدەن، واتە پەیوەستبوونی ڕەوشتی و کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسییان لەم دونیایەدا هەبێت – کە هەر نامێنێ–، چونکە بەرژەوەندیی تایبەتییان زیاتر لە ڕۆژی دواییدا بەدی دێت، کە (نەمر)یشە. بۆیە دەبێت زۆر

---

[1]. دووپاتکردنەوەی زانستی ئابووری لەسەر خزمەتی بەرژەوندیی تایبەتی لە ڕۆژئاوا نەدەبوو بە واقیعێکی کرداری، بەڵکو وەك ئامرازێکی شیکاری خزمەتی دەکرد، بەهای مەسیحییەتیش بەردەوام کاریگەریی لە ڕەفتاری گشتیی خەڵکی دەکرد، سەرەڕای ئەوەی وەك دەردەکەوێت وردە وردە کاریگەریی کەمبووەوە.

گرنگی به هۆشیاریی ڕەوشتی خەڵك بدرێت. لەو بارەیەوە قورئان بە ڕوونی ڕۆڵی باوەڕهێنان و چاکسازی ڕەوشتی و دادپەروەری لە ڕابوون و کەوتنی کۆمەڵگاکاندا، دووپاتدەکاتەوە.(١)

مێژوو پڕیەتی لە نموونەی ئەو حاڵەتانەی کە کۆمەڵگایەك لە کۆمەڵگاکان لە ئەنجامی چاکسازیی ڕەوشتی گەیشتووەتە لووتکە، پێشکەوتنی فیکری و ئابوورییش بە گشتی لە دوای چاکسازیی ڕەوشتییەوە دێت. کرۆبێر (Kroeber) باشی پێکاوە کە دەڵێت: "نایەتە یادم کە گەلێك لە سەرەتادا لە زانست و فەلسەفە، یاخود لە هونەرێکی بەرزدا پێشکەوتبێت، پاشان جۆرە ئایینێکی دروست کردبێت".(٢) شۆیترز (Schweizer)یش دووپاتیدەکاتەوە: "ئەگەر بنەمایەکی ڕەوشتی نەبێت، شارستانییەت دەڕووخێ، هەتا ئەگەر زۆرترین هێزی داهێنەرانە و فیکری ڕۆڵی خۆیان لە لایەنەکانی تردا بگێڕن".(٣) بۆیە ئەو وایدەبینێت کە "زاڵبوونی ڕەوشتی بەسەر

---

1 . بڕوانە بۆ نموونەکانی خوای گەورە کە دەفەرموێت: ﴿لَقَدْ أَرْسَلْنَا رُسُلَنَا بِالْبَيِّنَاتِ وَأَنْزَلْنَا مَعَهُمُ الْكِتَابَ وَالْمِيزَانَ لِيَقُومَ النَّاسُ بِالْقِسْطِ وَأَنْزَلْنَا الْحَدِيدَ فِيهِ بَأْسٌ شَدِيدٌ وَمَنَافِعُ لِلنَّاسِ وَلِيَعْلَمَ اللَّهُ مَنْ يَنْصُرُهُ وَرُسُلَهُ بِالْغَيْبِ إِنَّ اللَّهَ قَوِيٌّ عَزِيزٌ﴾. الحديد/ ٢٥، ﴿وَعَنَتِ الْوُجُوهُ لِلْحَيِّ الْقَيُّومِ وَقَدْ خَابَ مَنْ حَمَلَ ظُلْمًا﴾. طه /١١١، ﴿قَدْ أَفْلَحَ مَنْ تَزَكَّى﴾. الأعلى/ ١٤، ﴿وَقَدْ خَابَ مَنْ دَسَّاهَا﴾. الشمس /١٠، ﴿وَالْعَصْرِ (١) إِنَّ الْإِنْسَانَ لَفِي خُسْرٍ (٢) إِلَّا الَّذِينَ آمَنُوا وَعَمِلُوا الصَّالِحَاتِ وَتَوَاصَوْا بِالْحَقِّ وَتَوَاصَوْا بِالصَّبْرِ (٣)﴾العصر/١–٣.

2 . Kroeber, Alfred. *Configration of Culture Growth*. Berkeley: University of California Press, 1994, p. 803-4.

3 . Schweizer, *The philosophy of Civilization*, p. xii; see also Toynbee, *A Study of History*, abridgement by D. C. Somervell, Volume 2. P. 364.

ئارەزووەکــانی مرۆڤــدا، زۆر لــەوە گــرنگترە کــە زاڵبیــت بەســەر سروشتدا". [1] تـوینبی (Toynbee)یـش مـشتومڕی لەسـەر دەکـات و دەڵێت: "زاڵبوون بەسەر سروشتدا کاری مرۆڤـ نییە – ئەوە لە توانـای زانستدایە – لەوانەیە ئـەوە گرنگییـەکی زۆری بـەلای مرۆڤـەوە نـەبێت، بـەراورد بـە پەیوەنـدیی لەگـەڵ خـودی خـۆی و مرۆڤـە نزیکـەکانی و خـوا". [2] نایگـل لۆسـۆن (Nigel Lawson)ی وەزیـری گەنجینـەی بـەریتانی، ۱۹۸۳– ۱۹۸٦ز دووپاتیدەکاتـەوە کـە "هـیچ سیـستمێکی سیاسـی یـان ئـابووری، ناتوانێـت ماوەیـەکی درێـژ بمێنێتـەوە، ئەگـەر پەیوەست نەبووبێت بە بنەڕەتێکی ڕەوشتییەوە". [3] هەروەها فریدمان (Friedman)یش –مامۆستایە لە زانکۆی هارڤارد لە کتێبەکەیدا کـە تازە دەرچووە – گفتوگۆ دەکات و دەڵێـت: "گەشـەکردنی ڕەوشـتی و ئـابووری بـە یەکـەوە بەسـتراون و پـشتگیریی یـەکتر دەکـەن". [4] بـە

---

1. Schweizer, *The philosophy of Civilization*, p. 22-23, 38, 39, 91.
2 . Toynbee, *A Study of History*, abridgement by D. C. Somervell, Volume 2, p. 99.

- لە ڕاسـتیدا تـوینبی لـە سـەری دەڕوات و دەڵێـت: "سـەرکەوتنێکی گـەورەی زانـست بەسـەر ئاییـندا، کارەساتێکە بۆ هەردوو لا، چونکە عـەقڵ کـە ئایینیـشی لەگـەڵ بێـت، یەکێکـە لـە توانا بنەڕەتییـەکانی سروستی مرۆڤـ". هەمان سەرچاوە ل۹۹.

3 . Lawson, Nigel. "Some Reflections on Morality and Capitalism. " In Samuel Brittan and Alan Hamlin, (eds. ), Market Capitalism and Moral Values: Proceeding of Section (Economics) of The British Association for the Advancement of Science, Keele, 1993, Aldershot, UK: Edward Elgar, 1995, p. 35.
4 . Friedman, Benjamin. *Moral Consequences of Economic Growth.* New York: Knopf, 2005.

بەڵگەی شیکارییشەوە، کاریگەریی ئەرێنیی خواپەرستی و ئایینخوازیی بە شێوەیەکی بەرفراوان و جۆراوجۆر لەسەر ئەنجامەکانی سەلمێنراوە.[1] ئەمەش بەڵگەیەکی ڕوون و ئاشکرایە بۆ ئەو تێڕوانینە پێکهاتەییە ئایینییەی کە ئیبن خەلدون و ژمارەیەکیش لە زانایانی ڕۆژئاوا ئاشکرایان کرد، ئەو تێڕوانینەیە کە بزووتنەوەی ڕووناکبیری ویستیان بیڕووخێنن، دواجاریش سەرکەوتنێکی ڕووکەشیی لە هەوڵەکەیدا بەدەستهێنا. ئەوەی دڵخۆشکەرە، ئەوەیە گەڕانەوەی تێڕوانینە پێکهاتەییە ئایینییەکە ڕۆژ بە ڕۆژ بەهادارتر دەبێت.

**١ـ دادپەروەری و گەشەپێدان و بارسووکردنی هەژاری**

ڕەنگە ئەرکێکی گران بێت کە ئاستی ڕەوشتیی خەڵك بەرزبکرێتەوە ئەگەر دادپەروەری دابین نەکرێت. ئەلماویردی (٤٥٠ك/١٠٥٨ز کۆچی دوایی کردووە)، ڕاست دەکات کە دەڵێت: **"هیچ شتێك لە ستەم خێراتر نییە بۆ خاپوورکردنی جیهان".**[2] چونکە دادپەروەری، سەرەڕای

---

[1]. Gruber, Jonathan. Religious Market Structure, Religious Participation, and Outcomes: Is Religion Good for You ?. NBER Working Paper 11377, May, 2005, p. 1. ; See also Ellison, Christopher. "Religious Involvement and Subjective Wellbeing. " Journal of Health and Social Behavior, 31:1, 1991, p. 80-99. ; Barrow, Robert, and Rachel McClearly. "Religion and Economic Growth. " Harvard University, April, 8, 2003. ; and Iannaccone, Laurence. "Introduction to the Economics of Religion. " Journal of Economics Literature, September, 1998, p. 1465-1496.

[2]. الماوردي، أدب الدنيا والدين، سەرچاوەی پێشوو، ل١٢٥.

ئەوەی تایبەتمەندییەکی باڵای ڕێنماییەکانی ئیسلامە، بە شێوەیەکی ڕوون و ئاشکرا لە وڵاتانی ئیسلامیدا ونە و بووەتە سەچاوەی زۆرێك لە کێشە ناوخۆیی و دەرەکییەکان. سەرەتای یەکەمی هەر بەرنامەیەك کە بیەوێت دادپەروەری دابین بکات، پێویستە هەژاری قەڵاچۆ بکات، کە دەبێتە هۆی سستی و نەبوونی و تاوان. هەر وەك پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) دەفەرموێت: "كاد الفقر أن يكون كفرًا".(١) هەر بۆیە زەحمەتە بە بێ بەکارهێنانی کاریگەریی هەموو داهاتەکانی بەردەست بۆ خێراکردنی گەشەپێدانی گوندەکان، سەرەڕای گەشەپێدانی شارنشینی و پشتگیری کردنی کرێکاران و فەراهەمکردنی کاری کەسی، بتوانرێت هەژاری قەڵاچۆ بکرێت.

### ٢- بڵاوکردنەوەی فێرکردن و قەرزی بچووك

هەوڵی ئایدیۆلۆژیی زیاد لە پێویست لە سەپاندنی لیبراڵییەتێکی نوێ و شێوە بازاڕی بەسەر وڵاتە تازەپێگەیشتووەکاندا کە خۆی بە جلی "کۆدەنگیی واشتۆن" پۆشیووە، بە سەرنەکەوتوو دادەنرێت.(٢)

---

[1] . بەیهەقی لە "شعب الإيمان"دا لە ئەنەسی کوڕی مالیکەوە ڕیوایەتی کردووە کە پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) دەفەرموێت:" كاد الفقر أن يكون كفرًا". بڕوانە:

- البيهقي، أحمد بن الحسين. شعب الإيمان، تحقيق، محمد السعيد بسيوني زغلول، بيروت، دار الكتب العلمية، ط١٤١٠،١ هـ، بەش، ل٢٦٧، فەرموودی ژمارە ٦٦١٢.

[2]. Rodrik, Dani. "Goodbye Washington Consensus, Hello Washington Confusion? A Review of the World Banks Economic Growth in the 1990s: Learning from a Decade of Reform. " *Journal of Economic Literature*, December, 2006, p. 974.

ئەدەبیاتی نوێی تایبەت بە گەشەپێدان، بە بەڵگەوە دەڵێت کە کۆمەڵە ڕێنماییەکی گشتیی تایبەت نییە کە وڵاتە تازە پێگەیشتووەکان بۆ خێراکردنی گەشەپێدان بیگرنەبەر.(1) وڵاتە ئیسلامییەکان دەتوانن ئەو ستراتیژییەتە هەڵبژێرن کە لەگەڵ ئامانج و بارودۆخیاندا دەگونجێت.(2) لە کاتێکدا پێویستە هەموو هەوڵێك بخرێتە گەڕ بۆ خێراکردنی گەشەپێدان و پێداگیریی یەکەم لەسەر دابینکردنی دادپەوەری بێت. ئەمەش هیوایەکی پووچ دەردەچێت، ئەگەر بارسووکیی هەژاری نەکرێت و حاڵەتەکانی نایەکسانیی لەڕادەبەدەری داهات و سامان کەمنەکرێتەوە. دوو ڕێگری دیار لە بەردەم جێبەجێکردنی ئەم ئامانجەدان، کە بریتین لە: زۆریی خەرجیی فێرکردن و قەرزی بچووك. بۆیە گرنگە ڕێگە بۆ فێربوونێکی ئاستبەرز بۆ هەژاران خۆش بکرێت، ئەگەر بە خۆڕاییش نەبێت، بە نرخێکی کەم بێت، بەو شێوەیە دەتوانرێت لایەنی ڕەوشتی و فیکرییان بەرزبکرێتەوە، فێری پسپۆڕیی پێویست بکرێن. گرنگیی دابینکردنی هەل، کەمتر نییە لەوەی پێشتر، بۆ ئەوەی سەرمایە یان قەرزی بچووك، کە بارگرانی لەسەر خاوەن قەرزەکە دروست نەکات، تاوەکو بتوانن پرۆژەی بچووك دابمەزرێنن.

---

1. World Bank. Economic Growth in the 1990s, p. xiii.

2. Chapra, M. Umer. *Islam and Economic Development*. Islamabad: The International Institute of Islamic Thought, 1993, ; Chapra, M. Umer. *The Future of Economics: An Islamic Perspective.* Leicester, UK: The Islamic Foundation, 2000.

لەبەرئەوەی دارِمانی فێرکردن و توێژینەوەی زانستی و تـەکنۆلۆژی، لە گرنگترین هۆیەکانی دارِمانی موسڵمانەکانن، پێویـستە ئـەو کەلێنـەی کـە لــەو بوارانــەدا هەیــە، لــە نێــوان وڵاتــە ئیــسلامییەکان و وڵاتــە پێــشکەوتووەکاندا، لابــبرێن. ئەمــەش لــە رێگــەی دەســتەبەرکردنی فێرکردنێکی ئاست بەرز و دەزگاکانی توێژینەوە و کارئاسانی بۆیان، لـە رێگەی بنیاتنـانی قوتابخانـە و کۆلێـژ و زانکـۆی پـڕ لـە پێداویـستی لـە هەموو ناوچەکانی وڵاتدا. لەم پرۆژەیەدا پێویستە گرنگیی تایبەت بـەوە بدرێت کە فێرکردن بۆ هـەموو چینەکانی کۆمـەڵ بێـت، نـەك تـەنیا بـۆ دەوڵەمەندەکان. لە بەدبەختیدا بـە تایبـەتکردنی کـەرتی فێرکـردن وای کردووە خوێندن زۆر گران بێت و هـەژاران دەسـتیان نەکـەوێت. ئەگـەر ئەم بارودۆخە چارەسەر نەکرێت، ئەوا تەنیا دەوڵەمەنـدەکان بـە پلـەی یەکەم خوێندنی باڵا بەدەست دەهێنن. بەم شێوەیە حاڵەتی نایەکسانی لــە داهــات و ســاماندا لــەبری کەمبوونــەوەی زیــاتر دەبێــت، دەبێتــە کەڵەکـەبوونی بـارگرژی و تێکـچوونی بـارودۆخ کـە ئێـستا لـە کۆمـەڵگا ئیــسلامییەکاندا دەگــوزەرێ. بۆیــە پێویــستە خــەرجیی فێرکــردن و خوێندنی هەژاران کەمبکرێتەوە. ئەمەش ناکرێت، ئەگەر یارمەتییەکانی حکومەت و هەروەها ئەوقاف و هاوکارییە خێرخوازییە تایبەتەکانی تریش بـۆ فێرکـردن، بــە شــێوەیەکی بنــەڕەتی زیــاد نــەکرێن، پێویستیــشە کۆکردنەوەی زەکات و دابەشکردنی رێك بخرێت. ئەگەر هۆکاری مرۆیـی بۆ گەشەپێدان گـرنگترین شـت بێـت، هـیچ رێگرییـەك بـۆ تـەرخانکردنی

ڕێژەیەکی زۆر لە داهاتی حکومـەت لـە پێنـاو بڵاوکردنـەوەی فێرکردنـدا نییـە، کـە وەك دەردەکـەوێت یەکێکـە لـە گـەورەترین قوربانییـەکانی نەبوونی لێپرسینەوەی سیاسی لە جیهانی ئیسلامیدا.

مەرجی بنەڕەتی و گرنگ و یەکلاکەرەوەش بۆ کەمکردنـەوەی بـاری هەژاری، لە ڕێگەدان بە قەرزی بچووك بۆ هەژاراندا خۆی دەبینێتەوە، لە پێناو ئەوەی بتوانن خەونەکانیان بهێننـە دی. وا دەردەکـەوێت هێـشتا نەسەلمێنراوە کە پارەدان بۆ پرۆژەی بچووك کە پشت بە سوودی سـەر پارەی قەرزەکە دەبەستێت، ڕێگەیەکی کاریگەرە بۆ یارمەتیدانیان لـەم ئەرکـەدا. لێکۆڵینەوەیـەك لـە کـاتێکی بـاش لـە ٢٠٠٧دا دەرکـەوت، کـە دکتـۆر قـازی خولیـق زەمـان ئەحمـەد، سـەرۆکی کۆمەڵـەی ئـابووریی بەنگەلادیش، نووسیویەتی، دەربارەی کاری دامەزراوەی قەرزی بچووکە سـەرەکییەکان لـە بەنگـەلادیش، دەڵێـت: "لـە زۆربـەی حاڵەتەکانـدا چاکبوونی تـەواو لـە ژیـانی خـاوەن قەرزەکانـدا ڕووی نـەداوە، چـونکە سـوودی ڕاسـتەقینەی سـەر پـارەی قەرزەکـە دەگاتـە ٣٠٪ تـا ٤٠٪ و دەبێتە بارگرانی بۆ قەرزارەکە کە لە خزمەتی خاوەن قەرزەکـەدا بێـت، بۆیە لە زۆر حاڵەتدا ناچار دەبـن قوربـانی بـدەن بـە بـەکارهێنانی شـتە بنەڕەتیەکان و قەرز وەرگرتن بە سوو. ئەمەش نوقومیان دەکات — بـێ ئەوەی مەبەستیان بێت — لە بازنەیەکدا کـە کۆتـایی نایـەت لـە قـەرز و دەبێت خـۆی بـۆ قـەرز تـەرخان بکـات، کـە لـە کۆتاییـدا دەبێتـە هـۆی

زۆربـوونی گـرژی و تێکـچوونی کۆمەڵایـەتی.[1] بۆیـە لێـرەدا گرنگـە لـە کاتێکدا کار بە ئامرازێکی داهێنراو کرا بـۆ قـەرز – کـە پـشت بـە چـەند کۆمەڵەیـەك دەبەسـتێت کـە بـانکی گـرامین (Grameen Bank) پشتگیرییان دەکات و دامەزراوەی تـر لـە بەنگـەلادیش – کـە پـارە بـۆ پرۆژەیـەکی بـچووك بـدەن بـە هـەژارترین کـەس لەسـەر بنەمایـەکی مرۆڤایەتی، پێویست ناکات سوودیان لێ وەربگیرێت. بۆیە پێویـستە لـە نێوان قەرزی بـچووك و زەکـات و دامـەزراوەکانی ئەوقافـدا، پەیوەنـدی پتەو هەبێت و تەواوکەری یەکتری بن. ئەوانەشی توانای مادییان هەیە، پێویستە لە قازانج و زیاندا هاوبەش بکرێن و چۆنیەتیی قەرزی ئیسلامی لەسەر بنەمای کرێ بێت. بەڵام قەرزی بچووك بە تەنیا ئەنجامی نابێـت، ئەگەر مەشقی پیشەیی و بنەمای سـەرەکی و بـازاڕ بـۆ پـشتگیریکردنی پرۆژە بچووکەکان فراوان نەکرێن.[2]

لەگەڵ ئەوەی بارسووککردنی هەژاران لەوانەیە کـارێکی مـەزن بێـت، بەڵام نابێتـە ئامـانج بـۆ بـەجێهێنانی برایـەتیی مرۆڤـەکان، کـە ئیـسلام بانگەشەی بۆ دەکات. هەروەها پێویستە دابەشکردنی دادپەروەرانە لـە

---

[1]. Ahmad, Qazi Kholiquzzaman (ed. ). *Socio- Economic and Indebtedness-Related Impact of micro-Credit in Bangladesh.* Dhaka: Bangladesh Unnayan Parishad, 2007. P. xix-xvii and 32.

[2]. بۆ زانیاریی زیاتر، بڕوانە:

- Chapra, M. Umer. "Challenges Facing the Islamic Financial Industry. " In M. Kabir Hassan and Mervyn Lewis (eds. ), *Handbook of Islamic Banking*, Northampton, MA, USA: Edward Elgar, 2007, p. 336-338.

داهـات و سـاماندا جێبـەجێ بکرێـت، لـە پێنـاو دابینکردنـی یەکـسانیی کۆمەڵایـــەتی و شـــکۆمەندی و ڕێـــز بـــۆ هـــەموو تاکێـــك لـــە کۆمـــەڵگا ئیـسلامییەکاندا. دادپـەروەری و ڕەوشـتبەرزی و برایـەتی، هـەموویان کاریگـەرن و بـە یەکـەوە بەسـتراون، چـونکە ناتوانرێـت چاکـسازییەکی هەمیشەیی لە یەکێك لەمانەدا بکرێت، بە بێ ئەنجامدانی چاکسازییەکی هەمیشەیی لەوانی تریشدا.

## ٣ـ چاكسازی له‌ هه‌موو دامه‌زراوه‌كاندا

ڕەنگە کاری جێبەجێکردنی چاکسازیی گشتی لـە بـارودۆخی مرۆڤــدا، بـە بـێ چاکـسازی لـە هـەموو ئـەو دامەزراوانـەی کـە کاریگـەرییان لەسـەر ڕەفتـاری مرۆڤـەکان هەیـە، ئاسـان نـەبێت. گـرنگترین ئـەو دامەزراوانـەش (خێزان)ە، چونکە دامەزراوەی یەکەمە و لە ژیـانی منداڵدا زۆر بایەخـدارە بۆ ئەو لایەنەی پەیوەندی بە پێگەیاندنی ڕەوشتی و فێرکردنەوە هەیـە.(١) باوك و دایك هەر لە سەرەتاوە دوو مامۆستای دڵسۆزن بـۆ منـداڵ، ئەگـەر ڕۆشـــنبیر و خوێنـــدەوار نـــەبن و کەســـایەتییان ڕەنگدانـــەوەی بـــەها ئیسلامییەکان نەبێت، لەوانەیە نەتوانن ڕۆڵی خۆیان وەك پێویست ببیـنن.

---

[1]. بـۆ زانـین دەربـارەی گفتوگۆیـەکی پـڕ بایـەخ لـەبارەی پێویـستیی پێگەیانـدنی ڕەوشـتی و ڕۆڵـی یەکلاکەرەوەی خێزان، بڕوانە:

– أبو سليمان، أزمة العقل المسلم، سەرچاوەی پێشوو.

ــ أبو سليمان، أزمة الإرادة والوجدان المسلم، سەرچاوەی پێشوو.

خۆشەویستیی دایك و باوك و سۆزیان بەرانبەر منداڵەکانیان، بە تایبـەتیش دایك، دوو کاری یەکلاکەرەوەن لە پێناو پـەروەردەکردنی نەوەیـەکی نـوێ کە ڕەوشتی بەرز و فیکری چالاك بێت، هەروەها هەست بـە لێپرسـینەوەی کۆمەڵایەتی بکات و گرنگی بە کەسانی تر بدات. ئەگەر خێزان لەم ڕۆڵەیـدا سەرکەوتوو نەبوو، هیچ شـتێك ناتوانێـت جێگـەی پڕبکاتـەوە. لەبـەر ئـەم هۆیەیـە کـە ئیـسلام کـاری هـەر وەك کـاری ئاییـنـەکانی تـر، جـەخت لـە سەلامەتیی خێزان و بوونی خۆشەویستی و سـۆز لـە نێـوان بـاوك و دایکـدا دەکاتەوە. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَمِنْ آيَاتِهِ أَنْ خَلَقَ لَكُمْ مِنْ أَنْفُسِكُمْ أَزْوَاجًا لِتَسْكُنُوا إِلَيْهَا وَجَعَلَ بَيْنَكُمْ مَوَدَّةً وَرَحْمَةً إِنَّ فِي ذَلِكَ لَآيَاتٍ لِقَوْمٍ يَتَفَكَّرُونَ﴾ الروم /٢١.

ڕۆڵی خێزان پێویستی بە پشتگیریی دامەزراوە فێرکارییەکانە، لە پێناو فێرکردنێکی ئاستبەرزی باش لە هەموو بوارەکانی زانیاریدا، بە تایبـەتیش لە بواری زانست و تەکنۆلۆژیادا، بۆ ئەوەی کۆمەڵگا ئیسلامییەکان بتـوانن کێبڕکێیەکی سەرکەوتووانە لە گۆڕەپانە نێودەوڵەتییەکاندا ئەنجام بدەن و ڕێژەیـەکی شایـستە لـە گەشـەی ئـابووری بەدەسـت بهێـنن. لـە کاتێکـدا دامەزراوە فێرکارییەکان ڕۆڵێکی یەکلاکـەرەوەیان لـە سـەدەکانی یەکـەمی مێژووی ئیسلامیدا بینیوە، لـە ئـەنجامی کـارە خێرخوازییـە تایبەتـەکان و پـشتگیرییەکی بەخـشندانەشیان بـۆ حکومەتـەکان هـەبووە، بـەڵام ئێـستا ناتوانێت ئەو ڕۆڵە ببینێت. لە ئەنجامی ناشەرعییەتی سیاسی و ڕێزنەگرتن و بە هەند وەرنـەگرتنی ڕۆڵـی یەکلاکـەرەوەی فێرکـردن لـە گەشـەپێداندا، هـەروەها خـەرجکردنێکی زیـاد لـە پێویـست بـۆ جوانکـاری و بـەرگری،

هاوکاریی حکومەت بۆ فێرکردن و توێژینەوەی زانستی زۆر کەمبووەتـەوە. ئـەم گـوێ پێنەدانـەی فێرکردنـی ڕەوشـتی و مـاددی، کاریگـەریی لەسـەر خێـزانیش هـەبوو، بۆیـە ناتوانێـت ڕۆڵـی کاریگـەری خـۆی لـە ڕێگـەی پەروەردەی باوك و دایك، بە تایبەتی دایکەوە، بگێڕێت.

دەزگاکانی تر پێویستیان بە پشتگیری هەیە، بۆ ئـەوەی ڕۆڵـی گرنگـی خۆیان لـە پـەروەردە و فێرکردنـدا ببین، دوای ئـەوەی ئێـستا کـارا نییـە. یەکێك لەو دامەزراوانەش (مزگەوت)ە، کە ڕۆڵی یەکلاکەرەوەی لە کۆمـەڵگا ئیسلامییەکاندا هەیە، بەڵام ئێستا بەو کارە هەڵناسێت، چونکە بەشێك لـە پێشنوێژی مزگەوتەکان — ئەوانەی کە پێویستە سەرقافڵە بن و ڕوڵی کـارا لە پەروەردەی ڕەوشتی و بەرزکردنەوەی کەسایەتیی کۆمەڵی نوێژکەرانـدا ببینن — شایستە نین و وا ئامادە نەکراون لە ڕووی فێرکردنـەوە ئـەو ڕۆڵـە ببینن، نەك هەر ئەمە ناکەن، بەڵکو خۆیان بەدوور دەگـرن لـە نوێژکـەران، چەند ساتێك پـێش نوێـژکردن دەگەنـە مزگـەوت و دوای نوێـژیش مزگـەوت بەجێ دەهێڵن. نەریتیشیان وایە تێکەڵی کۆمەڵی نوێژکـەران نـابن، ئەگـەر تێکـەڵیش بـوون، نـاتوانن توانـای هۆشـیاریی ڕەوشـتیی خۆیـان بنـوێنن، چونکە تێڕوانینیان بۆ ئیسلام، لـە زۆر کاتـدا، زۆر سـنووردارە. بـەڵکو زۆر جار تەنیا پێشنوێژی دەکەن و هیچی تـر، جێبـەجێکردنی هەنـدێ کـار کـە پەیوەندیی بە شێوازی دەرەوە هەیە. هەروەها بارودۆخی ئابووریی زۆرێك لە پێشنوێژەکان لاوازە، کە بووەتە ڕێگر لـەوەی ڕۆڵێکـی کـارا لـە گۆڕانـە کۆمەڵایەتییەکانـدا ببیـنن. ئـەم بارودۆخـەی ئێـستا چـاك ناکرێـت، ئەگـەر گۆڕانکاری لـە خوێنـدنی خوێنـدنگا ئایینییەکانـدا نـەکرێت، بـۆ فێرکردنـی

پـــسپۆڕیی پێویـــست بـــۆ خوێنکـــاران و ڕێزدانـــانی زیـــاتر بـــۆ گرنگیـــی دادپـەروەری و ڕەوشـتی جـوان لـە سیـستمی بـەهای ئیـسلامیدا، لـە پـاڵ بەرنامەیەکی پوختە لە فێرکردنی ئایینی و بتوانن بابەتەکان بە ڕێگەیـەکی زانستی شیبکەنەوە و دووربکەونەوە لە پەڕگیری و شێوازگەری.

لە کاتێکدا پێویستە لەسەر خوێندنگە و کۆلێژ و دامەزراوەکانی خوێندنی بـالا، تەاوکـەری ڕۆڵـی خێـزان و مزگـەوت و خوێندنگـە ئایینییـەکان بـن لـە پـەروەردەکردنی ڕەوشـتیدا، ڕۆڵـی بنـەڕەتییان دابینکردنـی فێرکردنێکـی پلەبەرز و چاك بێت، بە تایبەتی زانست و تەکنۆلۆژیا و پـسپۆڕیی پێویـست، بۆ ئەوەی خوێندکاران بتوانن هەلی کاری باشتر لە بازاڕدا بەدەست بهێـنن و بـە شـێوەیەك پـێش بکـەون کـە لـە خێراکردنـی گەشـەپێدانی وڵاتەکەیانـدا یارمەتیدەر بن. چۆنیەتی فێرکردن لە هـەموو دامەزراوەکانـدا، پێویـستی بـە چاکسازیی گەورە هەیە، لە ڕێگەی گۆڕینی بەرنامە و تەرخانکردنی بەشـێکی زۆری داهـاتی حکومەتـەوە بـۆی. وەبـەرهێنان لـە فێرکردنـدا بـە مەبەسـتی چاککردنی چۆنیەتی، دەبێتە هۆی زیادکرنی بەرهەم و لە مەودایەکی درێـژی وەبەرهێنانـدا لـە بوارەکـانی تـری خەرجیـدا، وەك پێداویـستیی سـەربازی. کەنەدی (Kennedy) – مامۆستا لە زانکۆی ییل (Yale) – گەیشتە ئـەو ئەنجامـەی کـە ئـەو میللەتانـەی لـە بـواری سـەربازیدا فراوانبـوون بـەخۆوە دەبینن، لە ئاستی توانای ئابووری تێپەڕ دەکات و بەرگەی ناگرێت، بـەدوای کەوتندا دەگەڕێت.[(1)]

---

[1] . Kennedy, The Rise and Fall of the Great Powers, p. 536-40. ; See also: Toynbee, A Study of History, abridgement by D. C. Somervell, Volume 2, p. 370.

## دووەم: چاکسازیی سیاسی

کاری چاکسازی و بەرزبوونەوەی ئاستی کۆمەڵایەتی و ئابووری، لەوانەیە تا ڕادەیەك زۆر قورس نەبن، ئەگەر دەستەڵاتی سیاسی پشتگیریی ئەمیش بکات. چاکسازیی سیاسی لە پاڵ ئازادیی بیروڕا و سیستمی دادوەریی پاك و لێپرسینەوە لە سەرانی دەستەڵات، بە لای کەمەوە دەتوانێت یارمەتیدەر بێت بۆ کەمکردنەوەی گەندەڵی و خراپیی بەڕێوەبردن، کە ئێستا هەردووکیان بڵاون، ئەگەر یارمەتیدەریش نەبێت بۆ لەناوبردنیان. ئەمە وا دەکات بە شێوەیەکی کارا داهاتی گشتی بۆ فێرکردن و تەندروستی و گەشەپێدانی گوند و شارەکان بەکار بهێنرێت، کە دەبێتە هۆی بەرزکردنەوەی بارودۆخی کۆمەڵایەتی و ئابووری، هەروەها دەبێتە یارمەتیدەر بۆ چاکسازی لە بواری کشتوکاڵدا، وا دەکات جووتیارەکان بە شێوەیەکی دادپەروەرانە بەشێك لە بەرهەمەکانیان وەربگرن و داهاتێکیشیان بۆ بەدەستهێنانی ڕاهێنان دەست بکەوێت، لە پاڵ ئەوەشدا دەستکەوتنی تۆ و ئامێر و پەینی باشتر، لە پێناو زیادکردنی بەرهەم لە ئایندەدا. ئەو کاتە جیهانی ئیسلامی دەتوانێت زیادەیەکی باش لە بەرهەمی کشتوکاڵی بەدەست بهێنێت، لە پێناو وەبەرهێنان لە گەشەپێدانی تەکنۆلۆژیا و پیشەسازی و لە بنەمای سەرەکیدا، کە ئەوە زیادەکەیە جیهانی ئیسلامی

توانیویەتی لە سەدەکانی پێشوودا دروستی بکات، ژاپۆن و کۆریای باشوور و تایوانیش توانییان لە مێژووی نوێدا دروستی بکەن. ئەوەی شایانی باسە، چاککردنی کشتوکاڵ کە دەستەڵاتی داگیرکەر هێنایانە ئەو وڵاتانەی باس کران، یارمەتیدەر بوو بۆ ڕووخاندنی بناغەی دەستەڵاتی سەرکردە دەرەبەگەکان.[1]

## ١ـ چۆنیەتیی بەدەستهێنانی چاکسازیی سیاسی

پرسیاری یەکلاکەرەوە ئەوەیە: چۆن چاکسازیی سیاسی لەو وڵاتانەدا بەدی دێت کە ناشەرعیی سیاسییان تێدا پەیڕەو دەکرێت، کە حکومەتەکانیان بۆ کپکردنەوەی هەر خەباتێك لە پێناو چاکسازیی سیاسیدا، ڕێگەی سەرکوتکەرانە بەکار دەهێنن؟ پێویستە خەباتی چەکداری دوور بخرێتەوە، چونکە لە ڕابوردوودا بە دەگمەن لە وڵاتانی ئیسلامیدا سەرکەوتوو بووە، ئێستاش ئەگەری سەرکەوتنی کەمترە، لە کاتێکدا حکومەتەکان ئامرازی پێشکەوتوو و داهێنەرانەتریان لەبەردەستدایە بۆ سەرکوتکردن و ئەشکەنجەدان و هەژارکردنی ئەوانەی بەشداری دەکەن. هەر هەوڵێك بۆ لابردنی ئەم حکومەتانەی ئێستا لە ڕێگەی بەکارهێنانی هێز و توندوتیژییەوە، لەوانەیە ببێتە هۆی زیانی گەورە لە گیان و سامان و موڵکدا، هێمنی و ئاسایشی کۆمەڵگاکانیش

---

[1] . Chapra, Islam and Economic Development, p. 175-77.

تێکدەچێت و کێشە و گیروگرفتەکانیش خـراپتر دەبـن. ڕەنگـە ئـێش و ئازاری هەژاران زیاتر ببێت، پێویـستیش ناکـات موسـڵمان خـۆی بخاتـە ناڕەحەتییەکەوە کە بەرگەی نەگرێت.[1]

باشترین ستراتیژییەتیش بۆ چاکسازیی سیاسـی، بریتییـە لـە خـەباتی ئاشـتییانەی دوور لـە توندووتیـژی، هـەتاوەکو ئەگـەر ماوەیـەکی زۆریـش بخایەنێت. قورئان بە ڕوونی گفتوگۆ بە باشتر دەزانێت لە چارەسەرکردنی ناکۆکییەکان، کاتێ دەفەرموێت: ﴿ادْعُ إِلَى سَبِيلِ رَبِّكَ بِالْحِكْمَةِ وَالْمَوْعِظَةِ الْحَسَنَةِ وَجَادِلْهُمْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ﴾ النحـل /١٢٥. هـەروەها پێغەمبـەر (درودی خوای لەسەر) جەخت لەسەر خەباتی ئاشتییانە دەکاتەوە، کاتـێ دەفەرموێت: "من يحرم الرفق يحـرم الخـير".[2] هـەروەها دەفـەرموێت: " إن الله رِفيق يحب الرفق ويعطي على الرفق مـا لا يعطـي علـى العنـف ومـا لا يعطي على ما سواه".[3] ڕێنماییـەکانی قورئـان و پێـشەوایەتیی پێغەمبـەر (درودی خوای لەسەر) بە درێژایی مێژوو هەموویان دژی پەنابردنە بەر هێز و توندووتیژی بوون بـۆ بووژاندنـەوەی ئیـسلام. زەحمەتـە لـەوە تێبگـەین

---

[1]. ترمـزی لـە جامیعەکەیـدا لـە حوزەیفـەوە دەگێڕێتـەوە و دەڵێـت: پێغەمبـەر (درودی خـوای لەسـەر) فەرموویەتی: "لا ينبغي للمؤمن أن يذل نفسه". وقالوا كيف يذل نفسه؟ قال "يتعرض مـن الـبلاء، لمـا لا يطيق". بڕوانە:

- الترمذي، الجامع الصحيح، سەرچاوەی پێشوو، بەش/٤، ل٥٢٢، فەرموودەی ژمارە ٢٢٥٤.

[2]. القشيري، صحيح مسلم، سەرچاوەی پێشوو، بەش/٤، ل٢٠٠٣، فەرموودەی ژمارە ٢٥٩٢.

[3]. القشيري، صحيح مسلم، سەرچاوەی پێشوو، بەش/١، ل٧٤، فەرموودەی ژمارە ٥٥.

چۆن کەسێك خۆی بە ئیسلام دابنێت و بێتاوانێك بکوژێت، یان بارودۆخ بشوێنێت، کە ئەمە پێشێلکردنێکی ڕوون و ئاشکرای ڕێنماییەکانی ئیسلامە، ئەمەش بە "بەزەیی" دانانرێت کە قورئان داوا لە موسڵمانان دەکات نموونەی ئەم سیفەتە بن.

## ٢ـ چۆن کار بۆ سەرخستنی خەباتی ئاشتییانە بکرێت؟

ئەم پرسە ژمارەیەك پرسیار لە مێشکی مرۆڤدا دەورووژێنێت، یەکێکیان: ئایا هیچ هیوایەك بۆ سەرکەوتن لە ڕێگەی خەباتی ئاشتییانەوە هەیە؟ ئەوەی دڵخۆشکەرە، ئەوەیە کە ژمارەیەك هۆکار هەن باوەڕبوون بە ئایندە دەبەخشن. ژینگەی نێودەوڵەتی بە چاوی خۆشویستنەوە ناڕوانێتە حکومەتە ناشەرعییەکان، ئەو حکومەتانەش بەرەو کەوتن دەچن.[1] ژینگەی نێودەوڵەتییش دژی گەندەڵی و پارە سپیکردنەوەیە، ئەمە وایکردووە ئەو سامانەی بە ڕێگەی نایاسایی بەدەستهاتووە، شاردنەوەی زەحمەت بێت. پاشان فشاری ناوخۆ کە داوای دیموکراتییەت دەکات، لە نزیکەی هەموو وڵاتانی ئیسلامی ڕوو لە

---

[1]. لە ساڵی ١٩٧٤ز، ٣٩ دەوڵەت لە جیهاندا، یەك لەسەر چواریان دیموکراتی بوون. ئەمڕۆ ١١٥ وڵات زیاتر لە کەمی دوو لە سێ وڵات هەڵبژاردنی ئازاد بۆ هەڵبژاردنی سەرکردە نیشتمانییەکان دەکرێت. (ئەم ژمارەیەی ساڵی ١٩٧٤ لە بانکی نێودەوڵەتییەوە وەرگیراوە) ڕاپۆرتی گەشەپێدانی جیهانی ١٩٩٧ز، ل١١١، لە کاتێکدا ئێستا نوێترین بەیاننامە، بەیاننامەیەکە لە ١٤ی کانوونی دووەمی ٢٠٠٤ لە (Electionword. org) وەرگیراوە.

**زیادبوونە. هەروەها بڵاوبوونەوەی خوێندن و فێرکردن و باشبوونی وردە وردەی بارودۆخی ئابووریی هەژاران، یارمەتیدەر دەبێت بۆ بێهێزکردنی پەیکەرەکانی دەستەڵاتی ئێستا، کە بەهۆی نەخوێندەواری و هەژاریی جەماوەرەوە گەشە دەکەن.**

**چەسپاندنی حکومەتی دیموکراتی، هەتاوەکو ئەگەر لە سەرەتادا سەرکردە دەرەبەگەکان دەستەڵاتیان بەسەریدا هەبێت، بە تێپەڕینی کات پەیکەرەکانی دەستەڵات لاواز دەبن، بە هۆی دەنگدانی جەماوەری هەڵبژاردنەوە. لەوانەیە فشار لەسەر حکومەتە هەڵبژێردراوەکان یامەتیدەر بێت کە وەفایان بۆ جێبەجێبکرنی بەڵێنەکانیان هەبێت. لەوانەیە بۆ کەمکردنەوەی گەندەڵی و خەرجیی سەربازییش یارمەتیدەر بێت[(1)]، هەروەها گواستنەوەی داهاتێکی زیاتر بۆ فێرکردن و تەندروستی و گەشەپێدان، ڕەخساندنی بواریش بۆ چاکسازی لە کشتوکاڵدا. ئەو بەرەو باشییەی لە بارودۆخی کۆمەڵایەتی- ئابووریی هەژاران لە گوندەکاندا هاتووەتە دی، لە ئەنجامی ئەو پارەیەیە کە پەناهەندە کرێکارەکانی**

---

[1]) خەرجیی سەربازیی جیهانی دابەزینێکی گەورەی بەخۆوە بینیوە، لە ۱.۰ ۲ تریلیۆن دۆلارەوە لە ساڵی ۱۹۸۵ بۆ ۸۰۹ ملیار دۆلار لە ساڵی ۱۹۹۸، بەڵام لە ساڵی ۲۰۰۳ بەرزبووەوە بۆ ۹۵۰ ملیار دۆلار. ئەمەش لە بەدبەختیدایە، بەڵام بە پلەی یەکەم دەگەڕێتەوە بۆ داگیرکردنی عێراق لەلایەن ویلایەتە یەکگرتووەکانەوە و بارودۆخی کورتهێنانێکی گەورەی بودجە کە بەراورد کرا. ("خەرجیی سەربازیی جیهانی" ١٦ مایسی ٢٠٠٤).

-(www. globalissues. org/geopolitics/armstrade/spending. asp#worldmilitaryspending)

ڕۆژئـاوا دەینێرنـەوە، لـە داهاتووشـدا چـینێکی مامناوەنـدی بـەرفراوان و بەهێزتری لێ دەردەچێت، کـە حەزیـشی بـە خـەباتی دیموکراتییانەیـە لـە پێناو مافەکانیدا.

جیهـانگیری (العولمـة) کـار بـۆ کپکردنـەوەی حکومەتـە زۆردارەکـان دەکات، لەوانە نەبوونی ئـازادیی بـیرورا لـە نـاوخۆدا. ئـەو حکومەتانـە بـە شـێوەیەکی بـەهێز لەلایـەن هۆیـەکانی ڕاگەیانـدنی نێودەوڵەتییـەوە ڕووبەڕووی ڕەخنە دەبنەوە. بڵاوبوونەوەی هەواڵـەکان لـە ڕێـی ئێـستگە و کەناڵـە ئاسمانییـەکان و فـاکس و تـۆڕی ئینتەرنێتـەوە، هـەوڵی حکومەتـە ستـەمکارەکانی بـۆ چـاودێریکردنی ڕەخنـەی دەرەوە و ڕێگـری لـە بڵاوبوونـەوەی لـەناو خەڵکیـشدا لـە وڵاتێکـی کپکـراودا، تێکـداوە، بۆیـە تەنانەت ئەگەر حکومەتەکان نەکەونە بەر لێپرسینەوەی نـاوخۆ، لـە سـەر ئاسـتی نێـو دەوڵـەتی دەکەونـە بـەر لێپرسـینەوە لەسـەر گەنـدەڵی و پێشێلکردنی مافەکانی مرۆڤـ. لەگەڵ ئـەوەی ئەمـە بـەس نییـە، بـەڵام لـە ئایندەدا کاریگەرییەکی تەندروستی لەسەر ڕێوشوێنی ڕووداوەکان دەبێت.

## ٣ ـ کێشە شاراوەکان لە بەردەم چاکسازیدا

ڕەنگـە سـەرکەوتنی دیموکراتییـەت لـەم وڵاتانـەدا ئـەرکێکی ئاسـان نـەبێت، ئەمـەش بـۆ هەڵویـستی ستـەمکارانە و کەللـەڕەقیی سـەرانی حکومەتـەکانی ئێـستا دەگەڕێتـەوە، کـە لەوانەیـە بـەردەوام بـن لـە بەکارهێنانی هەموو ئامرازێك کـە لەبەردەسـتیاندا بێـت، بـۆ ئـەوەی لـە

هەڵبژاردنەکانـدا سـەربکەون.  هەڵوێـستیان بـە ئاسـانی ناگۆڕدرێـت و ئەگـەریش هەیـە هـەوڵی بـەکارهێنانی فێـڵ بـۆ خۆدوورخـستنەوە لـە لێپرسینەوەی ڕاستەقینە بدەن، بۆیە لەوانەیـە جیاوازییـەکی گـرنگ لـە نێـــوان ڕەفتـــاری دەســـتەڵاتدارە ڕەهاکـــان و دەســـتەڵاتدارە هەڵبژێردراوەکان لە قۆناغی یەکەمدا نەبێت. لەگەڵ ئەوەشـدا جیـاوازیی ڕاستەقینە وردە وردە دەردەکەوێت، لەگەڵ سـەرکەوتنی تێکۆشـان لـە پێنـاو بینینـی دیموکراتییەتـدا، ئـەویش لـە ڕێگـەی ڕۆژنامەگـەری و چـاودێریی نێودەوڵەتییـەوە لەسـەر هەڵبـژاردن، سـەرەڕای چاکـسازیی یاسایی و سیاسی و دادوەری کە زۆر پێویستن. گـرنگترین چاکـسازییش بریتییـە لـە سـەرلەنوێ ڕێکخـستنەوەی پرۆسـەی هەڵبـژاردن و لابـردن یـاخود بـەلای کەمـەوە کەمکردنـەوەی هێـزی پـارە و دەسـتەڵات و ساختەکاری لە هەڵبژاردنی سەرکردە سیاسییەکاندا. ئـەو زیادەڕۆییـەی لـە خـەرجیی هەڵمـەتی هەڵبژاردنەکانـدا دەکرێـت، کـە لـە بەرژوەنـدیی دەوڵەمەنـد و دەسترۆیـشتووەکانە، دژی پـاڵێوراوە بـەتواناکانی چـینی مامناوەندە، هەروەها بانگەشە بۆ گەنـدەڵی دەکـەن، لـە ئـەنجامی ئـەو هەوڵـەی پـاڵێوراوە دەرچـووەکان داویانـە و ئـەو پارەیـەی خـەرجیان کردووە بۆیان بگەڕێتەوە، یاخود سوود بەوانە بگەیـەنرێت کـە داراییـان بۆ هەڵبژاردنەکە پێشکەش کردووە. ئەم هەوڵە ڕووبەڕووی بەرگرییـەکی تونـد دەبێتـەوە، کاتیـشی دەوێـت تـاوەکو سـەربکەوێت. دەسـتەڵاتی

سیاسیی گەندەڵ، کە هیچ بەهرە و توانایەکی نییە تەنیا زۆرکردنی ستەم و هەژارکردنی گەل و ڕێگەگرتن لە گەشەپێدان نەبێت.

سیستمی زەویی بەکرێدراو و موڵکایەتی و میراتگری، دەبێتە ڕێگرێك لە بەردەم دیموکراتییەتدا، لەبەر ئەوەی یەکێکە لە هۆکارە سەرەکییەکانی ستەم و دواکەوتوویی و ژمارەیەك گیروگرفتی ئابووری و کۆمەڵایەتی و سیاسی. چەوساندنەوەی جووتیاران، وایان لێ دەکات تەنانەت نەتوانن خواردنیش بۆ خۆیان و خێزانەکانیان پەیدا بکەن، ئەمانە و بێجگە لە تەرخانکردنی زەویی زیاتر بۆ وەبەرهێنانی تۆ و ئامێر و پەینی باش، دامەزراندنی پیشەسازیی بچووك لە گوند و شارەکان لە پێناو زۆرکردنی بەرهەم و داهاتدا. ئەو چەوساندنەوەیە وا دەکات پێکهاتەی ڕەوشتییان لاواز بێت و پەنا ببەنە بەر فێڵ و درۆ، هەروەها شکۆمەندییان بریندار دەکات و ئارەزوویان بۆ کار کەمدەبێتەوە، توانای بەرهەمهێنان و بەرهەمیان کەمدەبێتەوە کە کار دەکاتە سەر توانایان لە کۆکردنەوە و وەبەرهێناندا، بێبەش دەکرێن لە فێرکردن و ڕاهێنان کە بۆ زیادکردنی توانای بەرهەمهێنان و چاککردنی باری ئابوورییان پێویستیان پێیەتی. جووتیارەکان کە زۆربەی هەرە زۆری دانیشتووان پێکدەهێن، ناتوانن بە ئازادی نوێنەری سیاسییان، ئەوانەی دەیانەوێت، هەڵبژێرن، بەڵام سەرکردە دەرەبەگەکان کاریگەرییان لەسەر هێزە چەکدارەکان و بیرۆکراتیی حکومەت دەبێت، سەرەڕای کاریگەرییان لەسەر دەستەڵاتی دادوەری و پۆلیسیش لە

ڕێگەی منـداڵ و خزمەکانیانـەوە کـە پلـە و پایـەی بـەرز و گرنگیـان لـە دامەزراوەکاندا هەیە، هەروەها بەکارهێنانی دەسـتەڵات و داهاتـەکانیان بۆ کپکردنەوەی هـەموو نـەیارەکان. بـەم شـێوەیە هـەموو ئامرازەکـانی حکومـــەت دەبنـــە خزمـــەتکاری بەرژەوەندییـــە تایبەتییـــەکانیان و بێبەشکردنی چـینی جووتیـار، نابنـە هـۆی زۆربـوونی دەسـتکەوتەکانی سـەرکردە دەرەبەگـەکان، چـونکە ئـەوان پارەکانیـان لـە ڕابـواردن و خەرجکردنی لـە شـتی نابەجێدا تەخـشان و پەخـشان دەکـەن، یـاخود دەیکەنـە وەبـەرهێنان لـە دەرەوە، ئەمـە وڵات ناچـار دەکـات پـەنا بـۆ قەرزی دەرەکی ببات، بەوەش داهاتی ڕێگەپێدراو بۆ گەشـەپێدان کـەم ببێتەوە.

## ٤ـ ئایا جیهانی ڕۆژئاوا دەتوانێت یارمەتی پێشکەش بکات؟

بێگومان جیهانی ڕۆژئـاوا دەتوانێـت ڕۆڵـی هانـدەر بـۆ گەڕاندنـەوەی دیموکراتی و بەهێزکردنی ڕابـوونی کۆمەڵایـەتی – ئـابووری لـە وڵاتـانی ئیـسلامیدا ببینێـت، ئەمـــەش بێگومـــان لـــە ئایندەیـــەکی دووردا لـــە بەرژەوەندییـەتی. زۆریـی لێپرسـینەوەی سیاسـی، دەبێتـە هـۆی زیـاتر بەکارهێنان و سوودوەرگرتن لە داهات، لە پێناو باشـکردنی فێرکـردن و زیاکردنی هەلی کار و کاری تایبەت. ئەمەش لە ڕێی خۆیـەوە دەتوانێـت یارمەتیدەر بێت بـۆ پـشتگیریکردنی ڕابـوونی کۆمەڵایـەتی – ئـابووری، هـەروەها کێـشە و نایەکـسانی نـەهێڵێت کـە گـەل دووچـاری هـاتووە،

شپرزەیی و هەژانی جیهانی ئیسلامی هێور بکاتەوە.[1] دەتوانێت بازاڕ فراوان بکات لە پێناو هەناردەکردنی بەرهەم. پاشان زیادبوونی بازرگانی، دەتوانێت پەیوەندی و لێکتێگەیشتن دروست بکات و هەموو هەوڵی ئەوانەش لەبار ببات کە بەرژەوندییە تایبەتییەکانیان ناکۆکییەکان چڕدەکاتەوە.

ڕۆژئاوا ناتوانێت یارمەتی بۆ گەڕاندنەوەی دیموکراتییەت، یان کەمکردنەوەی شەڕی چەکداری بە بەکارهێنانی هێز، پێشکەش بکات، چونکە هەرگیز هێز سەرکەوتوو نەبووە و ناشبێت. بەکارهێنانی هێز لەلایەن ویلایەتە یەکگرتووەکان و هاوپەیمانەکانیەوە لە ئەفغانستان و عێراق، بەکارهێنانی لەلایەن ئیسرائیلەوە لە فەڵەستین و لوبنان بە یارمەتیی ویلایەتە یەکگرتووەکان، بووە هۆی کوشتنی زیاتر لە ١٠٠ هەزار کەسی بێتاوان و وێرانکردنی بنەما سەرەکییە گرنگەکان و پیشەسازییەکان و کێڵگەکان و خوێندنگەکان و نەخۆشخانەکان.[2]

---

[1]. فێرکردن، ناتوانێت یارمەتیدەر بێت بۆ هێورکردنەوەی هەژان، مەگەر لە ناخی خوێندکارەکاندا تۆوی ڕەوشتبەرزی بچێنرێت و پسپۆڕی تایبەتییان بۆ فەراهەم بکرێت، تا بتوانن داهات بۆ دابینکردنی پێداویستییەکانیان بەدەست بخەن. بڕوانە:

- Krueger, Alan, and Jitka Maleckova. "Education, Poverty and Terrorism: Is there a Causal Connection?" Journal of Economic Perspectives, 17:4, Fall, 2003, p. 119-144.

[2]. ژمارەی ئەو کوژراوانەی ویلایەتە یەکگرتووەکان و هاوپەیمانەکانی، زۆر زیاترە لە ژمارەی ئەوانەی مەغۆل کوشتنی، کە زۆر بە دڵڕەق دادەنرێن. ژمارەی کوژراوانی دەستی مەغۆل لە بەغدا و دەوروبەری، کە لە ٦٥٦ک/ ١٢٥٨ز داگیری کرد، نزیکەی لە نێوان ٢٠٠٠٠ و٨٠٠٠٠دا بوو. بڕوانە:

- Morgan, "Mongols. ", p. 231.

لەبری ئەوەی هەژاری نەهێڵن و پاڵپشتیی پێشکەوتنی کۆمەڵایەتی – ئابووری و دادپەروەری بکەن (ئەو شتانەیە کە ئەم وڵاتانە پێویستیانە) ئەو هێرشانە کاردانەوەی پێچەوانەی هەبوو، ئەمە وا دەکات کە زیاتر ڕقیان لە ڕۆژئاوا ببێتەوە و ژینگەی ڕووبەڕووبوونەوەی خۆش بکەن، دواجار ببێتە بەریەککەوتنی شارستانییەتەکان، کاریگەریی خراپیشی لەسەر هەمووان دەبێت، بە تایبەتیش جیهانی ئیسلامی، چونکە گەشەپێدان و هەنگاوەکانی چاکسازی کۆمەڵایەتی – ئابووری خاودەکاتەوە، کە زۆر زۆر پێویستن.

پێویستە لەسەر ڕۆژئاوا ئەوە بزانێت، جیهانی ئیسلامی کە ژمارەی دانیشتووانی بە ١,٣ تا ١,٨ ملیار کەس مەزەندە دەکرێت، هەموویان یەك پێکهاتەی یەکگرتوو پێکناهێنن. لە کاتێکدا کە بیروباوەڕە سەرەکییەکان هەموو موسڵمانان تێیدا بەشدارن، هەمەچەشنییەکی زۆر لە زمان و ڕۆشنبیری و شێوەی ڕەفتاردا هەیە. سەرەڕای ئەم جۆرییە، بەڵام ئاراستەی سەرەکی لای دانیشتووانە موسڵمانەکە ئێستا و بۆ هەمیشەیی، میانڕەوییە و حەزیان بە ئاشتی کردووە و لەو ڕووەوە هاوکاریش بوون، کارکردنیش لەگەڵیاندا زۆر ئاسانە.[1] برنارد لویس (Bernard Lewis) بە ئاشکرا دان بەوەدا دەنێت کاتێ دەڵێت: "شتێك لە ڕۆشنبیریی ئایینی

---

[1]. هەروەها بڕوانە:

- Esposito, John L. The Islamic Threat: Myth or Reality? Oxford: Oxford University Press, 1992.

ئیسلامدا هەیە، ئەویش ئەوەیە کە هەژارترین جووتیار و فرۆشیاری دەستگێڕ دەورووژێنێت کە هەست بە جوامێری و ڕووخۆشی لە ئاست بەرامبەرەکەیدا دەکات، کە هیچ هەستێك — بە دەگمەن هەبێت — لە شارستانییەتەکانی تردا نایگاتێ".[1]

لە کۆمەڵگای ئیسلامیدا توندڕەو و چەکدار هەیە، هەر وەك چۆن لە هەموو کۆمەڵگایەکی تر لە جیهاندا، پێویست ناکات زیادەڕۆیی لە بوونی توندڕەو لە کۆمەڵگای ئیسلامیدا بکرێت، چونکە ئەوان کەمینەیەکی بچووك لە کۆی کۆمەڵگای ئیسلامی پێکدەهێنن، هەروەها چەکدارەکان لەناو توندڕەوەکاندا ڕێژەیەکی کەمتر پێکدەهێنن. موسڵمانەکان ڕقیان لەو کارانە دەبێتەوە کە چەکدارەکان دەیکەن، چونکە بەزاندن و شکاندنی ڕوون و ئاشکرای ڕێنماییەکانی ئیسلامە. قورئان، کوشتنی کەسێکی بێتاوان یەکسان دەکات بە کوشتنی هەموو مرۆڤەکان.[2] هەروەها ئیدانەی گەندەڵی دەکات[3] کە هەموو جۆرەکانی تاوان دەگرێتە خۆ، لە ناویشیاندا

---

1 . Lewis, Bernard. "The Roots of Muslim Rage. " The Atlantic online, digital edition, Parts I and II, September 1990, part 11, p. 8.

2 . خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿مِنْ أَجْلِ ذَلِكَ كَتَبْنَا عَلَى بَنِي إِسْرَائِيلَ أَنَّهُ مَنْ قَتَلَ نَفْسًا بِغَيْرِ نَفْسٍ أَوْ فَسَادٍ فِي الأَرْضِ فَكَأَنَّمَا قَتَلَ النَّاسَ جَمِيعًا وَمَنْ أَحْيَاهَا فَكَأَنَّمَا أَحْيَا النَّاسَ جَمِيعًا وَلَقَدْ جَاءَتْهُمْ رُسُلُنَا بِالْبَيِّنَاتِ ثُمَّ إِنَّ كَثِيرًا مِنْهُمْ بَعْدَ ذَلِكَ فِي الأَرْضِ لَمُسْرِفُونَ﴾ المائدة /٣٢.

3 . خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَإِذَا قِيلَ لَهُمْ لَا تُفْسِدُوا فِي الأَرْضِ قَالُوا إِنَّمَا نَحْنُ مُصْلِحُونَ﴾البقرة/١١، ﴿الَّذِينَ يَنْقُضُونَ عَهْدَ اللَّهِ مِنْ بَعْدِ مِيثَاقِهِ وَيَقْطَعُونَ مَا أَمَرَ اللَّهُ بِهِ أَنْ يُوصَلَ وَيُفْسِدُونَ فِي الأَرْضِ أُولَئِكَ هُمُ الْخَاسِرُونَ﴾ البقرة/٢٧، ﴿وَلَا تُفْسِدُوا فِي الأَرْضِ بَعْدَ إِصْلَاحِهَا وَادْعُوهُ خَوْفًا وَطَمَعًا إِنَّ رَحْمَتَ اللَّهِ قَرِيبٌ مِنَ الْمُحْسِنِينَ﴾ الاعراف /٥٦، ﴿وَإِلَى مَدْيَنَ أَخَاهُمْ شُعَيْبًا قَالَ يَا قَوْمِ اعْبُدُوا اللَّهَ مَا لَكُمْ مِنْ إِلَهٍ غَيْرُهُ قَدْ جَاءَتْكُمْ بَيِّنَةٌ مِنْ رَبِّكُمْ فَأَوْفُوا الْكَيْلَ وَالْمِيزَانَ وَلَا تَبْخَسُوا النَّاسَ أَشْيَاءَهُمْ وَلَا تُفْسِدُوا فِي الآرْضِ بَعْدَ

ڕووخاندن و وێرانکردنی ژیان وماڵ و موڵك به ناهەق، پاپەندنەبوون به پەیوەستە کۆمەڵایەتی – ئابوورییەکانەوە، هەر شتێکیش ببێتە هۆی گێرەشوێنی و ترس و نائارامی و کوێرەوەری.[1] بۆیە یەکسانکردن لە نێوان ئیسلام و موسڵمانان و "ئیرهاب" یاخود "فاشییەت"دا، زۆر زۆر دوورە لە ویژدانەوە، شوورەییە و دەبێتە مایەی بێزاری و تووڕەبوون، نییەت خراپی و دڵەڕاوکێ زیاتر دەکات.

پێویستە لەسەر ڕۆژئاوا کە چاوبکاتەوە و بزانێت کە هەموو گەلانی جیهان ئایین و بەها و ڕۆشنبیرییەکانیان خۆش دەوێت، بە یەك چەمکی جیهانگیر (العولمة) قایل نابن، بە بێ ڕەچاوکردنی گەلەکان ئایا لە چین یان لە ژاپۆن یان لە هیندستان یان لە جیهانی ئیسلامی بن، لەم بارەیەوە جیهانی ئیسلامی بە تەنیا نییە. هەر هەوڵێك بۆ سەپاندنی ڕۆشنبیریی ڕۆژئاوا بدرێت، قبووڵ نییە و بێگومان ڕووبەڕووی دەوەسترێتەوە. هەروەها پێویستە ئەوەش بزانرێت کە تازەگەری و جیهانگیری تەنیا پەیوەست نییە بە ڕۆژئاواوە، مەرجیش نییە خۆهەڵکێشان بە ڕۆژئاواوە، یاخود خەونی بەڕۆژئاوابوون

---

إِصْلَاحِهَا ذَلِكُمْ خَيْرٌ لَكُمْ إِنْ كُنْتُمْ مُؤْمِنِينَ﴾ الاعراف /٨٥، ﴿وَالَّذِينَ يَنْقُضُونَ عَهْدَ اللَّهِ مِنْ بَعْدِ مِيثَاقِهِ وَيَقْطَعُونَ مَا أَمَرَ اللَّهُ بِهِ أَنْ يُوصَلَ وَيُفْسِدُونَ فِي الأَرْضِ أُولَئِكَ لَهُمُ اللَّعْنَةُ وَلَهُمْ سُوءُ الدَّارِ﴾ الرعد/٢٥، ﴿وَلَا تُطِيعُوا أَمْرَ الْمُسْرِفِينَ (١٥١) الَّذِينَ يُفْسِدُونَ فِي الأَرْضِ وَلَا يُصْلِحُونَ﴾ الشعراء/ ١٥١–١٥٢.

[1]. سەیری ئەو ئایەتانە بکە کە وشەی "الفساد"ی تێدا هاتووە لەژێر ڕەگی "فسد"ە لە کتێبی "المعجم المفهرس"ی محمد فؤاد عبدالباقی. هەروەها بڕوانە:

- AbuSulayman, Crisis in the Muslim Mind, p. 139-141.

(Westernization) بتکاتە برای ڕۆژئاوا. بێگومـان پـشتبەستن بـە تەکنۆلۆژیای نوێ بۆ گەشەپێدان، کـارێکی بەڵگەنەویـستە. ئـەوەش لـە بیرنەکرێت تەکنۆلۆژیا لە ئاکامی هاوکاریی ژمارەیـەك شارسـتانییەتەوە بە ئەنجام گەیشتووە، لە ناویشیاندا شارستانییەتی چینی و هیندستانی و بێزەنتــی و ساســانی و ئیــسلامی. ئەگــەر شارســتانییەت ڕۆژئــاوایی نەبێت، ئەی ئەم خۆچوواندنانە بـە ڕۆژئـاوا مانـای بـە چـی؟ ئایا ئەمـە بەهایە؟ هەموو وڵاتێك مافی خۆیەتی بە بەهاکانیەوە پاپەند بێت، لـەو ڕووەوە پێویـستە دەستخۆشیـشی لـێ بکرێـت، چـونکە جـۆرێکی تـر و دەوڵەمەندییەکی تر دەخاتە سەر چینەکانی تری جیهـانی کۆمەڵایـەتی و ڕۆشنبیری. ئەمەش ئەوە ناگەیـەنێت کـە ئـەو ڕۆشـنبیرییەی بەسـوودە بەبێ هۆ پشتی پێ نەبەستین، مێژووش دەیسەلمێنێت کە موسڵمانەکان هەمیشە ئەمەیان ئەنجام داوە.

گومـانی تێـدا نییـە موسـڵمانانیش _ هـەر وەك گـەلانی تـر- خـاڵی لاوازیان هەیە، کە ئەوەش پەیوەندیی بـە ئیـسلامەوە نییـە و پێویـستە لاببرێن. دەتوانرێت ئەمەش وردە وردە بە ئەنجام بگەیەنرێت، ئەویش لە ڕێگەی پەروەردە و فێرکردنێکـی دروسـت و ڕابـوونێکی کۆمەڵایـەتی - ئابووری و چاکسازیی سیاسـییەوە. ئەنجامـدانی گـۆڕانی کۆمەڵایـەتی، قورســترین ئەرکــە و زۆرتــرین کاتیــشی دەوێــت. زۆربــەی ئــەدەبیاتی پەیوەست بە گـۆڕانی کۆمەڵایـەتی، وا دەردەخـات کـە گـۆڕان دروسـت نابێت ئەگەر لەسەرخۆ نەبێت. ئەمەش پێویـستی بـە ئاسـتێکی بـەرزی

ئـارامگرتن هەيـە، ئـەركی حكومەتـەكان و دامـەزراوە فێركارييـەكان و بزوتنەوە چاكسازييەكانيشە هەوڵەكانيان بۆ سەركەوتنی يەك بخەن.

پێويـستە لەسـەر ڕۆژئـاوايش هەسـت بـەوە بكـات كـە جۆرێـك لـە تێنەگەيـشتنی دەربـارەی جيهـانی ئيـسلامی هەيـە، بـە هـۆی شـەڕی خاچپەرستەكان و هێرشە دڕندانەكانی دژی ئيسلام و بۆ سەر پێغەمبەريش (درودی خوای لەسەر).[1] وا چاوەڕوان دەكرا لـە سـەردەمی جيهانگيريـدا ئەم هێرشانە هێور بكرێنەوە– كە لە نێـوان چـەند سـەدەيەكی ڕابـوردوودا ڕوويان داوە–، بەڵام لە بەدبەختيدا ئەمە ڕووی نەدا، هێرشەكان نەك هـەر زيادیان كرد، بەڵكو زياتر دڕندانـە بـوون. ئەمـە بـووە هـۆی قوڵبوونـەوەی گرژی و ئاڵۆزييەكە و كەڵەكـەبوونی لێكتێنەگەيـشتن لەنێوانيانـدا. ئـەوەی ئەركی ڕۆژئاوايە، پێويستە ستراتيژييەتەكەی بگۆڕێت، بە پشتبەستن بـەم سێ ڕێگە چارەيە كە زۆر پێويستن:

أ– وازهێنان لە هێرشكردنە سەر ئيسلام، لە ڕێگەی دووپاتكردنەوەی بيروباوەڕ و بەها هاوبەشەكانی مەسيحی و ئيسلام.

ب– پێـشكەشكردنی ئـەو يارمەتييانـەی كـە جيهـانی ئيـسلامی زۆر پێويستيەتی، لە پێناو خێراكردنی ڕابوونی كۆمەڵايەتی – ئابووری.

ج– پشتگيريكردنی چاكسازيی سياسی.

---

[1]. بۆ زانين دەربارەی شيكاريی تەواوی گرژی و ئـاڵۆزيی نێـوان ئيـسلام و ڕۆژئـاوا، بڕوانـە (بـە تايبـەتی بەشی دووەم) لە:

-Esposito, The Islamic Threat: Myth or Reality?

خۆشبەختانە ئێستا ئەم شتانە تا ڕادەیەك دەستیان پێ کردووە، بە تایبەت لەلایەن ژمارەیەك لە زاناکانەوە کە جەخت لەسەر بیروباوەڕ و بەها هاوبەشەکانی نێوان مەسیحییەت و ئیسلام دەکەنەوە. ڕیچارد بولیت (Richard Bullet) دەڵێت: ئەم دوو ئایینە بران و جیاوازییەکی بنەڕەتی لە نێوانیاندا نییە، تا ئاستێك دەتوانین بڵێین: "شارستانییەتێکی ئیسلامی مەسیحی هەیە".[1] لویس (Lewis)یش دەڵێت: "زۆرینەیەکی گرنگ هەیە لە موسڵماناندا کە هاوبەشن لەگەڵیاندا لە بیروباوەڕەکان و ئاواتە سەرەکییەکان: ڕۆشنبیری و ڕەوشتی، کۆمەڵایەتی و سیاسی".[2] لویس لەسەر وتەکانی بەردەوام دەبێت و دەڵێت: "ئیسلام بە هێمنی و لەسەرخۆ بۆ ملیۆنان پیاو و ئافرەت کە ئەژمار ناکرێن، شکۆمەندی و مانای گەڕاندەوە ناو ژیانی گۆشەگیر و هەژارەکان. خەڵکی لە هەموو چین و توێژەکان، فێری کەشوهەوایەکی برایانە کرد، خەڵکی لە هەموو بیروباوەڕەکان فێر کرد کە لە ژینگەیەکی لێبوردەیی شیاودا لە پاڵ یەکتردا بژین. سەرچاوەیەکی گرنگ بوو بۆ شارستانییەتێکی مەزن کە خەڵکانی تریش لەگەڵ موسڵمانەکاندا ژیانێکی بەسوود و داهێنەر بژین. دەستکەوتەکانی کاریگەریی لەسەر هەموو جیهان هەبوو".[3] ئەگەر لە هەردوو ئایینەکەدا ئاستی هاوبەش ئەوەندە هەبوو کە بتوانن هاوبەشییەك

---

1. Bullet, The Case for Islamo-Christian Civilization.
2. Lewis, Bernard. "The Roots of Muslim Rage. ", part 1, p. 2.
3. Ibid.

پێکبهێنن، ئـەی بۆچـی لـەبری پێکـدادانی دوو شارسـتانییەت، پێویـستیی پێکەوەژیانێکی ئاشتییانە دووپات ناکەنەوە.

یارمەتییە مرۆییەکان بەردەوامە و ئەمەش یارمەتیدەر دەبێت بۆ کێشەی ڕابـوونی کۆمەڵایـەتی – ئـابووری. سـەرەڕای ئـەوەش ژمارەیـەکی زۆری موسـڵمانان لـە وڵاتـانی ڕۆژئـاوا دەخـوێنن و کـار دەکـەن، ئـەو پارەیـەی پەناهەندەکان بۆ وڵاتەکانیانی دەنێرنەوە، بۆ پاڵپشتیی ڕابوونی کۆمەڵایەتی – ئابوورییە. ڕەنگە هەر ئـەوە پاڵپـشتێك بێـت لـە ڕێگـەی یارمەتییـەوە بـۆ نـەمانی هـەژاری و بێکـاری. ئەگـەر بهاتبایـە ویلایەتـە یـەکگرتووەکان ئـەو ملیاران دۆلارەی لە پێناو وێرانکردنی ئەفغانستان و عێراقدا خەرجی کرد، بۆ گەشەپێدانی ئەو دوو وڵاتە بووایە، ئەوەی ئامانجیان بوو، بـەدییان دەهێنـا. ڕۆژئاواش دەتوانێ یامەتیدەر بێت بۆ بەدەستهێنانی چاکسازیی سیاسـی لـە ڕێـی چـاودێریکردنی هەڵبژاردنـەکان و بـەهێزکردنی چاکـسازیی یاسـایی و دامـەزراوەیی. ئـەم یارمەتییـە ژینگەیـەکی گونجـاوتر لـە پێنـاو خێراکردنـی چاکسازی و یارمەتیدانی یەکتر و ژیانێکی ئاشتەوایی دەڕەخسێنێت.

## ٥ ـ ئایا ئیسلام دەتوانێت جارێکی دیکە ڕۆڵی هاندەر ببینێت؟

کـارێکی یەکلاکـەرەوە سـەر هەڵـدەدات، سـەبارەت بـەوەی ئەگـەر گەشەکردنی ئیسلام لە جیهـانی ئیـسلامیدا بەردەوامـە، ئایـا دەتوانێـت هیچ یارمەتییەك پێشکەش بە کۆمـەڵگا ئیـسلامییەکان و پێشخـستنیان بکات، ئەگەریش ناتوانێت یارمەتیی بدات لە بەدەستهێنانی دادپـەوەری و چاکسازی کە پێویستن بـۆ هـەردوو بـواری کۆمەڵایـەتی – ئـابووری و

سیاسی، هەر وەك ئەوەی لە سەردەمی كۆندا (كلاسیكی) كردی و یامەتیدانیشی لە ڕووبەڕووبوونەوەی كێبڕكێكان كە ڕووبەڕووی دەبنەوە لە جیهانی نوێدا. وا دەردەكەوێت كە كۆمكارێك لە جیهانی ئیسلامیدا هەیە پشتگیری لە بەدەستهێنانی ئەو داواكارییانە بكات. ڕامزی كلارك (Ramsey Clark) داواكاری گشتی لە ویلایەتە یەكگرتووەكان، لە ئیدارەی سەرۆك لیندن جۆنسۆندا، دان بەوەدا دەنێت، كاتێ ئاشكرای كرد كە ئیسلام: "لەوانەیە هێزێكی ڕۆحی و ڕەوشتی بێت، كە لەم ڕۆژەدا توندترین كاریگەریی لەسەر زەوی هەبێت".[1] دیارە ئەوەش بۆ ئەوە دەگەڕێتەوە كە ئیسلام ڕاستییەكی زیندووە لە جیهانی ئیسلامیدا، كە كاریگەریی بەهێزی هەیە و سەرەڕای جیاوازیی ڕەگەز و ڕۆشنبیرییان وا دەكات جەماوەر ڕابكێشێت و یەكیان بخات، هاندەریشیانە بۆ ڕەفتاری ڕاست، ئەمە سەرەڕای تێپەڕبوونی چەند سەدەیەك بەسەر دارماندا. ئیسلامیش بەرنامەی تایبەتی خۆی بۆ چاكسازیی گشتگیر هەیە: ڕەوشتی و كۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی. گونجاوترین بەرنامەیە بۆ ئەم وڵاتانە، لە هەر بەرنامەیەكی تر كە لە دەرەوە بهێنرێت. دووپاتكردنەوەی بەهێزی لەسەر بەها ڕەوشتییەكان و بنیاتی كەسایەتی و دادپەروەریی كۆمەڵایەتی – ئابووری و لێپرسینەوە لە

---

[1] . Clark, Ramsey. Interview with Impact International. London, UK, December 10, 1997.

دەستەڵاتی سیاسی و حوکمی یاسا، بەستراو بە ستراتیژییەتێك پشت بە بەکارهێنانی فێرکردن و گفتوگۆ لە پێناو بەدەستهێنانی گۆڕان، بێگومان ئەبێت نیعمەتەکەی بۆ جیهانی ئیسلامی بێت، چونکە ئەو هاندەرە بۆ سادەیی ژیان، کە یارمەتیدەرە بۆ کەمکردنەوەی بەکارهێنانی نەگونجاو لەگەڵ ئارەزوودا. بەو شێوەیەش یەکێك لە هۆکارەکانی گەندەڵی و کەمیی پاشەکەوت و وەبەرهێنان لاواز دەبێت. ڕەنگە هاوکار بێت بۆ چاندنی ژمارەیەك تۆوی سیفاتی باش، وەك: ڕاستگۆیی و ئەمانەت و ڕاستگۆ لە بەڵێنی کاتدا، هەڵسوکەوتێك لە ویژدان و کۆشش و ئابووری و پشتبەستن بە خود، لێبووردن و ڕاستی لە پەیماندا، هەموو پەیوەستە کۆمەڵایەتی و ئابوورییەکان و گرنگیدان بە مافی خەڵکی و خۆشگوزەرانییان. ئەم سیفاتانە بۆ بەهێزکردنی گەشەپێدان و دادپەروەری پێویستن. ئیسلام گرنگییەکی زۆر بە خێزان و هاوکاریی کۆمەڵایەتی دەدات، کە کاری بنەڕەتین لە پێناو مانەوەی کۆمەڵگا، ئەمە بێجگە لە پێشخستنی. هەروەها ئیسلام نەرمییەکی تەواوی تێدایە کە لەگەڵ هەموو بارودۆخێکدا دەگونجێ.

لەبەر ئەوەی گەشەکردنی ئیسلامی لە جیهانی ئیسلامیدا بووەتە دیاردەیەکی ڕەگداکوتاوی قووڵ، بۆیە هەر هەوڵێك بۆ ڕووخانی ئیسلام و چاندنی عەلمانییەت لە جێگای بدرێت، لەوانەیە پەنابردن بۆ بەکارهێنانی هێز کارێکی پێویست بێت، لەوانەشە ئەنجامەکەی کارەسات بێت لە جیهانی ئیسلامیدا، هەر وەك لە ڕابوردوودا ڕووی دا،

کاتێ مەئمون و دوو خەلیفەی دوای ئـەو بیروبـاوەڕی موعتەزیلـەیان بـە زۆر بەسەر خەڵکدا سەپاند، کە زانایان بە دژی شـەریعەتیان دانـا. ئـەم بەکارهێنانی هێزە بووە زنجیرەیەك کاردانەوە کە تا ئیـستاش کۆمـەڵگا ئیـسلامییەکان پێـوەی دەنـاڵێنن. بـە هـەمان شـێوە ئەگـەر هێـز بەکاربهێنرێت، کێشە کۆمەڵایەتییەکان کەڵەکە دەبن و هاندەر دەبێت بۆ توندووتیژی، تەنانەت لەم سـەردەمە نوێیەشـدا بـە زەحمـەت کـۆنترۆڵ دەکرێت. هەروەها خـراپتریش لـەوە، فەلـسەفەی مـاددی و فەلـسەفەی ئـارەزوو و چـێژ جێگـەی ئیـسلام دەگرێتـەوە، کـە دەبێتـە هـۆی بەهێزکردنی بەکارهێنانی دژ بە خواست و ئارەزوو و بەرەڵایی سێکسی و نوقومبوون لە ڕابواردن و کەیف و لـەزەت، دەبێتـە هـۆی لاوازکردنـی ئامرازی ڕەوشتی و هاندەر دەبێـت بـۆ زیـادەڕۆیی و خـەرجی لـە توانـا بەدەر، هەروەها کەڵەکەبوونی گەندەڵی و کەمبوونـەوەی پاشـەکەوت و وەبـەرهێنان، تێکـچوونی حاڵـەتی هاوسـەنگییەکان بـەرەو خـراپتر، بەرزبوونـەوەی ئاسـتی سـتەم و لاوازبـوونی هاوکـاریی خێزانـی و کۆمەڵایەتی، بەڵام ئەنجامی لەسەر پێشکەوتن و ڕابوونی کۆمەڵایـەتی و ئابووری، زەحمەتە پێشبینی بکرێت چی ڕوو دەدات.[١]

1 . Richards, Alan. "Explaining the appeal of Islamic Radicals. " Global Policy Briefs No. 1. Santa Cruz, CA: Center for Global, International and Regional Studies (University of California), January, 2003; and Etzioni, Amitai. "Religious Civil Society is Antidote to Anarchy in Iraq and Afghanistan. " The Christian Science Monitor, 1 April, 2004, www. csmonitor. com/2004/0401/p09501-coop. html.

یەکەم هەوڵی توند و قورس لەم سەردەمە نوێیەدا بۆ ڕووخاندنی ئیسلام، هەوڵی ڕووخاندنی حکومەتێکی ئیسلامی لە تورکیای زۆرینە موسڵمان بوو. ئەمەش بووە هۆی زیادەڕۆیی پشتگیریی حکومەت لە سوپا، کە دەستەڵاتی ڕاستەقینەیان بەکارهێنا، لەگەڵ ئەوەی ڕووکارێکی ساختەی دیموکراتییان پیشان دا. لە ماوەی چل ساڵی ڕابوردوودا، لە ساڵانی ١٩٦٠ز و ١٩٧١ز و ١٩٨١ز و ١٩٩٧ز، بە زۆرداری حکومەتی هەڵبژێرراوی ڕاست و دروست لە تورکیا لەلایەن سوپاوە لەسەر کار لابراوە، بەڵام ئەمجارەیان لەگەڵ ئەوەی سوپا هێز و توندووتیژی بۆ ڕووخاندنی ئیسلام بەکارهێنا، کەچی سەرکەتوو نەبوو. ئێستا لە تورکیا بزووتنەوەیەك هەیە بۆ گەشەکردنی ئیسلام: "ئەگەرچی حەزێکی کەمالی (ئاماژەیە بۆ کەمال ئەتاتورك) بۆ نەهێشتنی ئیسلام هەبوو، ئەوە لەناو ناچێت و لەوانە نییە لە داهاتووشدا لەناو ببرێت، وا چاوەڕوان دەکرێت مافی مرۆڤ لەبری ئەوەی کەمببێتەوە، گەشە بکات.[1] نەبوونی لێپرسینەوە — بە بێ

---

[1]) Mehmet, Ozay. Islamic Identity and Development: Studies in the Islamic Periphery. London: Routledge, 1995, p. 125.

تەنانەت لە ئێرانیش لە پێش شۆڕش، هەوڵی شا بۆ سەپاندنی شێوازی ژیان و نەریتی ڕۆژئاوا لەو وڵاتە، ناڕەزاییەکی زۆری لێکەوتەوە و یەکێك بوو لە هۆکارە سەرەکییەکانی هەڵگیرسانی شۆڕش. بڕوانە:

- Algar, Hamid. "The Oppositional Role of the 'Ulama' in Twentieth Century Iran. " In Nikki R. Keddie (ed. ), Scholars, Saints, and Sufis. Berkeley: University of California Press, 1972; Graham, R. Iran: The Illusion of power. New York: St. Martin's Press, 1979, and Arani, S. "

وەستان – بەردەوام بوو، لەگەڵ خراپ بەکارهێنانی داهاتی گشتییش، هەردووکیان هۆکار بوون بۆ دواکەتنی تورکیا. تورکیا بەردەوام پارێزگاری – کە وڵاتێکی تازە پێگەیشتووە– لە سوپاکەی کردووە، کە لە دوای سوپای ویلایەتەیەکگرتووەکانی ئەمریکا، گەورەترین سوپایە لە پەیمانی ناتۆ (ڕێکخراوی پەیمانی باکووری ئەتڵەسی)، ئەمە هۆکار بووە کە ڕێژەی گەشکردن زۆر بەرز بێت لە خەرجی بۆ بەرگری، بە ڕێژەی ٧٪ لە ماوەی پێنج ساڵدا، لە نێوان ساڵانی ٢٠٠٢ز و ٢٠٠٦ز، بە ڕێژەی ٢,٥٪ و ٢,٩٪ بە بەراورد لەگەڵ شانشینی یەکگرتوو و ویلایەتە یەکگرتووەکان لە هەمان ماوەدا، ڕێژەی کۆی بەرهەمی ناوخۆیی (٣,٤٪) بووە، بۆیە خەرجکردنی بۆ بەرگری، گەورەترین خەرجییە لە خەرجیی هەر وڵاتێکی تری ئەندام لە ناتۆ، بێجگە لە ویلایەتە یەکگرتووەکانی ئەمریکا کە (٣,٨٪) بووە.[1] بەم شێوەیە تورکیا دووچاری کورتهێنانی گەورەی بودجە دەبووەوە، زیاتر لەوەی لە ڕابوردوودا، لە سەردەمی سوڵتانە گەندەڵەکاندا تووشی دەهات. ئەمانە هەوڵیان دەدا داهات لە ڕێگەی قەرز و فراوانکردنی بواری پارەوە بەدەست بهێنن، لەگەڵ ئەوەی حاڵەتەکانی کورتهێنان بە هۆی گەندەڵی و زیادەڕۆیی لە خەرجی سەربازی و گەندەڵی لە بەڕێوەبردندا، بە

---

Iran: From the Shah's Dictatorship to Khomeini's Demagogic Theocracy. " Dissent, winter 1980, p. 9-26.

1 . See the Defence Expenditures of NRC Countries (1985-2006), Tables 2, 3 and 6 (www. nato. int/docu/pr/2006/p06-159e. htm).

شێوەیەکی بەرهەمهێن بەکارنەدەهێنران. بەرزترین بەند لە بودجەدا ئەو بڕە پارانە بوو کە قازانجیان دەدا، بەرزدەبووەوە بۆ ٧٩٪ کە لە داهاتەکانی حکومەت بوو لە باجی ساڵی ٢٠٠١ز.(١) هەر وەك چاوەڕوان دەکرا، حاڵەتەکانی کورتهێنان لە بودجەدا ڕەنگدانەوەی هەبوو، بۆ ئەوەی زیاتر بێت لە ڕێژەکانی هەڵاوسان لە هەموو جیهاندا: ٣٢,١٪ ساڵانە لە نێوان ١٩٦١ز و ساڵی ٢٠٠٠ز بە بەراورد لەگەڵ ڕێکخراوی یارمەتی و گەشەپێدانی ئابووری (OECD) و ٨,٢٪ لە ڕۆژهەڵاتی ئاسیا و ٢٦٪ لە ئەمەریکای لاتین.(٢) بەم شێوەیە دابەزینێکی زۆر لە ڕێژەی خەرجکردندا هەبوو، کە لە ٩,٣ لیرە بۆ دۆلارێك لە ساڵی ١٩٥٠ز و ١٩٦٠ز دابەزی بۆ ٢٢٣٤٦٤٢ لە کانوونی یەکەمی ٢٠٠٢ز.(٣) لە چ ڕوویەکەوە حکومەتەکانی ژەنەڕاڵە (عەلمانییە)کان لە گەندەڵیی سوڵتانەکان جیاواز بوون؟ هەوڵی سەربازەکان بۆ ڕزگاربوون لە ئیسلام بە ناوی عەلمانییەوە، هیچ ئاکامێکی نەبوو، تەنیا زۆربوونی گەندەڵیی سیاسی و هەڵاوسان و ناکۆکیی کۆمەڵایەتی نەبێت. وتارێك لە ڕۆژنامەی نیویۆرك تایمزدا بڵاوکراوەتەوە کە تێیدا هاتووە: "حیزبە

---

1 . International Monetary Fund (IMF). Turkey at the Crossroad: From Crisis Resolution to EU Accession. Occasional Paper No. 242 prepared by a team led by Reza Moghadam, Washington, DC: IMF, 2005, Table 5. 1, p. 34.

2 . Ibid. , Table 2. 3, p. 7.

3) IMF, International Financial Statistics, CD-ROM, and Yearbook 2004, p. 4.

عەلمانییەکان کە سەربازەکان پێیـان باشـتر بـوو، لـە چـاندنی تـۆوێکی میللیی قووڵ سەرکەوتوو نەبوو، بە زۆریش بەو شێوەیە سـەیر دەکـران کە گوێ بە کێشەی تورکـە ئاسـاییەکان نـادەن و ئـەوان هـەر خـەریکی تۆڵەسەندنەوەی کەسی و گەندەڵین". [١]

هەروەها عەلمانیـەت، وڵاتـانی ئیـسلامیی دیکـەی بـەرەو بـارودۆخی خراپتر برد، لە کاتێکدا کە چوارچێوەی بنەڕەتی دیموکراتی و دادوەری لە تورکیا هـەر مایـەوە، هەنـدێ دەسـتەڵاتدار لـە هەنـدێ وڵاتـانی تـردا توندووتیـژتر بـوون و لـەخواترس نـەبوون، وەك هـەر دەسـتەڵاتدارێك زەحمەتـە پێـشبینی بکرێـت لـە سـایەیدا چـی ڕوو دەدات. هـیچ جـۆرە ئازادییەکی بیروڕا لەو وڵاتانەدا نەبوو، ستەمی زۆری تێدا دەکرا و مـافی مرۆڤــ پێـشێل دەکـرا. لـە هەنـدێ لـەم وڵاتانـە، توانایـەکی گـەورە بـۆ گەشــەپێدان هــەبوو، بـەڵام بـە خێرایـی هەرەسـی هێنـا و بـارودۆخی خەڵکیش تا ئاستێکی زۆر، خراپ و مایەی خەفەت بوو.

### ٦ ـ چاکسازی لە تێگەیشتنی ئیسلامدا

لە ڕاستیدا ئیسلام هۆکار نەبوو بۆ دارمانی موسڵمانان، ئەمەش ئەوە ناگەیەنێت پێویست بە چاکسازی نییە بۆ تێگەیشتنی نوێ لـە ئیـسلام. وا دەردەکـەوێت کـە جەختکردنـەوەی ئیـسلام لەسـەر دادپـەروەری و

---

[1] . Reproduced by the International Herald Tribune, 26 March 1996, p. 6, from the editorial entitled ' Civilian Rule for Turkey' in the New York Times.

برایەتی و لێبووردن لە نێوان مرۆڤەکاندا، لە ناوەندی هەندێ چینی کۆمەڵگا ئیسلامییەکاندا زۆر لاواز بووە، هەر وەك چۆن جەختکردنەوە لە بنیاتی ڕەوشتی کەسایەتیدا لاواز بووە. ئەمەش بۆ – بۆ مەودایەکی دوور– کاریگەریی مێژوویی دەگەڕێتەوە و لەو وڵاتانە سەری هەڵداوە کە نا شەرعییەتی سیاسی تێیاندا بڵاوە، کە دەزگاکانی فێرکردنیانی تێدا نییە و بارودۆخی کۆمەڵایەتی – ئابووری لە ئاستێکی نزمدایە، هەروەها ستەمیان تێدا زۆرە، ئەمە سەرەڕای داگیرکردنیان بۆ ماوەیەکی دوورودرێژ لەلایەن وڵاتانی بیانییەوە. چاککردنی بارودۆخەکەش بە بێ دۆزینەوەی تێگەیشتنێکی گونجاو بۆ ئیسلام، مەحاڵە. ئەمەش پێویستی بە گۆڕانی گەورە لە بەرنامەی دامەزراوە فێرکارییەکاندا و بە تایبەتیش بەرنامەی خوێندنگە ئایینییەکاندا هەیە. پێویستیشە لەسەر بەرنامە پوختکراوەکان زیاتر مەبەستەکانی شەریعەت و ڕەوشتی جوان دووپات بکاتەوە.

لەگەڵ ئەوەی مەبەستەکان بریتییە لە ڕۆحی ڕێنمایی ئیسلامی، بەڵام لە ماوەی ئەم سەدە کەمانەی دوایی، خرابوونە دواوە، بۆیە پێویستە بگەڕێنرێتەوە بۆ پێشەنگ، بە مەبەستی ئامادەکردنی ژینگەیەك بۆ تێگەیشتنی باشتر لە قورئان و سوننەت، ئەمەش دەبێتە هاندەر بۆ کرانەوەی (فیقه) لە کۆتوبەندی لاساییکردنەوەی کوێرانە لە ئەحکامەکانی پێشوو، کە لە بارودۆخێکی زۆر جیاواز لە واقیعی ئەمڕۆ دەردەکران، لەوانەیە ببێتە سەرلەنوێ گەشەکردنەوەی، هاوشێوەی

ئەوەی کە لـە سـەدەکانی یەکـەمی ئیـسلامدا ڕووی دا. چـونکە بـە بـێ ئەوە، سەرکەوتنی ئیسلام لـە ململانێکـانی سـەردەمی نوێـدا زەحمـەت دەبێت، کە هـەموو بارودۆخەکـە جیـاوازە لـەو بارودۆخـەی ڕووبـەڕووی فەقیهەکانی پێشوو دەبووەوە. ئەمە یارمەتیدەر دەبێت بۆ سەرلەنوێ پرشـنگداریی تایبەتمەنـدیی ڕێنماییـە ئیـسلامییەکان، لـە میانـەی کەمکردنەوەی ئەو بیروڕا جیاوازانەی ئێستا، سـەرەڕای ناکۆکییـەکان و دەمـارگیری و لێنـەبووردن و دووپاتکردنـەوەی ئـەو شـتە ڕووکـارە ڕێپێنەدراوانەی کە لە ئەنجامی گوێنەدان بە مەبەستەکان لـە تەفـسیری دەقەکانـدا سـەریان هەڵـداوە. ئیمـامی حەرەمـەین (أبوالمعـالي الجـویني٤٧٨ ك/١٠٨٥ز کۆچـی دوایـی کـردووە) باشـی پێکـاوە کـە دووپاتیدەکاتەوە و دەڵێت: "هەر کەسێك ڕۆڵـی مەبەسـتەکان لـە ڕووی ڕاپەڕاندن و جێبەجێکردنی فەرمانەکان کە لە نـاوەڕۆکی شـەریعەتدایە، تێنەگات، لە جێبەجێکردنیدا چاوکراوە و زیرەك نییە". [١]

لاوازیـی جەختکردنـەوە لەسـەر مەبەسـتەکان، بووەتـە هـۆی بەکارهێنانی پێچووپەنا یان بڕوبیانووی فیقهی لە تەفسیری دەقەکانـدا، سەرەڕای ناڕەزایی ژمارەیەك لە زانا بەناوبانگەکان.[٢] لەکاتێدا کە ڕێگە دەدرێـت بـە بـەکارهێنانی پێـچوپەنا یـان بڕوبیـانوو، بـە مەبەسـتی

1. الجويني، أبو المعالي. الغياثي، غياث الأمم في التياث الظلم، تحقيق: فؤاد عبدالمنعم ومصطفى حلمي، الأسكندرية، دار العودة، ١٩٧٩م، بەرگ١، ل٢٩٥.

2. ابن تيمية، بيان الدليل على بطلان التحليل، سەرچاوەی پێشوو،ل١٣٧.

کەمکردنـەوەی بـارگرانی لـە بـارودۆخێکی ناڕەحەتـدا، هـاوڕێ لەگـەڵ مەبەسـتەکانی شـەریعەتدا، زیـادەڕۆیی لـە پـەنابردن بـۆی – بـە بـێ مەبەست – دەبێتە هـۆی سـەرنەکەوتنی جێبـەجێکردنی مەبەسـتەکان. شێخ محەمەد تاهیر کوڕی عاشوور – فەقیهێکی بەناوبانگە – نـاڕەزایی سـەبارەت بـەو واقیعـە دەردەبڕێـت و دەڵێـت: "زۆربـەی هـەر زۆری کێشەکان لە ئوسوڵی (فیقه)دا بووەتە هەڵێنجانی ئـەحکام لـە وتـەکانی (المشَّرع)، لەبری ئەوەی بەکاریبهێنێت بۆ ئامانجـەکانی شـەریعەت".(١) ئـەنجامی نادروسـت لـە زیـادەڕۆیی پەنابردنـە بـەر پێـچووپەنا یـان بڕوبیانوو، ئەوەیە کـە "زۆرێـك لـە زانسته ئایینییـەکان، لەگەڵیـشیاندا ئوسـوڵی فیقـه، ڕۆحـی ڕاسـتەقینەیان ونکـردووە، کـە لـە ماوەکـانی پێشوودا سوودیان لێ وەردەگیرا. گەشەکردنەوەی ئەو ڕۆحە، زۆرتـرین پێداویستیی یەکلاکەرەوەیە بـۆ زیندووکردنـەوەی زانیـاری ئـایینی".(٢)
ئەم جەختکردنەوەیە لەسەر مەبەستەکان، پێویستە پەیوەست بێت بـە گرنگیی بنیاتی ڕەوشتەوە، هاوڕێ لەگەڵ فەرموودەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) کە دەفەرموێت: "أكمل المؤمنين إيماناً أحسنهم خلقاً".(١)

---

[1]. ابن عاشور، محمد الطاهر. مقاصد الشريعة الإسـلامية، تحقيـق: محمـد الطـاهر الميـساوي، الأردن، دار النفائس، ط٢، ١٤٢١هـ/٢٠٠١م، ل١٦٦.

[2]. أبو الفضل، عبدالسلام. التجديد والمجددون في أصول الفقه، القاهرة، المكتبة الإسـلامية، ٢٠٠٤م، ل٧-٥٧٦

خلقاً".[1] ئەمە یارمەتیدەر دەبێت بۆ چاندنی چاکەکانی ڕەوشت لە موسڵماناندا، هەر ئەوەشە کە ئیسلام دووپاتی دەکاتەوە، بەڵام ئەمڕۆ لە کۆمەڵگاکانی ئیسلامدا لاواز بووە. هەروەها لێرەدا گرنگەکە هێز بخەینە سەر ژمارەیەك فەرموودەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر)، لەناویشیاندا دووانیان کە دەفەرموێت: "الْخَلْقُ عِيَالُ اللهِ، وَأَحَبُّ عِبَادِ اللهِ إِلَى اللهِ أَنْفَعُهُمْ لِعِيَالِهِ".[2] "لَا تَكُونُوا إِمَّعَةً، تَقُولُونَ: إِنْ أَحْسَنَ النَّاسُ أَحْسَنَّا، وَإِنْ ظَلَمُوا ظَلَمْنَا، وَلَكِنْ وَطِّنُوا أَنْفُسَكُمْ، إِنْ أَحْسَنَ النَّاسُ أَنْ تُحْسِنُوا، وَإِنْ أَسَاءُوا فَلَا تَظْلِمُوا".[3] ئەمە یارمەتیدەر دەبێت بۆ گۆڕینی هەڵوێست بەرامبەر ئەوانەی موسڵمان نین، کە ئەوانیش وەك موسڵمانەکان خەلیفەی خودان، پێویستە بە دادپەروەری و چاکە مامەڵەیان لەگەڵدا بکرێت.[4] هەروەها ئەمە زینگەیەك لە لێبووردن و پەیوەندیی دۆستانە لەگەڵیاندا دروست دەکات. بە چاککردنی ڕەوشتی موسڵمانەکان لەبەر ڕۆشنایی ئەم ڕێنماییانە و ئەوانەی لە قورئان و سوننەتدا هاتوون، موسڵمانان دەتوانن سەرلەنوێ پەیامەکەی پێغەمبەر (درودی خوای لەسەر) کە (رَحْمَةً لِلْعَالَمِينَ )ە، جێبەجێ بکەن.

---

1. پێشتر ئاماژە بەم فەرموودەیە دراوە لەم کتێبەدا (بەشی شەشەم، دووەم: وەستانی فیقه).

2. البيهقي، شعب الإيمان، سەرچاوەی پێشوو، بەش/٦، ل٤٣، فەرموودەی ژمارە ٧٤٤٥.

3. الترمذي، محمد بن عيسى السلمي. الجامع الصحيح، سەرچاوەی پێشوو، بەش/٤، ل٣٦٤، فەرموودەی ژمارە ٢٠٠٧.

4. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿لَا يَنْهَاكُمُ اللَّهُ عَنِ الَّذِينَ لَمْ يُقَاتِلُوكُمْ فِي الدِّينِ وَلَمْ يُخْرِجُوكُمْ مِنْ دِيَارِكُمْ أَنْ تَبَرُّوهُمْ وَتُقْسِطُوا إِلَيْهِمْ إِنَّ اللَّهَ يُحِبُّ الْمُقْسِطِينَ﴾ الممتحنة/٨.

دەتوانرێت چاکسازی لە تێگەیشتنی ئیسلام، لە ڕێگەی گفتوگۆی هێمن و لەسەرخۆوە لە نێوان عەقڵانییە میانڕەوەکان و تەقلیدییە میانڕەوەکاندا ئەنجام بدرێت، کە هەردووکیان دان بە ڕۆڵی (وەحی)دا دەنێن، سەرەڕای عەقڵ لە ژیانی مرۆڤدا. بەڵام ئەگەر حکومەتەکان هەوڵیان دا عەلمانییەت بە بەکارهێنانی هێز بسەپێنن، ئەنجامەکەی تەنیا بەرەو توندبوونی هەڵوێستەکان نەبێت، هیچی تر نابێت، کە زیان بە گفتوگۆ دەگەیەنێت و چاکسازیی پێویستیش خاو دەکاتەوە. پێویستە لەسەر حکومەت تەنیا ڕۆڵی دروستکرنی کەشوهەوایەکی ئاشتەوایی بۆ گفتوگۆ بێت، تا یامەتیدەر بێت بۆ دۆزینەوەی خۆشەویستی لە نێوان حکومەت لە لایەك و زانایان و گەلیش لە لایەکی ترەوە. ئەمەش تەنیا کارئاسانی نابێت بۆ هێنانە ناوەوەی گۆڕانکاری لە ئەحکامی (فیقه)دا، بەڵکو لە دۆزینەوەی ژینگەیەکی هاندەر بۆ گەشەپێدانیش یامەتیدەر دەبێت.

## ٧ ـ ڕۆڵی بزووتنەوە ئیسلامییەکان

بزووتنەوە ئیسلامییەکان ئەگەر خەڵکیان بۆ خۆشویستنی یەکدی هان دا و وایان کرد ببنە نیعمەت بۆ یەکدی نەك مەترسی، دەتوانن زیاتر سەرکەوتوو بن. ئەم کارەش بە ئەنجام ناگات، تاوەکو خەڵکی هەست نەکەن نوێنەرێکی شایستەن بۆ ئیسلام و سەرقافڵەیەکی ڕەوشت باشن، هەروەها تاچەند بزووتنەوە ئیسلامییەکان بتوانن لە ململانێی ناوخۆیی و دەرەکی و ڕووبەڕووبوونەوە خۆیان بەدوور دەگرن. پێویستە ئەوە

لەبەرچاو بگرێت کە بەئیسلامکردنی کۆمەڵگاکان و گەشەپێدانیان لە دوای چەندین سەدە، ئەرکێکی قورسە، بۆیە وردە وردە نەبێت، جێبەجێ نابێت، ئەویش لە ڕێگەی کاری زۆر باش و دڵسۆزانە و پەیوەستبوون بە هێمنی و ئارامییەوە. لەبەرئەوەی خەڵکان و داهاتی دارایی بۆ ئەم بزووتنەوانە زۆر سنووردارە، ناتوانن زیادەڕۆیی لە فروانبووندا بکەن.[1] پێویستە لەسەری خاڵە پێشینەکان لەبەرچاو بگرێت، ئەگەر بیەوێت کۆمەڵگا و گەشەپێدان و جێبەجێکردنی مەبەستەکانی ئیسلامی بەدەست بهێنێت:

أ- پێویستە کاری لەپێشینەی و گرنگترینیان، فێرکردنی خەڵکی بێت، پەروەردەکردنیان لەسەر پێوانە ڕەوشتە باڵاکان بێت کە ئیسلام لە شوێنکەوتووانی داوای دەکات. ئەوە هەنگاوی دەسپێکردنە بۆ بەموسڵمانکردنی کۆمەڵگاکەی. بە بێ ئەوە، ئەو ڕووناکییەی کە دەیەوێت بە کۆمەڵگاکەی بیدات، پرشنگی تەواوی نابێت. ئەو دەوڵەتە ئیسلامییەی ئەو بزوتنەوانە دەیانەوێت دایبمەزرێنن، ئەگەر بەلای کەمەوە، کەمترین ئاستی ڕەوشتە بەرزەکان کە ئیسلام داوای دەکات،

---

1. موحسین عەبدولحەمید، وای دەبینێت کە بزووتنەوە ئیسلامییەکان هەوڵ دەدەن زۆر زیاتر لەوەی هەیانە و ڕێگەپێدراون، لە خەڵك و داهات بەدەستی بهێنن، ئەمەش یەکێکە لە هۆیەکانی سەرنەکەوتنیان و گەڕانەدواوە و خۆ خستنە دەمی دوژمنەکانیانەوە. بڕوانە:

ـ عبدالحمید، محسن. تجدید الفکر الإسلامي، هیرندون، المعهد د د العالمي للفکر الإسلامي، ١٩٩٦م، ل٩-١٩٨.

بەدەست نەهێنێت، مەحاڵە سەربگرێت. لێرەدا پرسیارێك دێتە كایەوە: كەی بزووتنەوە ئیسلامییەكان دەتوانن ڕەوشتبەرزی بۆ ئەم ژمارە زۆرەی دانیشتووان بهێننە دی؟ لەوانەیە ئەمە یەكسەر زۆر پێویست نەبێت. ئەگەر بتوانێت ڕەوشتی كەمینەیەك بگۆڕێت، ئەو كات ئەوانی تر دوای ئەوان دەكەون. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْا إِلَى كَلِمَةٍ سَوَاءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا اللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَقُولُوا اشْهَدُوا بِأَنَّا مُسْلِمُونَ﴾آل عمران/٦٤. ﴿كَمْ مِنْ فِئَةٍ قَلِيلَةٍ غَلَبَتْ فِئَةً كَثِيرَةً بِإِذْنِ اللَّهِ وَاللَّهُ مَعَ الصَّابِرِينَ﴾ البقرة/٢٤٩. تووینبی (Toynbee)یش دووپاتیدەكاتەوە كە: "هەر گەشەپێدانێك لە تاكێكی داهێنەرەوە بێت، یاخود لە چەند تاكێكی كەمەوە بێت، ئەركەكەیان گۆڕینی كۆمەڵگایە بۆ ئەو شێوە ژیانە نوێیەی تر".[1] هەر كاتێكیش كەمینەیەكی داهێنەر توانای خۆی سەلماند، ئەوا بەشەكەی تری گەل ناچار دەبێت دوای بكەوێت. بۆیە ئەركی بە پەلەی بزووتنەوە ئیسلامییەكان سەلماندنی توانا و بەهرەیانە، تا ڕێزیان لێ بگرێت و شكۆمەندییان لای جەماوەر و پاشانیش لای جیهان هەبێت.

---

[1]. Toynbee, A Study of History, abridgement by D. C. Somervell, Volume 2, p. 364.

ب- خاڵی دووەمی پێشینەکانی بزووتنـەوە ئیـسلامییەکان، گرنگیـی لە خاڵی یەکەم کـەمتر نییـە: پێویـستە لەسـەریان ئاسـتی بەرزکردنـەوەی کۆمەڵایــەتی - ئــابووری جێبــەجێ بکــەن، ئــەویش بــە قەڵاچــۆکردنی نەخوێندەواری و هەژاری، ڕێخۆشـکردن بـۆ خوێنـدنی بـاڵای بـۆ هـەژاران، زیادکردنی قەرزی بچووك، سەرەڕای دۆزینـەوەی هـەلی کـار و کـاری ئـازاد (تایبەت)، یارمەتیـدان بـە گـوێرەی توانـا بـۆ چارەسـەرکردنی کێـشەکانی هەموو خەڵکی بە لەبەرچاونەگرتنی ئەوەی ئایـا موسـڵمانن یـان موسـڵمان نین. ئەمەش بـە تـەنیا بـە خـۆی ناکرێـت، پێویـستە فـشاری بخاتـە سـەر حکومــەت و ئــەوەش یارمــەتیی هــەمووان دەدات کــە هەســت بکــەن گەشەکردنی ئیسلام دەبێتە هۆی چاککردنی ژیانی هەمووان، دەبێتـە خێـر بۆ هەمووان، یامەتیدەریش دەبێت بۆ ژیانی ئاشتەوایی بۆ هـەموو خـەڵکی لــە کۆمــەڵگادا. ئەگـەر بەرنامەیـەك لــە جـۆری ئـەو بەرنامانــە بێـت کـە ئاراسـتەکەی بـەرەو خزمـەتی کۆمـەڵگا بێـت، هـەر خـۆی - نـەك تـەنیا ژمارەیەك ئاڵا بێت - دەبێتە هاوکار بۆ کەمکردنـەوەی تـاوان و نـاکۆکی و چــاندنی پــەیامی ســەرەکیی ئیــسلام دەربــارەی برایــەتی مرۆڤــەکان و دادپەروەری و خۆشگوزەرانی بۆ هەمووان.

ج- خــاڵی ســێیەمی پێــشینەکان: پێویــستە خەباتەکــە لــە پێنــاو جێبەجێکردنی چاکسازیی سیاسی و ئازادیی بیروڕا و مافی مرۆڤدا بێت. بـۆ ئەو مەبەستە پێویست ناکات بەشداری لە هەڵبژاردنی ڕاستەوخۆدا بکرێت، دەتوانێ ئەوەش بکات ئەگەر ئارەزووی لێ بێت، بەڵام پێویستە ئاگـاداری ئـەوەش بێـت کـە ئـەم کـارە کـە پێویـستی نـەدەکرد، دەیخاتـە حاڵـەتی

ململانــێ و ڕووبەڕووبوونــەوەی لەگــەڵ حکومــەت، ســەرەڕای لەگــەڵ حیزبــەکانی تــریش، وای لــێ دەکـات کاریگــەر نــەبێت بـۆ جێبــەجێکردنی ئامانجــەکانی، لەبەرئــەوەی کــاتێکی زۆری دەوێــت تــا خــۆی بگەیەنێتــە دەستەڵات لە زۆربەی وڵاتاندا، باشتر وایە پەیوەندیی خۆی لەگەڵ هـەموو حیزبەکاندا باش بکات، هەوڵی ئەوەش بدات لە جێبەجێکردنی چاکسازیی سیاســی و دادوەری و بەرزکردنــەوەی ئاســتی کۆمەڵایــەتی و ئــابووری، یارمەتییان بدات. دەتوانن ئەمانە بەدی بهێنن و لە دەستەڵاتیشدا نەبن.

بە بێ بەدەستهێنانی ئەو کەشوهەوا هـێمن و دڵسۆزانە، بزووتنـەوە ئیسلامییەکان نـاتوانن لـە پێنـاو ئـەو چاکسازییەی پێویستە یارمـەتی وەربگرن، بە بەردەوامییش پێویستیەتی، تەنانەت ئەگەر خۆیشی بچێتە دەســتەڵاتەوە. بیرۆکراتییــەتی شارســتانی و ســەربازیی گەنــدەڵ و بەرژوەندیی تایبەتی گوند و شارستانیی بەهێز، ئەگەر یارمەتیی هـەموو چینە نییەت پاکەکان نەبێت، ناتوانێت سەرکەوتن بەدی بهێنێت، بـەڵام لە ڕێگەی بـەکارهێنانی زانـایی و هەڵوێـستی دڵسۆزانەوە، تەنانـەت لـە دوژمنە سەرسەختەکانیشیەوە بێت، لەوانەیە بتوانێـت ئامـانجی گـەورە بەدەســت بهێنێــت. هــەر وەك پێغەمبــەر (درودی خــوای لەســەر) دەفەرموێت: "وإن الله تعالى ليؤيد الدين بالرجل الفاجر".[1]

---

[1]. بوخاری ڕیوایەتی کردووە لە أبو هورەیرەوە، بڕوانە:

- البخاري، صحيح البخاري، سەرچاوەی پێشوو، بەش/١، ل١١١، فەرموودەی ژمارە ٢٨٩٧.
- القشيري، صحيح مسلم، سەرچاوەی پێشوو، بەش/١، ل١٠٥، فەرموودەی ژمارە ١١١.

د- هەوڵدان بۆ دۆزینەوەی لێکتێگەیشتن لە نێوان هەموو جۆرە کۆمەڵە ئیسلامییەکاندا و بەدەستهێنانی کۆدەنگییەك دەربارەی هەموو جۆرە چاکسازییەکی فێربوون و کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی، لە ڕێگەی گفتوگۆوە، ئەمەش بە پەیڕەوەکردنی ئەوەی قورئان ئاماژەی پێ داوە دەربارەی بانگهێشتی یەکەم بۆ یەك وشەیی یاخود یەك گفت لە نێوان ئێوە و ئەواندا.(1) ئەمەش پێویستی بە دامەزراندنی تیمێکە لە بیرمەندانی ڕاوێژکاری داهێنەر، نوێنەری بەتوانا و خاوەن نییەتی باش لەناو کۆمەڵانی کۆمەڵایەتی و ئابووری و سیاسی و ئایینیی جۆراوجۆر. ئەو بەرنامەیە ئەگەر تیمێکی بەو شێوەیە دابینێت، دەتوانن کۆمەڵەیەکی گەورە لە جەماوەری گەل کۆبکەنەوە بۆ پشتگیریکردنی.

هـ- دروستکردنی پەیوەندییەکی باش لەگەڵ وڵاتان و کۆمەڵگاکانی تر. پێویستە ئەوەش بزانێت کە ناموسڵمان نزیکەی چوار لەسەر پێنجی جیهان پێکدەهێنن، ئەوانیش هەر وەك موسڵمانەکان هەموویان یەکپارچە و یەکگرتوو نین. لە کاتێکدا هەندێکیان بە تەواوەتی دژی ئیسلامن، ئەوانی تریش مەرج نییە وەك ئەوان بن. هەڵسوکەوتی موسڵمانان بەرانبەریان، هەڵسوکەوتی ئەوان دیاری دەکات. هەرکات پەنا بۆ ڕووبەڕووبوونەوە و جەنگ برا، زیاتر دوژمنکاری دەنوێنن، لەگەڵ ئەوەی

---

1. خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿قُلْ يَا أَهْلَ الْكِتَابِ تَعَالَوْا إِلَى كَلِمَةٍ سَوَاءٍ بَيْنَنَا وَبَيْنَكُمْ أَلَّا نَعْبُدَ إِلَّا اللَّهَ وَلَا نُشْرِكَ بِهِ شَيْئًا وَلَا يَتَّخِذَ بَعْضُنَا بَعْضًا أَرْبَابًا مِنْ دُونِ اللَّهِ فَإِنْ تَوَلَّوْا فَقُولُوا اشْهَدُوا بِأَنَّا مُسْلِمُونَ﴾ آل عمران /٦٤.

هێرشی زۆردارانه و ستەمکارانه لەلایەن ڕۆژئاواوە کراوەتە سەر ئیسلام و موسڵمانان، بۆیە وەسیەتی قورئان بۆ موسڵمانان بریتییە لە: خوای گەورە دەفەرموێت: ﴿وَلَا تَسْتَوِي الْحَسَنَةُ وَلَا السَّيِّئَةُ ادْفَعْ بِالَّتِي هِيَ أَحْسَنُ فَإِذَا الَّذِي بَيْنَكَ وَبَيْنَهُ عَدَاوَةٌ كَأَنَّهُ وَلِيٌّ حَمِيمٌ﴾فصلت /٣٤، هەروەها قورئان دەفەرموێت: ﴿لَتُبْلَوُنَّ فِي أَمْوَالِكُمْ وَأَنْفُسِكُمْ وَلَتَسْمَعُنَّ مِنَ الَّذِينَ أُوتُوا الْكِتَابَ مِنْ قَبْلِكُمْ وَمِنَ الَّذِينَ أَشْرَكُوا أَذًى كَثِيرًا وَإِنْ تَصْبِرُوا وَتَتَّقُوا فَإِنَّ ذَلِكَ مِنْ عَزْمِ الْأُمُورِ﴾ آل عمران /١٨٦. مراد هوفمان (Murad Hofman) باشی پێکاوە کە دەڵێت: "من پێشنیارێکی باشتر نازانم لەوەی کە هانی جیهانی ئیسلامی بدەم کە "ئوسوڵی" بن بە مانای ڕەسەنی وشەکە خۆی، واتە گەڕانەوە بۆ بنەما سەرەکییە ڕاستەقینەکانی بیروباوەڕی ئیسلامی، شیکارکردنی ئەو کاریگەرییانەی بۆ مەدینە و ئەندەلووس و عەباسییەکان بەسوود بوون".[1]

## ٨- تواناکان بۆ سەرکەوتن لە ئایندەدا

وا دەرکەوێت تواناکان بۆ سەرکەوتن لە ئایندەدا مژدە بەخشە، چونکە پرۆسەیەك پێچەوانەی شەپۆل وەك ئیبن خەلدون پێش ٦٠٠ ساڵ دەیویست، ئێستا بەڕێوەیە، چەند هێمایەکی یەکلاکەرەوە هەیە کە

---

1. Hofmann, Murad Wilfried. "Backwardness and the Rationality of the Muslim World. "p86.

- هەروەها بڕوانە: العلواني، طه جابر، إصلاح الفكر الأسلامي بين القدرات والعقبات ،هيرندن، واشنطن، المعهد العالمي للفكر الإسلامي، ١٤١٢هـ /١٩٩١م .

ئەوە ڕوون دەکاتەوە، یەکێکیان گەڕانەوەی ناشەرعییەتی سیاسییە. ئێستاش ڕۆڵی ژەنەراڵەکانی تورکیا لە سیاسەتی تورکیادا لاوازە، لە ئەنجامی چوونی تورکیا بۆ ناو یەکێتیی ئەورووپا و ئەو سەرکەوتنەی حیزبی داد و گەشەپێدان لە هەڵبژاردندا کە ئاراستەیەکی ئایینی هەیە. هەر وەك ڕۆژنامەی ئیکۆنۆمیست (Economist) بڵاویکردووەتەوە: "ژمارەیەك یاسای چاکسازیی ڕاگەیاند، شۆڕشێکی بێدەنگی لە سیاسەتی تورکیا و ئابوورییەکەیدا دروست کرد، توانیی – لە پاڵ توانا داراییەکەیدا– لایەلانگرانی خۆی زۆر بکات.[(1)] داهاتێکی زۆر بۆ بودجە بەدەست بهێنێت، بۆ یەکەمجار لە ماوەی ٣٠ ساڵدا بە ڕێژەیەکی زۆر هەڵاوسان دابەزی. ئەمەش بووە هۆی ئەوەی تورکیا لیرەیەکی نوێ دەربکات و شەش سفر لە لیرەکەی پێشوو بسڕێتەوە، کۆی بەرهەمی ناوخۆیی تورکیاش بە ڕێژەیەکی مامناوەندی تەندروست بەرز بووەوە، ساڵانە بۆ زیاتر لە ٨٪ لە هەردوو ساڵی ٢٠٠٤ز و ٢٠٠٥ز. ئەمەش وای لە سندووقی دراوی نێودەوڵەتی کرد کە بڵێت: "بەختی ئابووریی تورکیا گۆڕدراوە".[(2)]

---

[1]. The Economist, 18 September 2004 and 22 january 2005, p. 13 and 32 respectively.

[2] . بۆ شارەزابوونی زیاتر دەبارەی ئەو گۆڕانکارییەی بەسەر ئابووریی تورکیادا هات. بڕوانە:

- International Monetary Fund (IMF). Turkey at the Crossroad: From Crisis Resolution to EU Accession.

لـە ژمارەیـەك وڵاتـدا زۆربـەی دەسـتەڵاتدارە زۆردارەكـان كـەوتنی خۆیان بینی، چاوەڕوان دەكرێـت ئـەوانی تـریش هـەمان چارەنووسـیان هـەبێت. سـەرەڕای ئەمـەش، نزیكـەی هـەموو وڵاتـانی ئیـسلامی لـەژێر دەسـتەڵاتی بیـانی ڕزگاریـان بـووە، ئازادییـەكیان هەیـە كـە پـشت بـە سیاسەتێك ببەستن لە بەرژەوەندیی خۆیـان بێـت. هـەروەها هۆشـیاری لای جەماوەر زۆر زیادی كردووە كـە پێویـستیان بـە حـوكمی بـەتوانا و كارایە بە مەبەستی كەمكردنەوەی ژمارەیەك لە بارگرانییەكان، ئەمـەش وایـان لـێ دەكـات هەسـت بـە بـوونی پێویـستییەكی زۆر بكـەن بـۆ لێپرسینەوەی سیاسی ڕاستەقینە. هیواش زۆرە پێشكەوتنێكی خێرا لە دیموكراتییەتی ڕاستەقینە لە هەموو وڵاتە ئیسلامییەكاندا ببینرێت، ئیتر دیموكراتییەتەكە زۆرداری بێت یـاخود دیموكراتییـەتێكی سـاختە، بـەم شـێوەیەش ناشـەرعییەتی سیاسـی لـە جیهـانی ئیـسلامیدا پاشەكـشێ دەكـات. هـەتاوەكو لـە وڵاتـانی پیـشەسازییە سـەرەكییەكانیش، كـە تیایاندا ناشەرعییەتی سیاسی گەشەی كرد بە هۆی پشتگیریی ماددی و مەعنەوییانـەوە، ئێـستا هەسـت دەكـەن — وەك دەردەكـەوێت — كـە بڵاوبوونـەوەی دیموكراتییـەتیش لـە داهاتوویـەكی درێژیـشدا لـە بەرژەوەنـدیی ئەوانـە. ئاسـۆكان وا نیـشان دەدەن كـە جـووڵان بـەرەو دیموكراتییـەت هەیـە، لـە تەنیـشت چاكـسازیی كـشتوكاڵ و ئـازادیی ڕۆژنامەگەری و بوونی دادوەرییەكی بـەهێز و سـەربەخۆ و گەشـەكردنی دامەزراوە كاراكان.

